

گۆڤارێکی هزریی ڕۆشنبیریی وەرزییە، ژمارە (٤٣)، زستانی ٢٠٢٤



بە سپۆنسەری سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری


خاوەنی ئیمتیاز و سەرنووسەر

تۆفیق کەریم

٠٧٥٠٩٠٠٢٤٤٥ - ٠٧٥١١٤١٢٥٤٣

tofeqkarem@yahoo.com





سایتی گۆڤاری خاڵ

www.xallkurd.com

تیراژ: ١٥٠٠

نرخ: ١٥٠٠ دینار



ناوەڕۆک




د.دانا فازیل محەمەد
ئاسایشی خێزانی
39




ئاسیح مەلا کەریم
لێکەوتەکانی لێکترازانی
کۆمەڵگە
53




پ.د.نەزاکەت حسێن
ڕۆڵی ڕاگەیاندن لە دروستکردنی
ئاشتی کۆمەڵایەتی
75




شێخ مستەفای خەرپانی
لە ئەرشیفی مەشیخەتی عوسمانیدا
د.هێمن عومەر خۆشناو
بنەماڵەی زانای گەورە شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی هەر لە کۆنەوە ڕۆڵێکی گەورەی زانستییان لە ناوچەی هەڵەبجە و بگرە تەواوی کوردستان هەبووە، بەتایبەتی شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی، کە مامۆستا و ئیجازەدەری زۆر لە زانا گەورەکانی کورد بووە. یەکێک لە نەوەکانی ئەو زانا گەورەیە شێخ مستەفای موفتیی هەڵەبجەیە. ئەگەرچی لەنێو سەرچاوەکانی مێژووی زانایانی کوردا شتێکی کەمی لەسەر گوتراوە و نووسراوە، بەڵام لەنێو دۆسیەی مەشیخەتی ئەرشیفی عوسمانیدا- کە تایبەتە بەو زانایانەی بە ڕەسمیی لە دەوڵەتی عوسمانیدا ناسێنراون چەند زانیارییەکی لەبارەوە دەبینرێت، لەگەڵ زانیارییەکانی تردا دەبنە بەشێک لە مێژووی ژیانی ئەم زانایەمان.
119




دکتۆر: دیلان سەلام حەمەفرەج، دکتۆرا لە ئەدەبی کوردی
خورافە ی سیاسیی لە ڕۆمانی (دەریاس و لاشەکان)دا و ئاسایشی کۆمەڵایەتی
بەختیار عەلی
دەریاس و لاشەکان
139




حەسەن مەحمود حەمەکەریم
ئەلە بەستێ
پاڵەوانی کەرکوک و گەرمیان
هەڵوێستی مەردانەی ئەلە بەستێ لە ڕووداوی ١٩٢٤دا لە کەرکوک
154




# بونیادی کەسێتی تاکی کورد

مێژووی دوورونزیکی گەلی کورد، پڕە لە تێکۆشان و بەرخۆدان، بێئەوەی بەئاکام گەیشتبێت، زۆرجار بەرەو لوتکە هەنگاوی ناوە، کەچی پێش ئۆخەیکردنی سەرکەوتن گلاوە و بەرەو دامێن خلۆربووەتەوە، ماوەیەکی دوور ودرێژی ویستووە تا هەلێکی دیکەی بۆ ڕەخساوە، کەچی نەیتوانیوە بیقۆزێتەوە و نوشستی هێناوە. سەیر ئەوەیە زۆر بەکەمی ئەزموونی لەم گشت گلان و نوشستە وەرگرتووە. کەواتە هەقی خۆیەتی بەدوای ڕەگ و ڕیشەی ئەم دیاردەیەدا بگەڕێین، تا بزانین بۆ بەوشێوە شکست دەخۆین!

لێرەوە بابەتی کەسێتی تاکی کورد سەرهەڵدەات، کە پێویستە لەسەری بووەستین و بپرسین:

. ئەم نوشستانە چەندە پەیوەندی بە بونیادی کەسێتی تاکی کوردەوە هەیە؟
. تایبەتمەندییەکانی کەسێتی مرۆڤی کورد چییە؟
. ئایا کەسێتی تاکی کورد بونیادێکی نەخەملیوە؟
. بێدەوڵەتی چ کاریگەرییەکی لە سەر کەسێتیمان کردووە؟
. ڕۆژهەڵاتناسان چۆن لە تاکی کوردیان ڕوانیوە و کۆڵیونەتەوە؟
. کاریگەریی ژینگە لەسەر کەسێتی تاکی کورد چیە؟
. ڕەهەندی مێژوویی چ کاریگەرییەکی هەیە؟
. کۆمەڵناسان چۆن شیکاریی بۆ کەسێتی ئێمە دەکەن؟
. ئایندەی بونیادی کەسێتی تاک لە بەرامبەر گۆڕانکارییەکاندا.

ئەمانە ئەو پرسیارانەن ڕەنگە بەوەڵادانەوەیان کۆمەڵێک سەرداومان دەستکەوێت، سەبارەت بە هۆکار و چارەسەری ئەو گشت نوشست و گلانە.

. داواکارین لە نوسەرانی بەڕێز، لێکۆڵینەوەکانیان لەسەر ئەو تەوەر و بوارانەی کە ئاماژەیان پێدراوە هەتا ڕێکەوتی (٢٠٢٤/٤/١) بنێرن بۆ گۆڤارەکەمان.




# ئاسایشی کۆمەڵایەتی

## پێکەوە ژیان، لێکەوتەکانی لێکترازان

ئێمە لە وڵاتێکدا دەژین، دەکرێت بڵێین هەر بەناو وڵاتە، سەروەری یاسا تیایدا بوونی نییە، هێزی چەک و فشاری وڵاتانی دیکە و دەستەگەریی حزبەکان زۆر لە یاسا لەسەرەوەترن، بۆیە بەڕاستی ئاسایشی کۆمەڵایەتیمان لە مەترسیدایە، ئەگەر تێکیشبچێت ئیدی کۆمەڵگە لەناودەچێت، لەو ڕوانگەوە بە گرنگمان زانی تەوەری ئەم ژمارە تەرخانبکەین بۆ لێکۆڵینەوە لە ئاسایشی کۆمەڵایەتی و مەترسی لێکترازان، تیایدا جگە ناساندنی ئاسایشی کۆمەڵایەتی، فاکتەرەکانی فەراهەمکردنی و تێکدانیمان خستووەتە ڕوو، پاشان لە گرنگی پێکەوەژیان و یەکترقبوڵکردن کۆڵیوەتەوە. ڕاستە زۆر لەمانە ئەرکی دەسەڵاتە، بەڵام دەکرێت کۆمەڵگەش کاریگەری خۆی لەو بوارانەدا هەبێت، بەشێوەیەک تاکەکان دەتوانن ڕۆڵی گەورە ببین.

وەک ستافی خاڵ، ڕووی دەممان نا لە کۆمەڵێک توێژەر و پسپۆڕی بوارەکە، بە سوپاسەوە بەشێکیان وەڵامیاندایەوە و قسەی جددییان کردووە، بەشێکیشیان سەرەڕای بەڵێنیان، بەڵام پاش چاوەڕوانی زۆر وادەکەیان بەجێنەهێنا.

گۆڤاری خاڵ



## پێشەکی

ئاشتی کۆمەڵایەتی دروشمی ئەو ڕەوت و ئاڕاستانەیە کە بانگەشە بۆ چاکسازی دەکەن، لەپێناوی زاڵبوون بەسەر کۆسپەکان و گەیشتن بە گەشەکردن و پێشکەوتنی تاک و کۆمەڵ ڕێگەی تایبەت بە خۆیان دەگرنەبەر، کە هەموو ئەو بنچینە و بنەما و هۆکار و ڕێکارانە لەخۆدەگرێت کە دەستەبەری ئەوە بکەن دەستدرێژی نەکرێتە سەر کۆمەڵگە و تاکەکانی، خەڵکی لەنێو ماڵ و کۆمەڵگە و نیشتمانیاندا هەست بە ئاسوودەیی و دڵنیایی بکەن، لەڕاستیدا ئاشتی کۆمەڵایەتی لەپێشدا پێویستییەکی کۆمەڵایەتییە، پاشان بە چاوپۆشی لە ئایین و گەشەسەندنی فیکریی و تەکنەلۆژی و زمان و تێکڕای لقەکانی جیایی لەنێوان کۆمەڵگەیەک و کۆمەڵگەیەکی تردا داخوازییەکی نێونەتەوەیی (ئوممەمی)یە، لەهەمانکاتدا فەرزێکی شەرعی و زەڕوڕەتێکە کە ژیان لەسەر ئەو ڕاوەستاوە.

### دەروازەی یەکەم: ئاشتی کۆمەڵایەتی و پەیوەندی بە زانستە ئیسلامییەکانەوە

ئەو زانستانەی پەیوەستن بە شەریعەت یاخود بە ئیسلام یان بە ئایینەوە -ئەگەر دەربڕینەکە ڕاست بێت- بریتین لەو زانستانەی کە دەقەکانی قورئان و فەرمووده و مەبەستەکانی هەردووکیان کردۆتە چاوگەی ڕێنمونییەکانیان، بناغەی بیرکردنەوە و نەخشەدارشتنیان و بنەمایەک بۆ دیاریکردنی ڕێساکانی، یاخود بەدەربڕینەکەی پێشەوا غەزالی (٥٠٥ک وەفاتی کردووە) بریتییە لە: ئەوەی سوود لە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەر بێت) وەرگیراوە[١]، یاخود بریتییە لە: (ئەو زانستە نووسراوانەی کە تێیاندا حوکمە شەرعییە کرداریی یان بیروباوەڕیی و ئەوەی پەیوەندارە پێیانەوە بەشێوەیەکی پشتپێبەستراو لەشەرعدا بەدی دێت)، دەکرێت بنچینە (أصول)ی ئەم زانستانە لەمانەدا دیاری بکەین: ئیمان و ئیسلام و ئیحسان، یاخود بەدەربڕینێکی تر لە: فیکر و کار و ڕۆح، یان: بیروباوەڕ و فیقهو

---

١. بڕوانە: إحياء علوم الدين: ١ /١٦.

ڕەفتاردا کۆبکەینەوە[٢]، ئەم زانستانەش بە هەموو بابەت و بنچینەکانییەوە یەک مەبەستی هەیە، ئەویش: بەدیهێنانی بەرژەوەندییەکان (المصالح) و دوورخستنەوەی خراپەکان (المفاسد)، یاخود: چاککردنی ژیان و دوارۆژی تاک و کۆمەڵگە، یان فیکر و ڕەفتار، یا ئێستا و داهاتوو، زۆر پێویست دەکات تیشک بخەینە سەر ئەوەی کە ئەم زانستانە لەکاری خۆیاندا تەنها لایەنی کرداریی و بەدیهێنانی مەبەستەکانیان لەبەرچاو نەگرتووە، بەڵکو هەوڵیانداوە ویستەکانیان لە واقیعدا بەدیبهێنن و لەگەڵ ڕەوشە جیاوازەکاندا کارێک بکەن و چاکسازی ڕیشەیی لەسەر ئاستی تاک و کۆمەڵگە بهێننە دی.

قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) دوو سەرچاوە سەرەکییەکەی نێو سەرچاوەکانی بەدیهاتنی ئاشتی کۆمەڵایەتی و چەسپاندنی بنچینەکانین، بگرە ئەو دوو سەرچاوە سەرەکییە بنەما و دەستورە تیۆری و کردارییەکانیان بەجۆرێک دامەزراندووە کە زامنی بەدەستهاتنی ئاشتی کۆمەڵایەتی نێوان تاکەکان و کۆمەڵگە جیاوازەکان  لە بوارە جیایەکانی ژیانی ڕۆژانەیان لە فیکر و ئابووری و کۆمەڵناسی و کاروباری دەوڵەت و سیاسەتی شەرعی و تاوانەکان و پەرستش و ڕەوشتەکان و ڕەفتارو و جگە لەوانیش.

وشەی ئیسلام لە زمانەوانیدا لە (سلام و سلم و سلامة)دا خۆی دەبینێتەوە، هەربۆیە ئەم ئایینە داوامان لێدەکات هەموومان بچینە نێو ئاشتی (سلم)ەوە، خوای گەورە دەفەرموویێت: (يأيها الذين آمنوا ادخلوا في السِّلمِ كافةً ولا تتبعوا خطوات الشيطان إنه لكم عدوٌ مبين) (البقرة: ٢٠٨)، فەرمانیشمان پێدەکات هاریکاریی یەکتر بکەین بەجۆرێک کە چاکەی تاک و کۆمەڵی تێدا بێت، یارمەتی ئەو کەسانە بدەین کە لە دەوروبەرمانن، بەچاوپۆشی لەوەی ئەو کەسە هەر ئایین یان بیروباوەڕێکی هەیە، لەمبارەیەشەوە خوای گەورە دەفەرموویێت: (... وتعاونوا على البر والتقوى ولا تعاونوا على الإثم والعدوان...) (المائدة: بەشێک لە ئایەتی ٢). بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە بەرزەش چەندین یاسای داڕشتووە و داوای لە بەندەکانی کردووە لەپێناوی هێنانەدی چاکەی دونیا و قیامەتیان بەجێی بگەیەنن[٣]: (وَقِيلَ لِلَّذِينَ اتَّقَوْاْ مَاذَا أَنزَلَ رَبُّكُمْ قَالُواْ خَيْرًا). خۆ ئەگەر بۆ

٢. ئاماژەیە بۆ ئەو فەرموودەی کە بە فەرموودەی جبریل (سەلامی خوای لێ بێت) ناسراوە، کە هاوەڵانی (خوالێیان ڕازی بێت) فێری کاروبارەکانی ئایین کرد، کاتێک پێغەمبەر (د.خ) پرسیاری کرد و ئەویش بەئامادەبوونی هاوەڵان  وەڵامیدایەوە و ئایینی لەمانەدا پوختکردەوە: ئیمان و ئیسلام و ئیحسان.

٣. بۆ زیاتر ئاشنابوون بڕوانە: لسان العرب:لابن منظور، ط ١، دار صادر، بیروت ، ١٤ / ٢٨٩، مادة (سلم)،




فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) بگەڕێینەوە دەبینین لە چەندین فەرمووەدەدا جەخت لەسەر بەدیهاتنی ئاشتی و گرنگی و بایەخی یارمەتیدان و هاریکاریی و دەستبار بۆ یەکگرتن و دوورکەوتنەوە لە هەرشتێک ببێتە مایەی پەرتەوازەیی و ڕقلێبوون و زیانگەیەنەر بە ئاشتی کۆمەڵایەتی تاک و کۆمەڵگە دەکات، وەک لەم فەرموودەیەدا دەفەرموویێت: (لاَتَحَاسَدُوا وَلاَ تَبَاغَضُوا وَلاَ تَقَاطَعُوا وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا) [٤]، لەفەرموودەیەکی تریشدا هاتووە: (لاَ تَحَاسَدُوا وَلاَ تَنَاجَشُوا وَلاَ تَبَاغَضُوا وَلاَ تَدَابَرُوا وَلاَ يَبِعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا. الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ لاَ يَظْلِمُهُ وَلاَ يَخْذُلُهُ وَلاَ يَحْقِرُهُ. التَّقْوَى هَا هُنَا) لێرەدا سێجار ئاماژەی بۆ سنگی دەکات (بِحَسْبِ امْرِئٍ مِنَ الشَّرِّ أَنْ يَحْقِرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ دَمُهُ وَمَالُهُ وَعِرْضُهُ))[٥].

جیا لەو دوو بنچینەیەی شەریعەت ئەگەر ئاوڕ لە زانستە پەیوەندیدارەکان پێیانەوە بدەینەوە، دەبینین بەمەبەستی بەدیهێنانی (ئاشتی کۆمەڵایەتی) ئەو زانستانە پەیوەندییەکی بەتینیان هەیە، ئەوەتا هەردوو زانستی عەقیدە و کەلام پێش هەموو شتێک ئامانجیان بەدیهێنانی ئاشتی و دڵنیاییە لە بیرکردنەوەی تاک و دەروونیدا، پاشان ڕەنگدانەوەی ئەم ئاشتی و دڵنیاییە لە ڕەفتاری خۆی و لەهەڵسوکەوتیشی لەگەڵ کەسانی تردا، ئەمەش لەڕێی باوەڕبوون بەخودای تاک و تەنها و یەکخواناسیی و پشتبەستن بەخوا، چونکە بناغەی بەختەوەری هەردوو دونیا بریتییە لە باوەڕبوون بەخوا و تەسلیمبوون بە پەروەردگاری بەدیهێنەر، بەمەش تاک بەجۆرێک ڕەفتار لەگەڵ دروستکراوەکانی دەوروبەری –ئیدی زیندوو بێت یان بێگیان– دەکات کە: هەموو بەدیهێنراوەکان، پەروەردگار بەدیهێناون، مرۆڤیش پەیوەندی هەمەجۆری لەگەڵیاندا هەیە، لە هاریکاریانەوە بۆ مرۆڤ و موسەخەربوونیان بۆی تا پێداویستییەکانی ژیانی بۆ ئاسان ببێت، تا دەگاتە بیرکردنەوەی مرۆڤ لێیان و کردنیان بە ئامرازێک بۆ نزیکبوونەوە لە خوای

---

ومرتكزات السلام الاجتماعي في القرآن الكريم: إسماعيل آدم عبد الرحمن آدم، أطروحة الدكتوراه مقدمة إلى كلية الآداب، قسم الدراسات الإسلامية بجامعة الخرطوم، سنة ٢٠٠٨، ٦٠ ـ وما بعدها، ومقومات السلم الاجتماعي في الإسلام: أ.د. محمد خليل جيجك، بحث مقدم إلى المؤتمر الدولي المنعقد من قبل كلية العلوم الإسلامية بجامعة صلاح الدين ـ أربيل بتأريخ ١ ـ ٣/٤/ ٢٠١٤ في أربيل، وعنوان المؤتمرهو: مقومات السلم الاجتماعي ـ قراءة إسلامية في ضوء الواقع المعاصر ـ ٧٥/١ ـ وما بعدها، وقواعد وأصول إسلامية في ترسيخ السلم الاجتماعي: أ.م.د.رزكار سليمان مولود، بحث مقدم لمؤتمر: مقومات السلم الاجتماعي...، ١/ ٩٣ ـ وما بعدها.

٤. أخرجه مسلم في صحيحه عن أنس «رضي الله عنه»: ٩/٨ برقم ٦٦٩٥، باب النهي عن التحاسد والتباغض والتدابر.

٥.أخرجه مسلم في صحيحه عن أبي هريرة «رضي الله عنه»: ١٠/٨برقم ٦٧٠٦، باب تحريم ظلم المسلم وخذله واحتقاره ودمه وعرضه وماله.

گەورە، هەستکردنی بە پرشنگدانەوەی ناوەکانی خوای گەورە و سیفاتەکانی لە حاڵ و گۆڕانەکانیاندا، چونکە ئەم دروستکراوانە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ خراونەتە خزمەت مرۆڤەوە[٦]، پاش ئەو گەشتەی بیرکردنەوە و ڕامان تاک هەست بە دڵئارامی و بەرزبوونەوەی ڕۆحی دەکات، هەست بەو ڕەحمەتە گشتییەی پەروەردگار دەکات کە دەوروبەری تەواوی گەردوونی گرتووە، بەبێ جیاوازی لە نێوان باوەڕدار و بێباوەڕ، هەربۆیە مامەڵەی باش لەگەڵ ئەو کەسەش دەکات کە بیرکردنەوەی ئایینیشی جیایە لەگەڵی، ئاشتی دەکاتە بنەمای مامەڵەکردن لەگەڵیدا[٧]، لە یەکخواناسیشدا بەهەمانشێوە هەست بە ئاسوودەیی دەکات، چونکە مرۆڤ هەستدەکات جڵەوی کاروبارەکان بەدەستی پەروەردگاری کارسازی بەدیهێنەرەوەیە، ئەوەی ڕوودەدات لەخۆڕا و هەڕەمەکی نییە کە ببێتە هۆی دڵەڕاوکێی بەردەوام بۆ تاک و کۆمەڵگە، تەنها خوایەک هەیە، مرۆڤ لەمەوە هەست بە ئارامی دەکات، خۆ ئەگەر زۆربوونایە تووشی دڵەڕاوکێ و شڵەژان دەبوو، سەرنجبدە -تەنها وەک نموونە و ڕوونکردنەوە- سوپایەک فەرمان لە یەک فەرماندەوە وەربگرێت، یان لەیەک کاتدا فەرمان لە چەند فەرماندەیەک وەربگرێت[٨].

زانستی فیقهیش بەهەمان شێوە زۆرێک لە لقەکانی دەبنە مایەی بەدیهاتنی ئاشتی کۆمەڵایەتی، لەم زانستەدا ئەمانە بەرچاو دەکەوێت: بەشی پێکهاتن (الصلح)، سزاکان، سیستەمی دابەشکردنی خوێنبایی لە نێوان خزمەکان (نظام

---

٦. ئەو مرۆڤەی قورئان ناساندوویەتی، یەکەم مرۆڤی قورئانی، بریتییە لە: ئەنجامدەری گۆڕانکاریی و بوونەوەرێکە بەردەوام نوێ دەبێتەوە، لە تێڕوانینیدا بۆ خۆی و بۆ ئەوانەشی بیروڕایان جیاوازە لەگەڵی و بۆ گەردوونی بێکۆتایی و گۆڕاو.

بڕوانە: قضايا السلم الاجتماعي ومناهجه في القرآن الكريم: احميدة النيفر، موقع الملتقى الفكري للإبداع، (almultaka.org/site.php?id=٩٨٠)، تأريخ الزيارة: ٢٠١٨/٣/١٠.

٧. بڕوانە: الكلمات: بديع الزمان سعيد النورسي، ٩، ط ٤، دار سوزلر، مصر ٢٠١٤، والأمن الاجتماعي ضبط المصطلح وتأصيله الشرعي: د. عماد محمد رضا علي التميمي، و د. إيمان محمد رضا علي التميمي، بحث مقدم إلى المؤتمر الدولي الذي أقامته كلية الشريعة في جامعة آل البيت بعنوان: الأمن الاجتماعي في التصور الإسلامي، بتأريخ (١٣-١٤/ شعبان/ ١٤٣٣هـ ـ ٣-٤/ تموز/ ٢٠١٢)، ٢.

٨. بەدیعوزەمان سەعیدی نوورسی لە دەرخستنی ئەم خەسڵەتە بەرزەی ئیمان لە چەندین بابەتی مەوسوعە ئیمانییە گەورەکەیدا چاکی کردووە (كليات رسائل النور)، لەوانە بۆ نموونە: الكلمات: ١٢ ـ وما بعدها، واللمعات: ٢٥٣ ـ وما بعدها، والشعاعات: ٢٢٦ ـ وما بعدها.



العاقلة) یاخود هۆزەکە لە تاوانی کوشتنی نائەنقەستدا، جگە لەویش[٩]، کە هەریەکەیان گرنگیدان بەلایەنی کۆمەڵایەتی و بەدیهێنانی ئاشتی تێدایە، شەرعزانە مسوڵمانەکان بەدرێژایی مێژوو -لەنێویشیاندا بەتایبەت شەرعزانە کوردەکان- باشترین نیشاندەری چەمکەکانی ئاشتی کۆمەڵایەتی و نەهێشتنی بڵاوبوونەوەی ڕق و کینە لەنێو تاکەکان و کۆمەڵگەکاندا بوون، ئەمەش لەبەر ڕۆشنایی دەقە شەرعییەکان و تێگەیشتنیان بووە لە بابەتە جیاوازەکان[١٠].

بەهەمانشێوە زانستی سلوک و تەصەوفی ئیسلامیش بەدەرنەبوون لە گرنگیدان بە ئاشتی کۆمەڵایەتی و فەراهەمکردنی[١١]، بەڵکو ئاشتی کۆمەڵایەتی باڵەخانەیەکی بەرزە و بناغە و سەرچاوە و بنەما ڕەسەنەکەی بریتییە لە ئاسوودەیی ڕۆح و ئارامی دڵی تاک، ئەمەش کرۆکی تەصەوفی ئیسلامییە و لەمە و لە پاکخویی ئاکارەوە دەست بە چاکسازی کۆمەڵگە دەکات.

ئامانجی تەصەوف بڵاوکردنەوەی خۆشەویستی و ئاشتی و دوورکەوتنەوەی کۆمەڵگەکانە لە ململانێ، زمانی تەصەوف بریتییە لە خۆشەویستی و ڕاستگۆبوون لەگەڵ خودا و خەڵکدا، تەصەوف لە سەرەتادا ئەزموونێکی کەسیی بوو تێیدا بەرپرسیاریتی خۆیی لێدەکەوتەوە، دواتر و لە سەدەی پێنجەمی کۆچیدا گۆڕا بۆ دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی، لە سەدەی یازدەهەمیشەوە تا ئێستا بووەتە دیاردەیەکی میللی لە زۆربەی کۆمەڵگەکاندا، ڕۆڵی شێخانی ڕەسەنی تەریقەتیش لە جیهانی ئیسلامیدا تەنها لە بازنەی بەدیهێنانی ئاشتی بۆ تاک و کۆمەڵگە، بەکارخستنی پێگەی زانستی و کۆمەڵایەتیان بۆ بەدیهێنانی بەختەوەری کۆمەڵگەکەیان و بڵاوکردنەوەی پێکەوەسازانە لە نێوان خەڵکدا[١٢]. سۆفییەکان و ئەوانەی باوەڕیان بە تەصەوف هەیە دەزانن قبوڵکردنی جیاوازی فیکریی و بیروبۆچوون بناغەی

---

٩. بڕوانە: الأمن الاجتماعي ضبط المصطلح وتأصيله الشرعي: ١٣ ـ وما بعدها.

١٠. دکتۆر کەمال صادق یاسینی هاوڕێمان ئەمڕۆ لە پێشەنگەی زانایانی کوردی لە بواری ئاشتی کۆمەڵایەتیدا خستووەتە ڕوو، وەک نموونەی شەرعزانانی وڵاتانی ئیسلامی بەگشتی لە توێژینەوەکەیدا بەناوی: دور علماء الشريعة في ترسيخ السلم الإجتماعي: والمقدم إلى المؤتمر الدولي: مقومات السلم الاجتماعي ـ قراءة إسلامية في ضوء الواقع المعاصر ـ ٢ / ٤٩٧ ـ وما بعدها.

١١. بڕوانە: دور التصوف في الأمن والسلام الاجتماعي: محمد الطاف، ود. أبوبكر، بحث محكم منشور في مجلة القسم العربي، جامعة بنجاب، لاهور ـ باكستان، العدد ٢٤، سنة ٢٠١٧، ٢٥٧ ـ وما بعدها.

١٢. بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو: ٢٦٤ ـ وما بعدها.

ئاشتییە، لە ڕێسا بنەڕەتییەکانیان: جیاوازی مەسلەک ناکاتە جیایی مەقاصد، لە جیاوازی مەسلەکەکاندا ئاسوودیی کەسەکە هەیە، فرەیی ڕووەکانی جوانی و فرەیی ئیستیحسان دەخوازێت و، جگە لەمانەش[١٣].

بەمە ڕووندەبێتەوە کە بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیریی ئاشتی کۆمەڵایەتی، چاککردنی هەڵسوکەوت لەگەڵ کۆمەڵگە کرۆکی تەواوی زانستە شەرعییە بنەڕەتییە، ئیمانییە، بیروباوەڕییەکان و لقە کردەیی و سلوکە ڕۆحییەکانە.

لێرەدا ئێمە لەڕێگەی ئەم چەند لاپەڕە دیاریکراوەوە دەمانەوێت هەڵوەستە لەسەر زانستی ئوصولی فیقهی ئیسلامی بکەین، پەیوەندی چەند دەروازەیەکی ئەم زانستە بە ئاشتی کۆمەڵایەتییەوە بخەینەڕوو، ئەم زانستە پەیوەندی نێوان تێگەیشتنی مرۆڤ و دەقی شەرعی ڕێکدەخات و لەڕێیەوە فێرخواز لە بەڵگە شەرعییەکانەوە بەرنامەی دەرهێنانی حوکمەکان فێر دەبێت، هەربۆیە دەروازەکانی ئەم زانستە دوور نەبووە لە نەخشەڕێژی ئەو هێڵە گشتییانەی ئامانجیان بەدیهێنانی ئاشتی کۆمەڵایەتی و چەسپاندنیانە، چونکە بەگشتی دەقە شەرعییەکان مەبەستیان: دوور خستنەوەی زیان و ڕاکێشانی سوودە بۆ کۆمەڵگە بەگشتی یان تاکێک لەنێو کۆمەڵگەدا، ئەم مەبەستەش بناغەی پشتپێبەستراوی بەدیهاتنی ئاشتییە بە هەموو جۆرەکانییەوە، لەنێویشیاندا ئاشتی کۆمەڵایەتی.

لەبەرئەوە چەند دەروازەیەک لە بەڵگە (الأدلة) لە زانستی ئوصوڵ و هەندێکی تر لە مەبەستە شەرعییەکان و حوکم و چەند بابەتێکی دیکە لە فەتواو ئیجتیهاد و لاساییکردنەوە، ئەو ژینگەی دەوری دەقەکە یان تاکی موجتەهیدی داوە، لقە جیاوازەکانی لایەنی ڕەوشتی لای ئوصوڵییەکان و پەیوەندی هەموویان بە ئاشتی کۆمەڵایەتی و چەسپاندنی لە کۆمەڵگەدا (وەک کۆمەڵگەی کوردی) بەویستی خوای گەورە بابەتی توێژینەوەکەمان دەبێت.

---

١٣. بڕوانە: قواعد التصوف: للشيخ أحمد زروق الفاسي ( ت ٨٩٩ هـ )، ٢٥ ـ وما بعدها، و ٥٠ ـ ٥١.

## دەروازەی دووەم: چەسپاندنی ئاشتی کۆمەڵایەتی لای ئوصوڵییەکان لە دەروازەکانی بەڵگە و مەقاصید و ئەحکامی شەرعیدا:

### ١- چەسپاندنی ئاشتی کۆمەڵایەتی لەڕێی بەڵگە (الأدلة)ەوە لای ئوصوڵییەکان:

زانایانی ئوصوڵ بەڵگە شەرعییەکانی لە دەرهێنانی حوکمە شەرعییەکاندا پشتیان پێدەبەسترێت و ڕێگەی زانینی حەڵاڵ و حەرام و جیاکردنەوەیانە دابەشکردووە بۆ چەند بەشێک بە پێودانگی جیا، بەگوێرەی پێکهاتن (الاتفاق) و جیایی لە قبوڵکردنی لای زانایان، بەڵگە دابەش دەبێت بۆ دوو بەشی سەرەکی: ئەو بەڵگانەی لەسەری کۆکن و ئەو بەڵگانەی لەسەری کۆک نین، بەگوێرەی عەقڵ و نەقڵیش بەڵگە: یان نەقڵی بیستراوە، یاخود عەقڵییە بەجۆرێک ڕەئی و عەقڵ ڕۆڵیان هەیە لە دروستکردنیدا، یاخود ئاوێتە (مرکبة) بە (وضعی) ناودەبرێت، وەک بەڵگەبوونی دەربڕین (ألفاظ) لەسەر مانا لە زمانەکاندا، چەندین جۆری دیکەی دابەشکاریش(١٤).

لەوەی خستمانەڕوو چەندین شاهێدی قورئان و فەرموودە -کە بنچینە و بناغەی سەرەکی هەموو بەڵگەکانن و هەر ئەو دووانە لە بەڵگە لەسەری ڕێککەوتووەکانن یان نەقڵی- دەستکەوت لەسەر ئاشتی بەگشتی و ئاشتی کۆمەڵایەتی بەتایبەت. لێرەدا دەمانەوێت لەسەر دوو بەڵگەی تر لە بەڵگەکانی دەروازەی ئوصوڵی هەڵوەستە بکەین، کە دەکەونە ژێر پۆلێنی دووەم کە بە ڕاجیابوو تێیدا یان عەقڵی ناودەبرێت، لەبەر ڕۆشناییاندا پێگەی ئاشتی کۆمەڵایەتی تێیدا و کاریگەریان لەسەر حوکمە شەرعییەکان دەخەینە ڕوو، ئەوانیش: بیانووبەستن و دابونەریت(سد الذرائع و العرف)ن. بەهۆی پەیوەستی ئەم دوو بەڵگەیە بە کۆمەڵگە و ڕەوشە جیاوازەکانەوە، لەمەشەوە پەیوەندی بە بابەتەکەمانەوە، هەوڵ دەدەین بەکورتی هەڵوەستە لەسەر هەر دوو بەڵگەکە بکەین و کاریگەریی نێوانیان لەگەڵ ئاشتی کۆمەڵایەتی بخەینە ڕوو.

---

١٤. بڕوانە: الإحكام للآمدي: ٢٨/١ ـ وما بعدها، والبحر المحيط في أصول الفقه للزركشي: ١ /٥٤، والجامع لمسائل أصول الفقه: د.عبد الكريم النملة، ٨٥ ـ وما بعدها، والأدلة عند الأصوليين ـ أنوعها، أقسامها، ترتيبها، عمومها ـ عبد الرحمن بن عمر آل زعتري، من موقع بيت العلم،( www.riyadhalelm.com/play-١٤٧٠٧.html)، تأريخ الزيارة ٢٠١٨/٣/١٤.

**یەکەم: بیانووبەستن (سد الذرائع):**

بیانووبەستن (سد الذرائع) لای ئوصولّییەکان بەدوو واتا بەکارهاتووە[١٥]:

أ. گشتی، واتە: هەموو ئەوەی وەک ئامراز بۆ شتێکی تر بەکاری دێنیت، بەچاوپۆشی لەوەی ڕێگە پێدراوە یان قەدەغەیە، کۆکبوونی لەسەرە یاخود ڕاجیایی لەسەرە.

ب. تایبەت، واتاکەی: هەرکردەیەک ڕووکارەکەی ڕێگەپێدراوە، بەڵام شتێکی بەسەرهاتووە کردوویەتییە هۆی خراپە، بەزۆری نەک بەگشتی.

لە بیانووبەستن (سد الذرائع)دا خاڵی ڕێکەوتوو لەسەر و خاڵی جیاڕا لەسەر هەیە، پێویستە بۆ دیاریکردن و ڕوونکردنەوەی ئەوەی بابەتی ململانێیە لەم بەڵگەیەدا باسی بکەین، ئەویش بەکورتی[١٦]:

١. هیچ جیاڕاییەک لە نێوان زانایاندا نییە کە ئەو ئامراز (وسیلة)ەی دەبێتە هۆی حەرام، حەرامکراوە، با دەقی تایبەت لەسەر خودی خویشی نەبێت، بەڵام هەندێکیان لە ڕوانگەی بیانووبەستن (سد الذرائع)ەوە بە حەرامکراو ناوی نابات، نموونەی: (داخستنی دەرگا لەسەر ئاژەڵ ئەگەر بزانیت دەبێتە هۆی مردارەوەبوونی).

٢. جیاڕایی نییە لە نێوان زانایاندا کە ئەوەی دەکرێت بەدەگمەنی ببێتە هۆی حەرام لە شەرعدا حەرام ناکرێت، چونکە دەگمەن (نادر) حوکمی نییە، نموونەی: ڕێگەنەدان بە فرۆشتنی ترێ یان خورما بەشێوەیەکی ڕەها تا خواردنەوەی سەرخۆشکەری لێدروست نەکرێت.

٣. کارێک لە بنەڕەتدا بەهۆی ئەو بەرژەوەندییەی تێیدا ڕێگەپێدراوبێت، بەڵام بەزۆری ببێتە هۆی حەرام، واتە بەزۆری گومانی ئەوەی لێ بکرێت نەک بەشێوەیەکی بنبڕ وا بێت.

ئەو خاڵەی لە بیانووبەستن (سد الذرائع)دا جیاڕایی زانایان تێیدا گوێی لێدەگیرێت بریتییە لە: کاری ڕێگەپێدراو لەبەر بەرژەوەندییەک، بەڵام زۆرجار ببێتە هۆی خراپییەک نەک زۆربەی جار گومانی ئەوەی لێبکرێت یان بەشێوەیەکی بنبڕ وابێت. وەک سەلەم نییەتی ئەنجامدەرەکەی ڕیبا بێت، بەڵام نییەتەکەی شاردبێتەوە و

---

١٥. بڕوانە: الأدلة المختلف فيها عند الأصوليين: ١٩٤ ـ وما بعدها.

١٦. بڕوانە: الفروق للقرافي: ٣٢/٢، والموافقات: ٣ / ٥٤ ـ وما بعدها، والأدلة المختلف فيها: ٢٠٢ ـ وما بعدها.

گرێبەستی فرۆشتنێکی ڕەوای ئەنجام دابێت.

بۆچوونی هەرەناسراو لای پێشەوا شافیعی و ئەبوحەنیفە ئەوەیە کار بەو ڕێگەنەدان بەو کارانە ناکرێت بەپشتبەستن بە بەڵگەی بیانووبەستن (سد الذرائع)، شتێک لە کارەکەدا حەرامێتییە بەهۆی نییەتەکەوە، نەک پوچەڵکردنەوەی گرێبەستەکە، بەڵام پێشەوا مالیک و ئەحمەد کار بە حەرامبوونی دەکەن و ڕێگەی پێنادەن بە بەڵگەی بیانووبەستن (سد الذرائع)، لای هەموویان حەرامێتییەکە چەسپاوە، بەڵام لە چەسپاندیدا جیاڕایی لەنێوانیاندا هەیە(١٧).

بەڵام پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە مەسەلەکە پێویستی بە وردبینی و بەدواداچوون هەیە، چونکە بوترێت حەنەفی و شافعییەکان نکۆڵیان کردووە لە بیانووبەستن (سد الذرائع) لەجێی خۆی نییە، چونکە ئەگەر سەرنج لە زۆرێک لە لقەکانی هەردوو مەزهەبەکە بدەین دەبینین کاریان پێکردووە، لەبەرئەوە دەتوانین بڵێین بۆچوونی ناسراویان بەوەی کار بە بیانووبەستن (سد الذرائع) ناکەن بۆ چەند شتێک دەگەڕێتەوە، لەوانە: ئەوەش لەڕووی ناسرانی بەوەی کاری پێبکرێت نەک لەڕوولا ڕازیبوون لەسەری یان سەرپێچیکردنی و حساب بۆ نەکردنی، یاخود لەڕووی زۆر کارپێکردنی یان کارپێکردنی بەڕێژەی کەمتر لەکاتی بەراوردکردندا، واناسراوە مالیکی و حەنبەلییەکان کاریان پێکردووە و بەو زۆرییە یان بەسەربەخۆ لەنێو بەڵگەکانی حەنەفی و شافعییەکاندا قسەی لەسەر نەکراوە، بەجۆرێک فراوانکردن لە جێبەجێکرانە فیقهییەکان (لە کۆن و نوێدا) یاخود کەمکردنەوە تێیدا بۆ یەک لەو دوو ڕێبازە فیقهییەی پێشوو دەگەڕێتەوە، ئەوانیش: ڕێبازی پشتبەستن بە نییەت و ئیرادەی ناوەکی، ئەمە مالیکییەکان و ئەو شەرعزانانەی لەگەڵیاندا بوون و هەستاون بەفراوانکردنی بیانووبەستن (سد الذرائع)، لەگەڵ ڕێبازی ئیرادەی دەرەکی کە شافیعییەکان و ئەو شەرعزانانەی لەگەڵیاندا بوون و ڕێبازەکەیان لەسەر بچوککردنەوەی بازنەی بیانووبەستن (سد الذرائع) کاردەکات، یان کارپێنەکردنی بیانووبەستن (سد الذرائع) بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بە بەڵگەیەکی سەربەخۆ دابنرێت کە حوکمی شەرعی بەخۆی بچەسپێت، بەڵام وەک بەڵگەیەکی نا سەربەخۆ بیانووبەستن (سد الذرائع) لای هەر چوار مەزهەبەکە هەیە، هۆکاری جیاوازییەکە ئەوەیە کە بە بەڵگەی سەربەخۆ دادەنرێت یان لەژێر بەڵگەیەکی دیکەدا

---

١٧. بڕوانە: الفروق للقرافي: ٢ / ٣٢، والأدلة المختلف فيها: ٢٠٣.

جێگیر دەبێت. یان دەگەڕێنرێتەوە بۆ بەدەستهێنانی مەبەستەکە لە هەندێک لە بەشەکییەکان و ئەو ڕێنماییانەی تر کە پێویست دەکات بیانووبەستن (سد الذرائع) لای هەمووان قبوڵکراو بێت و ڕاجیاییەکە تەنها ڕووکارییە، یان لە چەند لقێکی سنووردارداپە[١٨]. ئەوەی پەیوەندی نێوان بیانووبەستن (سد الذرائع) بە ئاشتی کۆمەڵایەتییەوە دەردەخات، بریتییە لە: بە ئاگابوونی ئەوانەی فەتوا بۆ خەڵک دەدەن یان ئامۆژگارییان دەکەن لە مەترسی زیادەڕەویکردن لە (سد الذرائع)یان کردنەوەیدا، چونکە هەر زیادەڕەوییەک لەمەدا دەبێتە هۆی قورسکردنی کارەکان بۆ مرۆڤەکان و کاریگەری لەسەر سەقامگیری دەروون و ڕەفتارەکانیان دەبێت و بەمەش کاریگەری لەسەر ئاشتی کۆمەڵایەتی دەبێت.

چونکە بیانووبەستن (سد الذرائع) بریتییە لە پرۆسەیەکی ئیجتیهادی کە لەسەر بەرژەوەندی دراوەپاڵ (مصالح المرسله) ڕاوەستاوە، کە ئەمیش لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر گۆڕانی بەسەردا دێت، هەروەها لە کارپێکردنیدا بیانوویەک هەبێ بۆ خراپە، ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ هەڵسەنگاندن و تێڕوانینی کەسەکە، مرۆڤ بگاتە هەر ئاستێک بە ئاگا نابێ لە خراپە یان بەرژەوەندی دراوەپاڵ (مصلحة المرسلة) و ئاگاشی لە کاریگەرییەکانی داهاتووی نییە، لەوانەیە مرۆڤ گومان بکات کە شتێک دەبێتە هۆی خراپە یان سوودی لێدەکەوێتەوە، دواتر پێچەوانەکەی دەربکەوێت، لەوانەیە زانا یان موفتی لە ڕەوشێکی ئاشوباوی لە وڵاتێک یاخود بارێکی تایبەت بەخۆی یان شێواو بژی، بکەوێتە ژێر کاریگەری ئەو ڕەوشە و لەبەر ڕۆشنایی ئەودا فەتوای حەرامبوون بدات، دواتر دەربکەوێت ئەوە هەڵە بووە و شوێنەوارەکانی ئەو هەڵەیە دەربکەون یان بەپێچەوانەوە، ئەمە پێویست دەکات کە موفتی زیاتی ئەگەر لەبەرچاو بگرێت، ڕاویژ لەگەڵ کەسانی شارەزا بکات لەبارەی ئەو شوێنەوارانەی بەهۆی ئەو بیانووەوە هاتوونەتە ئارا، هەتا فەتواکەی بەپێی پێویست وردبوونەوەی تێدا کرابێت[١٩].

١٨. بڕوانە: الفروق: ٣٢/٢ ـ ٣٣، والأدلة المختلف فيها: ٢٠٦ ـ وما بعدها، وسد الذرائع وتطبيقاته في المذهب الشافعي: حنان عبد الكريم القضاة، ومحمد خالد منصور، بحث منشور في مجلة: دراسات علوم الشريعة والقانون ـ الجامعة الأردنية، المجلد ٤٢، العدد ٢، ٢٠١٥ م، ص ٦٧٥ ـ وما بعدها، وأصول في المعاملات المالية المعاصرة: أ.د. خالدبن عبدالله المصلح، من موقع الشيخ في النت ((www.almosleh.com/ar/ show-ar-index-٤٩٦٧٧.html،تأريخ الزيارة ٢٠١٨/٣/١٥م، والاستدلال بسد الذرائع الضوابط وإشكالات التطبيق: أ.د. عياض السلمي، من موقع (www.fiqh.islammessage.com)، تأريخ الزيارة١٥/٣ /٢٠١٨.

١٩. بڕوانە: قاعدة سدّ الذرائع وتطبيقات العمل بها في المعاملات المالية والمصرفية المعاصرة ـ دراسة فقهية تأصيلية تطبيقية: أ.د. علي محيي الدين القرداغي، بحث مقدم إلى مؤتمر الشورى الفقهي ـ الكويت، من موقع

لەو نموونانەی دەیسەلمێنن زانایانی کورد کاریان بە بیانووبەستن (سد الذرائع) کردووە، فەتوای مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس (٢٠٠٥ وەفاتی کردووە) بە ڕێگری لە هاوسەرگیری ژن بە ژن، ئەمجۆرە هاوسەرگیرییە ئەگەرچی بەگرێبەستی جودا بوو، لە ڕابردوودا باو بوو لەنێو کورددا و لە ڕووکاردا شەرعی بوو، چونکە بەدوو گرێبەستی لەیەک جیا بوو، بەڵام مامۆستای مودەڕیس ڕێگری لێکرد، ئەمەش بەهۆی ئەو کێشانەوە بوو کە بەهۆی ئەمجۆرە هاوسەرگیری ژن بەژنەوە دروست دەبوون، لەوانە: لەکاتی ڕوودانی کێشە و لەیەکنەگەیشتن لە نێوان ژن و مێردێکیاندا بەبێ ویستی خۆیان کاریگەری لەسەر ژن و مێردەکەی تریش دەبوو، تەنانەت ئەگەر یەکێکیان ژنەکەی تەڵاق بدایە دەبوو پیاوەکەی تریش بەپێی نەریتی باو ئەویش ژنەکەی تەڵاق بدایە، ئەگەرچی کێشە لەنێوانیشیاندا نەبوو، لەبەرئەوە ئەگەرچی لەڕووی بناغەی کارەکەوە دروست و ڕاست بێت و گرێبەستەکەش تەواو بێت، بەڵام دەبێتە هۆی دروستبوونی حەرام، هەربۆیە ئەمیش حەرام دەبێت، ئەمەش لەڕوانگەی بیانووبەستن (سد الذرائع)ەوە[20].

لێرەدا نموونەیەکی تر دەخەینە ڕوو، کە خۆم لە هەرێمی کوردستان بینیوومە: لە پاییزی ساڵی ٢٠٠٦، لەکاتێکدا مۆبایل تازە پەیدا ببوو، لە نوێژی هەینی یەکێک لە قەزاکانی دەوروبەری هەولێر ئامادەبووم، مامۆستای وتاربێژ –کە وتاربێژی فەرمی بوو لەلایەن ئەوقافەوە دانرابوو– لەگەڵ ئەوەی ئەم پیشەیە لەئێستادا ئەوە ناگەیەنێت مامۆستای وتاربێژ هەڵگری زانستێکی قوڵ بێت لە بواری زانستدا، قسەی لەسەر حەرامێتی ڕەهای مۆبایل دەکرد، چەندینجار جەختی لەسەر حوکمی حەرامبوونی مۆبایل کردەوە، بەدەربڕین و شێوەی جیاجیا، لەکۆتاییدا تاکە بەڵگەی دەستی بریتی بوو لە: زیادەڕەویکردن لە کردنەوەی دەروازەی بیانووبەستن (سد الذرائع)، لەوکاتەدا خۆی بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی بینیووە و بیستوویەتی زۆرێک لە ئافرەتان بەهۆی مۆبایلەوە ناپاکییان لە مێردەکانیان کردووە، بۆیە بەمەبەستی نەهێشتنی ئەو خراپەکارییە بەتەواوەتی دەرگای ئەم ڕێگەپێدراو (مباح)ە داخستووە.

لەگەڵ مندا بیر بکەنەوە خەڵکی ڕەشۆکی –دڵسۆز بۆ ئایینەکەی و بەتەقوا– چۆن

---

منتدى العلماء:

(( www.msf-online.com/?p=٥٨٥٠، تاريخ الزيارة: ٢٠١٨/٣/١٥.

٢٠. بڕوانە: شەریعەتی ئیسلام...: مەلا عبدالكريمی مدرس، ٣ / ١٠٧ ـ ١٠٨، وجهود الشيخ عبد الكريم المدرس الفقهية: ٢١١ ـ ٢١٢.

ڕەفتار لەگەڵ کچ و ژنی دەکات کاتێک دەگەڕێتەوە بۆماڵەوە پاش وتاری هەینی؟ خۆی لە مامۆستای مزگەوتی بیستووە لە وتاری هەینیدا کە مۆبایل بەتەواوەتی حەرامە، بەڵکو پێویستی کردووە لەسەریان کار بەقسەکەی بکەن، چونکە لە شێوازی بڕیاردان و ڕاگەیاندنی پێیان: ئەوە فەرمانێکە و لەسەر مینبەری پێغەمبەر (د.خ) ئەوەی پێڕاگەیاندوون. بەدڵنیاییەوە ئەوە دەبێتە هۆی دروستکردنی کێشە و گرفت لەنێو تاکەکانی خێزان بەتایبەت و کۆمەڵگە بەشێوەیەکی گشتی، بێگومان کاریگەریشی لەسەر ئاشتی کۆمەڵایەتی دەبێت. لەبەرئەوە زانایانی شەرعزان پێودانگیان بۆ کارکردن بە بیانووبەستن (سد الذرائع)، یان ڕێگری لە پاساو و حەرامکردنی بنەڕەتی داناوە، ئەویش بریتییە لە: بەدڵنیاییەوە ببێتە هۆی خراپەکارییەک یان زیاتر، یان زیانەکانی کارەکە زیاترە لەو سوودەی کە ڕەنگە لە ئەنجامی ئامرازەکەوە بێتەدی. بەهەمان شێوە ئەو کارانەی کە بەپێی ئەم بەڵگەیە حەرام دەکرێن ئەوانەن کە وا لە ڕووکاردا دەردەکەون کە ڕاستن، بەڵام پڕن لەو تۆمەتەی کە دەبێتە هۆی شتێکی شاراوە کە حەرامە، بەهۆی زۆری ژمارەیانەوە کە مەبەست لێی ئەوە بووە[٢١].

**دووەم: نەریت (عرف):**

نەریت پێگەیەکی مەزن و پایەیەکی بڵندی هەیە لە مێژووی مرۆڤایەتی و لە زۆربەی کایەکانی کۆمەڵگەکان بە پێکهاتە فرەیبە کۆن و نوێکەیانەوە، ئەمەش بەهۆی باڵادەستی و پێگەی لە چارەسەرکردنی ململانێی نێوان تاکەکاندا، لای شەرعزانانی ئوصولێش دەروازە و بەشی جۆراوجۆر و وردی هەیە، بەڵکو بە لەبەرچاوگرتنی شەرعی و مرۆیی و واقیعی خۆی بابەتیکی گرنگە کە لە کاری تیۆری و جێبەجێکردندا ڕەچاوکراوە، بەوهۆیەشەوە بەرزبووەتەوە بۆ ئاستی تیۆرێکی گشتی و سەرەکی بۆ تێکڕای ئەوانەی دەیگرێتەوە و پەیوەستن پێیەوە و ئاڕاستەکاری هەڵبژاردە و ڕێنوێنییەکانی لە بوارەکانی داوەریکردن بە عورف و پشتپێبەستنی لە تێگەیشتن و جێبەجێکردن و لە فەتوا و ئیجتیهاد و لە سیاسەت و کۆمەڵناسی، جگە لەمانەش لەو ڕووداو و گوفتار و کردار و ڕەفتارانەی نەریتی تێدایە، هەربۆیە بۆ عورف و دەروازەکانی تیۆرێکیان کردووەتەوە ناویان لێناوە تیۆری دابونەریت (نظرية العرف) مەبەست لێی: ئەو بونیاتە مەعریفییە شەرعییە

---

٢١. وەک ئەوەی لە مەجمەعی فیقهی ئیسلامی بڕیاری لەسەر دراوە، بە بڕیاری ژمارە (٩٢-٩/٩) لە کۆنگرەی نۆیەم لە ئەبوزەبی، میرنشینە یەکگرتووەکانی عەرەبی، لە نیسانی ١٩٩٥، بڕوانە: مجلة مجمع الفقه الإسلامي: ٩ / ١٧٠٢.

تەواوەمەندەی عورفە بە ئیعتیبارە جیاوازەکانییەوە، وەک ئیعتیباری ئوصوڵی کە وادەکات عورف بنەمایەک بێت لە بنەماکانی ئوصوڵی فیقە یان سەرچاوەیەک لە سەرچاوەکانی ئیجتیهاد و دەرهێنانی حوکمەکان، ئیعتیباری فیقهی کە وایکردووە عورف کەرەستەیەکی گرنگی کاری فیقهی و فەتوا بێت[٢٢].

لە قورئان و فەرموودەدا چەندین دەق هاتووە لەسەر لەبەرچاوگرتنی دابونەریتی خەڵک کە لەگەڵ فیترەت و سەقامگیری خەڵکدا گونجاو بێت، هەروەک لەم ئایەتەدا هاتووە: (وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ) (البقرة: ٢٣٣). لێرەدا مەبەست لە (المعروف) دابونەریتی خەڵکە لە مەزەندەکردنی ڕۆزیی و پۆشاکدا، ئایەتی دیکەش هەیە وەک: (البقرة: ٢٤١ و النساء: ٦) کە بێژەی (المعروف) هاتووە و، مەبەست لێی: ئەوەیە خەڵک ئاشنان پێی. بەهەمان شێوە لە فەرموودەشدا هەمان بێژە بەو واتایە هاتووە، هەروەک لە فەرموودەی خاتوو (عائیشە) (ڕەزای خوای لێ بێت) هاتووە، کە هندی کچی عوتبە کە هاوسەری ئەبو سوفیان بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەبو سوفیان پیاوێکی ڕژدە، ئەوەی پێمدەدات بەشی خۆم و کوڕەکەم ناکات، بەوە نەبێت کە خۆی ئاگای لێی نییە و دەیبەم، پێغەمبەر (د.خ) فەرمووی: (خذي ما يَكفِيك وولدَك بالمعروف) [٢٣] واتە: (ئەوەندە ببە کە بەشی خۆت و کوڕەکەت دەکات بە چاکە). دەکرێت پوختەی قسان بڵێین کە دابونەریت کارێکی لەبەرچاوگیراوە لە ئیسلامدا، ئیدی بەوە بێت کە دەقی لەسەر هاتووە کە فەرمانی پێکراوە و بڕیاری لەسەر دراوە، یاخود بەلەبەرچاوگرتنی لە فەتوا و ئیجتیهاد و دادگا و سیاسەت و بەڕێوەبردنی تایبەت و گشتیدا[٢٤].

ڕاجیایی لە نێوان زانایاندا نییە لەسەر ئەوەی دابونەریت کە لەلایەن خوای گەورە ئیعتباری بۆ دانراوە، بەهەمان شێوە ڕاجیایی نییە کە ئەو عورفەی پێچەوانەی بەڵگەی شەرعی نەبێت لەبەرچاو دەگیرێت، لەهەمانکاتدا ڕا جیایی نییە لەسەر ئەوەی ئەو

---

٢٢. بڕوانە: نظرية العرف في المذاهب الإسلامية وإمكانيات التجديد: أ.د. نور الدين مختار الخادمي،، ص ٤.

٢٣. الحديث متفق عليه واللفظ هنا للبخاري. صحيح البخاري:٨٥/٧ برقم٥٣٦٤ كتاب: بدء الوحي، باب: إِذَا لَمْ يُنْفِقِ الرَّجُلُ فَلِلْمَرْأَةِ أَنْ تَأْخُذَ بِغَيْرِ عِلْمِهِ مَا يَكْفِيهَا وَوَلَدَهَا بِالْمَعْرُوفِ، وصحيح مسلم:١٣٣٨/٣برقم ١٧١٤، كتاب: الأقضية، باب: قضية هند. وينظر للمعنى المراد: شرح صحيح البخاري لابن بطال: ٣٣٤/٦، وشرح النووي على صحيح مسلم:١٣٣/١، و١٢/ ٨.

٢٤. بۆ زیاتر ئاگاداربوونی وتەی زانایان لەبارەی ئیعتیبارییەوە بڕوانە: تشنيف المسامع: ٣/ ٣٧٣ ـ وما بعدها، ونظرية العرف: ١٢ـ وما بعدها.

دابونەریتەی پێچەوانەی بەڵگەی شەرعی بێت بەهای نییە و لەبەرچاو ناگیرێت، ئەو عورفەی ڕاجیایی هەیە لە نێوان شەرعزانان لەسەر ئەوەی وەک حجە وەربگیرێت بریتییە لە: ئەوەی بۆ سەلماندنی یان ڕەتکردنەوەی بەڵگەی شەرعی نەبێت. ئەمە لەلای شەرعزانانی حەنەفی و مالیکی وەک بەڵگەی پشتپێبەستراو بۆ سەلماندنی حوکم وەرگیراوە، بەڵام شەرعزانانی شافیعی و حەنبەلی وەک بەڵگەی سەربەخۆ وەریانگرتووە[٢٥]. بەڵام ئەم بەڵگەیەش هەروەک بەڵگەی پێشوو بیانووبەستن (سد الذرائع) ئەو ڕاجیاییەی لەسەری هەیە ئەوەیە ئایا وەک بەڵگەیەکی سەربەخۆ کاری پێبکرێت یاخود وەک شوێنکەوتەی بەڵگەیەکی تر یان چەسپاوە لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی پێویستی و بەرژەوەندی یان لەگەڵ وەلانانی نارەحەتی و سەختیی و کارپێکردنی بۆ ئاسانکاری لە ئەرکبارییەکان نەک بەسەربەخۆیی، یاخود ڕاجیایی لەسەری بۆ زۆر بەکارهێنانی و کەمکردنەوە لێی نەک ئەصڵی کارپێکردنی، یاخود ناسرانی هەندێک بەمەو نەناسرانی مەزهەبی بەرانبەری بەوە، هەربۆیە ئەم ڕاجیاییە زیاتر ڕووکارییە لەوەی ڕاستەقینە بێت. ئەگەرنا زۆرێک لە لقە فیقهییەکانی نێوان زانایان هەیە لە مەزهەبە جیاوازەکاندا، کە دەیسەلمێنێت هەموویان کاریان پێکردووە[٢٦].

لەگەڵ ئەوەشدا زانایان بۆ کارپێکرانی چەندین مەرجیان داناوە، گرنگترینیان[٢٧]: پێکەوەبەستران و گشتگیریی و بڵاوبوونەوە لەنێو خەڵکدا، بەجۆرێک کە بەڵگەی شەرعی یان بەڵگەی بنڕ (قطعي) لە ئوصوڵی شەریعەت پێچەوانەی نەبێت و، هیچ ڕێککەوتنێک لە نێوان هەردوو لای گرێبەستکاردا نەبێت کە پێچەوانەوەی بێت و، لە بەرچاوی خەڵکدا پابەندکاربێت.

لەو داب و نەریتانەی لەکۆن نوێدا لەنێو کۆمەڵگای کوردیدا خەڵکی لەسەری ڕاهاتووە دیاریهێنانی حاجی و عومرەکار بۆ خەڵکی بەگشتی و، بەتایبەتیش ئەوانەی کە پاش گەڕانەوەیان لەو گەشتە پیرۆزە سەردانیان دەکەن، بە ئارەزووی خۆی بێت یان بەهۆی ترس، بە پاڵنەری دابونەریتی باوەوە بێت کە مرۆڤ ناتوانێت لێی لا بدات. لیژنەی باڵای فەتوا لە هەرێمی کوردستان بەوردی و بابەتیانە لەم بابەتەی

---

٢٥. بڕوانە: الأدلة المختلف فيها: ١٨٠ ـ وما بعدها، وأصول الفقه الإسلامي للزحيلي: ٢ / ١٨٠.

٢٦. بڕوانە: تشنيف المسامع: ٣ / ٣٧٣ ـ وما بعدها، والأدلة المختلف فيها: ١٨٠ ـ وما بعدها، وأصول الفقه الإسلامي للزحيلي: ٢ / ٨٣٠ ـ وما بعدها.

٢٧. بڕوانە: الأدلة المختلف فيها: ١٨٥ ـ وما بعدها.

کۆڵیوەتەوە و بەراوردێکی لە نێوان سوودەکانی ئەو دیارییانە و زیانەکانیان کردووە، بەوە گەیشتووە ڕێگری لە وەرگرتن و پێدانی بکات[٢٨]، بەهۆی ئەوەی لە سنووری بەخشینی دیاری ئاسایی دەرچووە و چووەتە خانەی زیادەڕەویکردنەوە، بەوهۆیەشەوە زیان و دڵئێشان هاتووەتە ئارا، ئەمجۆرە دیاری بەخشینە لە جۆرێک لە بەخشین و چاکە و هۆکاری بڵاوبوونەوەی خۆشەویستیی نێوان خەڵکییەوە گۆڕاوە -بەزۆری- بۆ ئامرازی وازهێنان لە پەرستش و هێنانە ئارای ناخۆشی لە نێوان دیاری بەخش و دیاری وەرگردا و بووەتە کارێکی ناچاری و ترسان لە خەڵکی دەبێت وا بکات، ئەمەش وایکردووە تووشی سەختی و ناڕەحەتی ببێت و لەڕەوتی خۆی لایداوە، ئاشتی کۆمەڵایەتی لێرەدا لە بەردەم مەترسیدایە، لەبەرئەوە نەهێشتنی لەپێشترە لەوەی ڕێگەی پێبدرێت، ئەمەش گرنگی ئاشتی کۆمەڵایەتی و پێگە و کاریگەری لەسەر حوکم و لەسەر بەڵگەی عورف دەردەخات.

**١. چەسپاندنی ئاشتی کۆمەڵایەتی لەڕێی مەبەستەکانی شەریعەتەوە:**

مەبەستەکانی شەریعەت (مقاصد الشريعة) لە زووەوە کارێکی تێبینیکراوە لە دەقی زانایان و ئوصولییەکاندا، بەڵام جیاوازی هەیە لە دەربڕیندا، هەندێکجار: دانایی مەبەست بە شەریعەت، یاخود: بەرژەوەندی، یان: ڕەتکردنەوە و لادان و نەهێشتنی زیان، یان: وەلانانی سەختی و لابردنی ناوبراوە، یان بە: پێنج هەمەکییە شەرعییەکە (الكليات الشرعية الخمس)، یان بەهەر ناوێکی تر(٢٩). دەتوانین واتا و مانای زاراوەکە لەمەدا کۆبکەینەوە: مانا و ئامانجەکانی شەرع لە هەموو ئەحکامەکانی یان لە زۆربەیاندا، یاخود بریتییە لەو نهێنی و مەبەستانەی کە خوای گەورە لە هەر حوکمێک لە حوکمەکانیدا دایناوە، زانینیان لەسەر موجتەهید ڕانەوەستاوە، بەڵکو جگە لەویش بۆ ئاشنابوونی نهێنییەکانی یاسادانان سوودیان لێ دەبینێت، ئەویش لەکاتی دەرهێنانی حوکمەکان و تێگەیشتن لە دەقەکان لێی سوودمەند دەبێت و لەیەک ئامانجدا کۆ دەبنەوە، ئەویش بریتییە لە پەرستشی خوای گەورە و بەرژەوەندی مرۆڤ لە هەردوو دونیادا(٣٠).

مەبەستی شەریعەت بریتییە لە پاراستنی سیستەمی جیهان و ڕێککردنی

---

٢٨. بڕوانە: ڕۆڵی لێژنەی فەتوا لە کوردستاندا: ١٥٥ ـ دواتری.

٢٩. بڕوانە: الاجتهاد المقاصدي: ٣٥ ـ وما بعدها.

٣٠. بڕوانە: أصول الفقه الإسلامي: ٢ / ١٠١٧، والاجتهاد المقاصدي: ٣٨.




ڕەفتاری خەڵکی بۆئەوەی نەکەونە هەڵە و خراپەوە، ئەمەش بە بەدیهێنانی بەرژەوەندییەکان و دوورکەوتنەوە لە خراپەکان دەبێت(٣١)، ئەویش چەند جۆرێکە و بەپێی ئیعتیباری جیاواز، لەوانە(٣٢):

**أ. بەگوێرەی پێویستبوونی: پێویستە وەک پاراستنی ئایین و پێنج هەمووەکییەکەی تر، یاخود پێویستی وەک سەلەم، یان تەحسینی وەک ئادابی نانخواردن.**

**ب. بەگوێرەی تەواو دڵنیایی و گومان، یان ئەوەتا: بنبڕە وەک پاراستنی ناموس، یاخود گوماناوییە وەک لێدانی تۆمەتبار بە دزیکردن هەتا قسە بکات.**

**ت. بەلەبەرچاوگرتنی بەشی ئەو کەسەی ئەرکبار (مكلف)ە تێیدا، ئەوە: ڕەسەنە، وەک بابەتی پەرستن، یان شوێنکەوتەیە، وەک هاوسەرگیری.**

بناغەی پەیوەندی ئەم مەقاصیدانە بە ئاشتی کۆمەڵایەتییەوە دەگەڕێتەوە بۆ: (دانانی شەریعەتەکان بۆ بەرژەوەندی ئێستا و داهاتووی بەندەکانە پێکەوە)[٣٣]، ئاشتیش یەکێکە لە بەرژەوەندییە پێویستەکانی هەموو کۆمەڵگایەک، لێرەوە پێگەی ئاشتی کۆمەڵایەتی و پەیوەندی بە مەقاصیدەوە بە کاریگەربوون و کاریگەری دروستکردن دەردەکەوێت. ئێمە لێرەدا دەرفەتی ئەوەمان نییە هەموو جۆرەکانی مەقاصید و کاریگەرییان لەسەر ئاشتی کۆمەڵایەتی بەدرێژی باس بکەین، لەبەرئەوە نموونەیەک وەردەگرین و هەڵوەستەی لەسەر دەکەین تا لەڕێیەوە گرنگی چەسپاندنی ئاشتی کۆمەڵایەتی لە مەقاصیدی شەریعەتدا بزانین کە ئەویش مەبەستی: زەڕوورەت و پێویستی (الضرورة والحاجة)یە.

زەڕوورەت، بریتییە لە: ئەوەی ژیانی ئایینی و دونیایی خەڵک لەسەر ڕادەوەستێت، بە تێکچوونی ژیان تێکدەچێت و خراپە بڵاودەبێتەوە لە دونیادا و سزای دوا ڕۆژیشی بەدوادا دێت، ئەمەش بەهێزترین پلەی بەرژەوەندییە، کە ئەوانیش بریتیین لە: ئایین و نەفس و عەقڵ و وەچە و سامان[٣٤].

حاجە، بریتییە لە: ئەوەی خەڵک پێویستییانە بۆ بەڕێوەچوونی ژیانیان و

---

٣١. بڕوانە: إرشاد الفحول: ٢ / ١٨٤ ـ وما بعدها، وأصول الفقه الإسلامي: ٢ / ١٠٢٠ ـ وما بعدها.

٣٢. بڕوانە: الاجتهاد المقاصدي: ٣٩ ـ وما بعدها.

٣٣. الموافقات: ٢ / ٩.

٣٤. بڕوانە: المحصول: ١٥٩/٥ـ وما بعدها، والموافقات: ٣١/٢ـ وما بعدها، وأصول الفقه الإسلامي للزحيلي:١٠٢٠/٢.

ئاسانکاری بۆیان و لابردنی سەختی لەسەریان، بەتێکچوونی خەڵک تووشی سەختی و نارەحەتی دەبن، بەڵام سیستەمی ژیانیان تێکناچێت، پلەبەندییەکەی پاش زەروراتە[٣٥].

ئەحکامەکانی زەرورەت بەمەرجەکانییەوە بابەتە فیقهییەکان بەگشتی دەگرێتەوە نەک هەموویان، بەڵام حاجەت کاریگەرییەکەی سنووردارە، پێشەوا شافعی (٢٠٤ک وەفاتی کردووە) کاتێ قسە لەسەر سو (ربا) دەکات دەڵێت: (حەرامکراوێک بە حاجەت حەڵاڵ نابێت مەگەر لە زەروراتەکان بێت...) [٣٦]، چونکە ئەوەی زەرورەت بێت: سەلماندنی پێویستی بەبەڵگە نییە، بەڵکو دەکرێت پشت بە ئیجتیهاد ببەسترێت هەرکاتێک زەرورەتەکە هاتەدی، غەزالی (٥٠٥ک وەفاتی کردووە) دەڵێت:(سەبارەت بە پلەی زەروراتەکان(الضرورات)، هیچ دوور نییە کە بەهۆی ئیجتیهادی موجتەهیدێکەوە پێی بگات، ئەگەرچی بنەمایەکی دیاریکراویش نەبێت)[٣٧]، شێخ بنەبیە دەڵێت:(پێویستیی تایبەت نییە بەسەردەمێک و لە سەردەمێکی تردا نەبێت، بەڵام حاجەت بەوجۆرە نییە، پاشان زەرورەتی فیقهی پێویستی بەدەق نییە لە هەموو ئەو حاڵەتانەی بەسەریدا جێبەجێ دەبێت، بەڵکو ڕێگەپێدرانی گشتییە جگە لە هەندێک هەڵاوێرد بەهۆی بوونی بەڵگە و قەرینەی دیکەوە، بەڵام حاجەت پێویستی بە بەڵگەیە بۆ سەلماندنی بەهای، دەقەکانی ڕیبا لە ئاستێکدایە ناتوانرێت ڕێگە بدرێت بەهیچ جۆرێک لە جۆرەکانی مەگەر بە بەڵگە یان زەرورەت[٣٨].

مەودای زەرورەت فراوانە و تەنیا چەند بابەتێکی کەمی لێی بەدەر دەکرێت و کاریگەری لەسەریان نابێت، ئەوانیش بریتین لە: کوشتنی کەسی تر، یاخود بڕینی بەشێکی، یان بریندارکردنی بە ناڕەوا، زیناکردن، لێدانی دایک و باوک و

٣٥. بڕوانە: المحصول: ٥ / ١٦٠، والموافقات: ٢/ ٣١ ـ وما بعدها، و أصول الفقه الإسلامي للزحيلي: ٢ / ١٠٢٢.

٣٦. الأم: ٣ / ٢٨.

٣٧. المستصفى: ١٧٥.

٣٨. جیاوازی کرۆکی هەیە لە نێوان حاجەت و زەرورەتدا، دەکرێت لە سێ پلەدا کۆی بکەینەوە، ئەوانیش: پلەی سەختی و، پلەی ڕێگەنەدان (نهي)، پلەی بەڵگە، سەختی لە زەرورەتدا لە ئاستی بەرزدایە، ئەو ڕێگریەش کە زەرورەت لایدەبات بریتییە لە بەرزترین پلەی ڕێگری بەهۆی بەهێزی خراپەکەیەوە، بەڵگەش کە زەرورەت لای دەبات حوکمەکەی لەوانەیە دەقی ڕاشکاوی قورئان و فەرمووده بێت وێڕای بەڵگەکانی تر، بڕوانە: الفرق بين الضرورة والحاجة...: د.عبدالله بن بيه، بحث منشور في مواقع عديدة، منها موقع الاقتصاد والتمويل الاسلامي(www.iefpedia.com/arab)، تأريخ الزيارة:٢٠١٨،١٢١/٢/٢٦ـ وما بعدها، و١٥٦، و١٦١ ـ ١٦٢.

خراپ بەکارهێنانی ماڵ و سامان[39]. ئەم بابەتانە بە کۆدەنگی زانایان زەرورەت کاریگەری نابێت لەسەریان - واتە لەکاتی پێویستدا لەبەر زەرورەت ڕێگەیان پێنادرێت- تەنها ئەوە نەبێت کە لەنێو زۆر بابەت لەنێو شەرعزاناندا ڕاجیایی لەسەرە، لەوانە: خواردنی گۆشتی مرۆڤی مردوو لەکاتی مردن و ناچاریدا[40].

با نموونەیەک لە کۆمەڵگەی کوردی وەربگرین و کاریگەری ئاشتی کۆمەڵایەتی لە حوکمەکەیدا بەهۆی زەرورەت یان حاجەت و بە پاڵنەری یەکێکیان ڕوونبکەینەوە، ئەویش پێشینەی خانووبەرە (سولفەی عەقار) کە مەبەست لێی: گرێبەستێکی قەرزی داراییە، پەیوەندی بە پرۆژەی نیشتەجێبوونەوە هەیە، جا چ بیناسازی بێت یان نۆژەنکردنەوە، لەلایەن دەزگایەکی فەرمی وەک بانکێکەوە دەیداتە کەسێکی ئاسایی[41].

حکومەتی هەرێمی کوردستان بڕیاریدا پێشینەی خانووبەرە بدرێتە هاووڵاتیانی نیشتەجێی هەرێم بەمەبەستی ڕەخساندنی دەرفەتی دروستکردنی خانووبەرە و چارەسەرێک بۆ قەیرانی نیشتەجێبوون، ئەمەش دوای ئەوەی پەرلەمانی کوردستان بڕیارێکی لەوبارەوە دەرکرد و ئەم یاسایە لە بەرواری (٢٠٠٨/١٠/٢٣)ەوە کەوتە بواری جێبەجێکردنەوە، لەم بەروارەوە و لەژێر فشاری زانایان و مامۆستایاندا پێشینەی خانووبەرە بە سێ قۆناغدا تێپەڕی، بەهۆی بوونی زیادەیەک لەسەر قەرزەکە لە قۆناغی یەکەمدا، بەوپێیەی (٢٪) خرابووە سەر قەرزەکە، جگەلەوەش وەرگرتنی ڕێژەی (١٠٪) لەکاتی دواکەوتنی دانەوەی قیستەکان، ئەم زیادەش جۆرێکە لە ڕیبا کە حەرامە، لە قۆناغی دووەمدا کە لە ٧ی شوباتی ٢٠١٠ دەستپێیکرد، ڕێژەی (٢٪) لابرا، بەڵام بڕیاریاندا بڕی (٢٥٠) هەزار دیناری عێراقی وەک خەرجی و ڕسوماتی هەمەڕەنگ بۆ لیژنەکان وەربگرن، هاوکات غەرامە و بیمەی دواکەوتنی دانەوەی قیستەکان مایەوە، دواجار کۆتایی هات و لە قۆناغی سێیەمیشدا کە بەرواری ٢٠١١/٢٨/٧ بوو، ڕێژەی زیادەی (٢٪) لابرد، هەروەها بیمەکەیان هەڵوەشاندەوە، بەڵام غەرامەی دواکەوتن مایەوە. لە کۆتاییدا لە قۆناغی سێیەمدا، کە لە ٢٠١١/٢٨/٧ ئەنجامدرا، ڕێژەی (٢٪) لابرا، هەروەها بیمەکەیان هەڵوەشاندەوە، بەڵام بەهۆی بوونی

---

٣٩. بڕوانە: المحلى: ٨ / ٦٠١، والمغني: ٨ / ٦٠١.

٤٠. بڕوانە: البيان: ٤/ ٥١٨،وأحكام القرآن لابن العربي:٨٦/١، والمجموع:٩/ ٤٧، والمعاملات المالية أصالة ومعاصرة:٣/ ٤٠٧ ـ وما بعدها.

٤١. بڕوانە: المسائل المالية المختلف فيها...: ١٦٥.





غەرامەی دواکەوتنی دانەوەی قیستەکان کە ڕێژەی (١٠٪) وەک دوو قۆناغی پێشوو مابوویەوە، جگە لە (٢٥٠) هەزار دیناری عێراقی بە بیانووی خەرجی هەمەڕەنگ و خزمەتگوزاری قەرزەکان[٤٢]. بەڵام دەتوانرێت بەشێوەیەکی زۆر ئاسان چارەسەری ئەم کێشەیە بکرێت، ئەویش ئەوەیە کە ئەگەر قەرزدار فەرمانبەر بێت، دەوڵەت بڕە پارەیەکی دیاریکراو لە مووچەکەی دەبڕێت بۆئەوەی پێدانی قەرزەکە لەکاتی خۆی زیاتر دوانەکەوێت، بەمشێوەیەش هیچ زیادکردنێک ناکەوێتە سەر قەرزەکەی، ئەگەر فەرمانبەر نەبێت دەکرێت فەرمانبەرێک ببێت بە کەفیلی و قەرزەکان لە موچەی بریکارەکە ببڕدرێت لە ئەگەری ترسی دواکەوتنی پارەدان.

لیژنەی باڵای فەتوا لە کوردستان لەسەر ئەو پرسە کۆبووەوە و باسی ئەو پرسەیان کرد و زۆربەی زانایانی لیژنەکە – لەڕاستیدا زۆربەی زانایانی ناوچەکە – لەکۆتاییدا گوتیان کە وەرگرتنی ئەم پێشینەیە بەگشتی دروستە. لەکاتێکدا هەندێکی تر لە مامۆستایان زیاتر بەدواداچوونیان بۆ ئەو پرسە کرد و مەودای گشتییان بەرتەسککردەوە بۆ دیاریکردنی بۆ کەسێک کە کۆمەڵێک مەرجی تێدا بێت، بەلەبەرچاوگرتنی بوونی گومان تێیدا، هەربۆیە قەدەغەیان کرد جگەلە حاڵەتەکانی زەرورەت و حاجەت کە ئەویش هەمان پێگەی زەرورەتی هەیە، وەک کەسێک خانووبەرەی نییە، دیارە خانووبەرە یەکێکە لەو پێداویستییانەی کە دەگاتە ئاستی زەرورەت بۆ خێزانەکان، سەلامەتی و سەقامگیری خێزان و ئاشتی کۆمەڵایەتی گشتی لەسەر ئەو ڕاوەستاوە، یان ڕێگەی پێدرا بۆ کەسێک کە خانووی هەیە، بەڵام بەشی خێزانەکەی ناکات، یان دروستە بۆ کەسێک کە کەس نییە پارەی پێبدات بە قەرز و هیچی پێناکرێت(٤٣). لە هەموو ئەو حاڵەتانەدا و لەپێناو زەرورەت یان حاجەت، کە هەمان پێگەی هەیە لێرەدا و، بەهۆی ئەوەی لەم فتوایەدا ڕەچاوی پاراستنی ئایین و ژیان و نامووس و ماڵ و سامان کراوە، هیچ سەقامگیرییەک بۆ خێزانەکان و ئاشتی کۆمەڵایەتی نییە بەبێ دابینکردنی خانووبەرە و پاراستنی ئەم ئامانجە پێویستانە.

٣- چەسپاندنی ئاشتی کۆمەڵایەتی لە ڕێگەی حوکمی شەرعییەوە – سنووردارکردنی ئەوەی ڕێگەپێدراوە (مباح) وەک نموونە.

حوکمی شەرعی ئەرکباری (تکلیفی) لای ئوصولییەکان بریتین لە: واجب،

٤٢. بڕوانە: هەمان سەرچاوە: ١٦٧ ـ و دواتر، و ڕۆڵی لیژنەی فەتوا لە کوردستاندا: ٧٣ـ ٧٤.

٤٣. بڕوانە: المسائل المالية المختلف فيها...: ١٦٠ ـ وما بعدها، و ڕۆڵی لیژنەی فەتوا لە کوردستاندا: ٧٣ـ وما بعدها.

قەدەغە، ڕێگەپێدراو، مندوب و بێزراو(مکروه)[٤٤]. لێرەدا نموونەیەک بۆ ڕێگەپێدراو (مباح) وەردەگرین و پەیوەندییەکەی بە ئاشتی کۆمەڵایەتی و خێزانی موسڵمانان ڕووندەکەینەوە، ئەویش مەسەلەی سنووردارکردنی ڕێگەپێدراوە لەپێناوی بەرژەوەندی گشتی.

سنووردارکردنی ڕێگەپێدراو ڕەگ و ڕیشەی هەیە لە بەڵگەکانی سوننەت و شوێنەواری خەلیفەکانی ڕاشیدیندا، وەک: عومەری کوڕی خەتاب و عوسمانی کوڕی عەفان (خوای گەورە لێیان ڕازی بێت) زۆر درێژەی پێنادەین، بەڵکو بە ئاماژەدان وازدەهێنین، زیاتر لە بیست نموونە هەیە کە هەموویان لە پشت ئەو سنووردارکردنەوە لەبەرچاوگرتنی ئاشتی کۆمەڵایەتی بەگشتی و ئاشتی خێزانی بەتایبەتی هەیە، بەدەستهێنان ئەم بەرژەوەندییە وایکردووە پەنا بۆ ئەم سنووردارکردنە ببەن و خەڵک پابەند بکەن پێیەوە[٤٥]. خۆ ئەگەر لە هەرێمی کوردستانیش سەیر بکەین لە بابەت ئەم پرسە، دەبینین فەتوای چەندین زانا یاخود ڕاوێژی یاساناسان و دەسەڵاتی یاسادانان هەیە بۆ سنووردارکردنی کاری ڕێگەپێدراو لەپێناو پاراستنی ئاشتی کۆمەڵایەتی، لەوانە چەندژنی، کە لەبنەڕەتدا ڕێگەپێدراوە، لە دەسەڵاتی وەلی ئەمردا هەیە بەپشتبەستن بە خەڵکی پسپۆڕ و موجتەهید سنوورداری بکات و مەرجی بۆ زیادبکات بەهۆی پێویستی ئەوکاتەی ئەو کۆمەڵگەیەوە، بەجۆرێک کە خزمەت بەو ئامانجە بکات، کە چەند ژنی لەپێناویدا دانراوە، سنووردارکردن پێودانگی خۆی هەیە، لەوانە گونجانی لەگەڵ مەبەستە سەرەکییەکانی بابەتەکەدا.

کاتێ قسە لەبارەی هەرێمی کوردستانەوە دەکەین، ئەو سنووردارکردنەی لەو دەقەدا هاتووە مباحە، وەک لەم ئایەتەدا هاتووە: (... فَانْكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنَ النِّسَاءِ مَثْنَى وَثُلاثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاّ تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ذَلِكَ أَدْنَى أَلاّ تَعُولُوا) (النساء:٣)، بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندی لە چەند ژنی و هێنانەدی بەرژەوەندی هاوسەرگیری کە خۆی لە پاکێتی و وەچەخستنەوە و مانەوەی ڕەگەزی مرۆڤ و ئارامیی ڕۆحی و کۆمەڵایەتی... هتد، ئەم سنووردارکردنە کە لە ئایەتەکەدا هاتووە لەگەڵ هەموو ئەم مەبەستانەدا دەگونجێت، لەڕاستیدا خزمەت بە هەموویان دەکات، بەڵام بە کەمترین وردبوونەوە لە کۆت و بەند و سنووردارکردنە زۆرەکانی یاسای هەموارکراو، ئەوە

٤٤. بڕوانە: المستصفى: ١ /١٢٧، والمحصول: ١ / ٨٩.

٤٥. بڕوانە: تقييد المباح: ٢٨ ـ وما بعدها، ومؤسسة الإباحة: ١٣٣ ـ وما بعدها.

ڕووندەبێتەوە کە بابەتەکە لە ڕێڕەوی خۆی دەرچووە و زیادەڕەوی و توندییەکی زۆری تێدایە، بۆیە بابەتەکە لە سنووردارکردنەوە گۆڕاوە بۆ قەدەغەکردنی[٤٦].

دەروازەی سێیەم: فەتوا و کاریگەری لەسەر ئاشتی کۆمەڵایەتی

هەتا ئێستاش مامۆستایان و کەسایەتییە ئایینیەکان پێگەیەکی کۆمەڵایەتی بەرزیان هەیە، ئەمەش بەهۆی بە گەورە سەیرکردنیان لەلایەن خەڵکەوە، بەجۆرێک ئەوان وەک لە دروشمە ئایینییەکان وەهان کە دەبێت ڕێزیان لێبگیرێت، ئەو ڕۆڵە گەورەشی زانایان لەزۆر بواری ژیاندا بەدرێژایی مێژوو هەیانبووە لە بەدیهێنانی بەرژەوەندی خەڵک بەبێ جیاوازی، ئەمە باشترین شاهێدە لەسەر دڵسۆزی و خەمخۆریان بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی و بەختەوەری خەڵک، هەربۆیە هەردەم قسەیان گوێلێگیراو بووە، بگرە قسەی ئەوان یەکلاکەرەوەی زۆر بابەت بووە، لەبەرئەوە فەتوا و پێگەیان کاریگەری کارای هەبووە لە چەسپاندنی ئاشتی کۆمەڵایەتی نێوان تاکەکان و خێزان، بەوەش لەسەر تێکڕای کۆمەڵگە.

لەدێر زەمانەوە فەتوای زانایانی کورد کاریگەری کارای هەبووە کە بەوردی لێی ڕاماون و خەسڵەتی توندڕەوی بەدرێژای مێژوو لە کوردستاندا بڵاو نەبووە، ئەمەش بەهۆی قوڵی ڕیشەی زانست و زانیاری لای زانایان و گرنگیدانیان بە بابەتی ئارامی و سەقامگیری و خوێن نەڕشتن و برەودان بە ئاشتی کۆمەڵایەتی و خێزانی لەنێو خەڵکیدا و دوورخستنەوەی خراپە لێیان، ئەوەتانی فەتوای مەلا محەمەدی خەتێ (١٨٣٧ز وەفاتی کردووە) کە موفتی ئەمارەتی سۆران و ڕاوێژکاری میری ئەمارەتی سۆران محەمەد پاشای کۆرە بووە (١٨٣٨ز کوژراوە)، لە گەورە زانایانی سەردەمەکەی بووە، ئەمەش تەنها نموونەیەکە لەمبارەیەوە کە برەوی بە ئاشتی و دوورخستنەوەی زیان و بەدیهێنانی بەرژەوەندی باڵا داوە[٤٧].

---

٤٦. دکتۆر سەعدەدین پەرپیتانی قسەی لەسەر یاساکە و هەمووارەکانی و سەرپێچیەکانی لە بنەماکانی شەریعەتی ئیسلامی کردووە، پێویست بەدووبارەکردنەوەی ناکات، بڕوانە: موقف الفقه الإسلامي...: ٩٩ - وما بعدها.

٤٧. بڕوانە: فەتواکەی مەلای خەتێ ئەفسانەی مێژوونوسێک: حەسەن محمود حەمەکریم، چاپی یەکەم،٢٠٠٦ ز،ل٢٣- و دواتر، وإمارة سوران في عهد الباشا الكبير محمد كور باشا الراوندوزي:عوني الداوودي، منشور في مجلة:الحوار المتمدن،العدد: ٢٢، ٢٠٠٣/١٢/٦٩٠)، من موقع الحوار المتمدن،(www.ahewar.org/debat/show.art.asp?aid=١٢٨٤٦)، ومقالة ( بۆ وایگووت ڕوونکردنەوەیەک دەربارەی مەلای خەتێ): مەلا محمدی وەرتێ، گۆڤاری ( دەنگی زانا)، ژمارە ٣٨، رمضان ١٩٩٩ م، ل ٧٥ - و دواتر.

بەهەمان شێوە کاتێ شێخ سەعیدی پیران (١٩٢٥ز لەسێدارە دراوە) داوا لە بەدیعوزەمان سەعیدی نوورسی (١٩٦٠ز وەفاتی کردووە) دەکات خۆی و قوتابیەکانی بچنە نێو ئەو بزاڤە چەکدارییەوە لە دژی حوکمڕانی ئەو کاتە کە دژی ئایین بووە، بۆ دوورخستنەوەی خراپەیان و لە وەڵامی هەستانیان بە ڕووخاندنی خەلافەت و ڕاگەیاندنی شەڕ لە دژی ئایین و دروشمەکانی، بۆ گێڕانەوەی خەلافەتی ئیسلامی، بەڵام مامۆستا سەعیدی نوورسی بەدەم داواکەیەوە نەچوو، بۆچوون و فەتواکەی شێخی پیرانی لە ڕاگەیاندنی جیهادی چەکداری بەدروست نەدەزانی، چونکە بکوژ و کوژرا و هەردوولا لە مسوڵمانان دەبێت، خەڵکی وڵاتەکە مسوڵمانن کەوتبوونە ترسی شەڕ و یارییەکەوە کە دەستێکی گوناهبار و کینە لە دڵ و ستەمکار و بێدین لە پشتییەوە بوو، پاشان لەوکاتەدا قەناعەتی وابوو کە جیهاد تەنیا دەتوانرێت دژی دوژمنکار دەرەکی بێت و جیهادی نێوخۆیی نییە، بۆیە بەدیعوزەمان نوورسی لەم حاڵەتانەدا جیهادی بڵاوکردنەوەی ئیمان و ڕاستییەکانی بەگوێرەی سەردەم و پێداویستییە دەروونی و فیکرییەکانی و ڕووبەڕووبوونەوەی کوفر و فیکری ئیلحاد بە فیکر و عەقڵ و، پلانی چاک زانی و شۆڕشی ئاشتیانە پێ لەپێشتر بوو، ئەوەبوو پاش تێپەڕبوونی دوو مانگ و نیو بەسەر شۆڕشەکەی شێخ سەعید سەرکوتیان کرد و لە (١٩٢٥/٦/٢٩) لە شاری ئامەد لەگەڵ ژمارەیەک لە شوێنکەوتووانیدا لەسێدارەیاندا، بەڵام شۆڕشە ئیمانییەکەی مامۆستا نوورسی گەشەی کرد و بەرزبوویەوە و تەنگی بە فیکری ئیلحاد هەڵچنی و[٤٨]، واقیع پەسەندزانییەکەی نوورسی سەلماند، لەگەڵ ئەوەی هەریەکەیان پاداشتی خۆی بۆ هەیە.

---

٤٨. مامۆستا محەمەد فرنجی (قوتابی مامۆستا نوورسی کە ساڵی ٢٠٢١ وەفاتی کرد) بۆی باسکردین کە مامۆستا نوورسی زۆر ڕێزی لە کوڕ و نەوەکانی شێخ سەعیدی پیران دەگرت لە پاش لەسێدارەدرانی، هەتا جارێک بە کوڕەکەی شێخی پیران -وادەزانم ناوی محەمەد بوو- گووت: باوکت شەهیدە، ئەو کارەی من ئەو نەیتوانی بەدەیبهێنێت، ئێمە سوپاس بۆ خوا بەدیمانهێناوە، ئیلحاد و کوفر و سەرلێشێواویمان لەسێدارەدا. گفتوگۆیەکی کەسییە لەگەڵ مامۆستا فرنجی لەکاتێکدا لە کۆنگرەیەکی زانستی سەبارەت بە مامۆستا نوورسی لەگەڵیدا بووین لە مانگی شوباتی ٢٠١٣، بۆ زیاتر ئاگاداربوون لە پەیوەندی مامۆستا سەعیدی نوورسی و شێخی پیران و درێژەی تەوەرەی قسەکان، بڕوانە: الإمام النورسي والتعامل الدعوي مع القوميات، د. ليث سعود جاسم، ص٧٠ ـ وما بعدها.

## دەروازەی چوارەم: فرەیی و کاریگەری لەسەر چەسپاندنی ئاشتی کۆمەڵایەتی لای زانایانی ئوصوڵ

فرەیی لە بیرکردنەوە و بۆچوونی جیاواز، تایبەتمەندییەکی زگماکی مرۆڤە و یاسایەکی گشتیی خوداییە، لەگەڵ دەستپێکی ژیان لەسەر ڕووی زەوی هەبووە، ژیان لەسەر بنەمای ئەو مانای هەیە، لەوەوە کێبڕکێ و جیایی و دەرکەوتنی کارامەیی و ئاستەکان دەستپێدەکات، بەهۆی ئەوەوە باشە لەخراپە و چاکتر لە چاک جیا دەکرێتەوە، لەمیشەوە خوای گەورە تەکلیفی حەڵاڵ و حەرام دەخاتە ئەستۆی مرۆڤەکان، خوای گەورە دەفەموویێت: (وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ* إِلَّا مَنْ رَحِمَ رَبُّكَ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ...) (هود: ١١٨-١١٩)، بەڵام ئەم فرەییە ئامرازێکی دوو سەرە، کە دەتوانرێت بۆ پێشکەوتن و گەشەسەندن بەکاربهێنرێت، لە بەرامبەردا کاتێک لە ڕێباز و ئەرکەکەی لادەدات دەکرێت کارەسات و ماڵوێرانی و تێکدانی هاوئاهەنگی و هاوکاری و وابەستەیی نێوان خەڵکی لێبکەوێتەوە، بۆیە ئەم فیترەتە فەرامۆش نەکراوە و نەدراوەتە دەست مرۆڤەکان بەویستی خۆیان بەکاری بهێنن و بەهۆیەوە لە بواری فیکر و کاردا بەهێزەکان لاوازەکان بخۆن.

زانایان ئوصوڵ خەڵکیان لەسەر بنەمای ئاستی زانستیان دابەشکردووە بۆ دابەشکارییەکی دووانەیی، ئەویش: تاکی موسڵمان لەوە بەدەر نییە کە: یا ئەوەتا موجتەهیدە، یان کەسێکی ڕەشۆکی (عامی)یە، هەریەکەشیان پلەبەندی هەیە[٤٩]. لەسەر ئەم بنچینەیە زانایان هەستاون بەدانانی ئەو ئاداب و پێودانگانەی کە لەگەڵ ئامانجەکانی جیاوازیی و فرەییدا دەگونجێن، ئەوەتانێ ئاداب و پێودانگی مامەڵەکردنی موفتی موجتەهید لەگەڵ نەخوێندەواری پرسیارکەردا هەیە، هەشە تایبەتە بە مامەڵەی موفتی گشتی لەگەڵ موفتی مجتەهیددا، هەروەها ئاداب و ئوصوڵی مامەڵەکردنی موجتەهید لەگەڵ موجتەهیدێکی تردا، یان موفتی لەگەڵ موفتییەکی دیکەدا، یان لەگەڵ خۆی لەبارەی بۆچوون و فەتواکانی پێشووی. ئەگەر لە بەرانبەر جۆرەها کەسی تردا بووین، کە بۆچوونیان جیاواز بوو لەگەڵمان، یان لە ئاستی زانستی و تێگەیشتندا جیاوازبوون، بۆ هەر جۆرێک بنچینە و بنەمای

---

٤٩. بڕوانە: الإحكام في أصول الأحكام للآمدي: ٤ / ٢٢٧ ـ وما بعدها، وأدب المفتي والمستفتي: ٨٥ ـ وما بعدها، و١٨٥ ـ وما بعدها، والموافقات: ٥ / ٤٠٦، والتقرير والتحبير: ٣ / ٣٤٠.

مامەڵەکردنی تایبەت بەخۆی هەیە[٥٠].

دەروازەی فرەیی و ناکۆکی لە ئوصولی فیقە و چۆنییەتی مامەڵەکردن لەگەڵیدا دەروازەیەکی فراوان و درێژە، چەندین ڕێسای ئوصولی و ڕێککاری لەسەر بابەتەکە هەیە، ئەمە جگە لە پەیوەندی نێوان جیاوازیی و بەڵگە، هەروەها ناکۆکی لەگەڵ مەقاصیدە شەرعییە گشتییەکان و دەروازەکانی تر.

لەو بنەمایانەی کە قبوڵکردنی فرەیی دەسەلمێنن و مامەڵەی دروست لەگەڵیدا دادەمەزرێنن: شەرعزان یاسادانەر نییە، بەڵکو ئاشکراکەری حوکمی ئیلاهییە بەو تێگەیشتنەی کە خودا لە ڕێگەی بەڵگەی قبوڵکراو و ئاماژەی پەسەندکراوەوە پێی بەخشیوە بۆ گەیشتن بە حەڵاڵ و جیاکردنەوەی لە حەرام و قەدەغەکراو، کەواتە جیاوازییەکە ڕوونە، هەرئەوەشە کە جیاوازیی نێوان فیقهو شەریعەتی لەسەر بونیادنراوە.

قبوڵکردنی بۆچوونی بەرانبەر و ڕای دیکە و مامەڵەکردن لەگەڵی لەسەر بنەمای دوور لە ڕق و کینە و ڕکابەرێتی، بنەمایەک بووە لای زانایانی کورد لە هەر شوێنێکدا بووبن، تەنانەت گەورە زانایانی کورد ڕێگەیان نەداوە جیاوازییەکە کاریگەریی خۆی لەسەر ئاشتی کۆمەڵایەتی بەجێبهێڵێت و ببێتە هۆی شەڕ و تێکدانی پاکی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، ئەوەتا شێخ عەبدولڕەحمانی ئیبن خەیاتی قەرەداغی (١٣٣٥ک - ١٩١٧ ز، وەفاتی کردووە) نوێژکردن لە پشت ئەو کەسانەوە بەدروست دەزانێت کە بە موجەسیمە ناسراون، کە باوەڕیان وایە خوای گەورە جەستەی هەیە، مەترسی ئەم بۆچوونە لە عەقیدە و فیکری ئیسلامیدا ڕوونە[٥١]، بەڵام ئەم سینەفراوانییە لە قبوڵکردنی ڕای جیاواز لە کوێ و ئەو بیرکردنەوە تەسکە لەکوێ، کە جیاوازی ڕا لە لقێکی فیقهی سادەدا قبوڵ ناکات؟

---

٥٠. لە دانراوە بەرزەکان لەم بوارەدا، کتێبی: (أدب المفتي والمستفتي) لابن صلاح الشهرزوري ( ت٦٤٣ هـ )، و( آداب الفتوى والمفتي والمستفتي ) للإمام النووي ( ت ٦٧٦ هـ ). وغيرهما من المراجع والمصادر القديمة والحديثة التي تخدم هذا الجانب المهم من حقول العلم. ينظر للتفصيل: أدب المفتي والمستفتي: ١٣٤ - وما بعدها، وضوابط الفتوى في الشريعة الاسلامية: ١١٩ - وما بعدها، و ٢١١ - وما بعدها.

٥١. دەقی فەتواکە: پرسیار کرا: ئایا دروستە نوێژکردن لە پشت ئەوانەی باوەڕیان بەتەجسیم هەیە؟ وەڵام: ئەگەر وتمان کافرن وەک زۆرکەس وا دەڵێن ئەوان وەک کافرەکانی تر دروست نییە، ئەگەر وتمان کافر نین وەک ئەوەی لای زۆرێک پەسەندزانراوە و ئەوەش بۆچوونی منە هەروەک لەم کتێبەمدا ڕوونم کردووە ئەوا دروستە « الإعلام في بيان الإيمان والإسلام « فلا، لكنه يكره ). فتاوى فقهية: و: ١٠٠.

## كۆتایی:

لە کۆتایی ئەم توێژینەوەیەدا دەگەینە چەند دەرئەنجامێک، گرنگترینیان:

١. ئاشتی کۆمەڵایەتی بریتییە لە هەموو ئەو بناغە و بنەما و ئامراز و ڕێکارانەی کە پێویستن بۆ پتەوکردنی بەختەوەری و دڵنیایی سەرەتا بۆ تاک، پاشان بۆ خێزانەکان، لەوانیشەوە بۆ ئەو کۆمەڵگە و نیشتمانەی ئەم تاکە ئنتیمای بۆی هەیە و لە بوارە جۆراوجۆرەکانی ژیاندا کاریگەری هەیە لەسەر پێداویستییەکانی ژیانی ڕۆژانە و ئایندەی نزیک و دوور، ئەویش پێویستییەکی کۆمەڵایەتییە، پاشان داواکارییەکی نێودەوڵەتییە – بە چاوپۆشی لە ئایین، گەشەسەندنی فیکریی و تەکنەلۆژی، زانستە مرۆییەکان... هتد، لەهەمانکاتدا پابەندبوونێکی شەرعی و پێویستییەکە کە ژیان لەسەری دامەزراوە.

٢. کەناڵەکانی پەیوەندی ئاشتی کۆمەڵایەتی بە زانست و مەعریفە مرۆییەکان زۆرە، لەوانە زانستە ئیسلامییەکان کە دەقە شەرعییەکان و مەقاصیدەکانی کردووەتە بناغە بۆ دەستپێکردنی ئاڕاستە و لقەکانی، ئەمانەش دەکرێت دابەشبکرێن بەسەر بناغەکانی بیروباوەڕ و فیکر، ئەو زانستانەی کە خزمەت بە لایەنی پراکتیکی و کرداریی، زانستی دڵی و ڕۆحییەکان کە لایەنی شاراوەی مرۆڤ چالاک دەکەن و دەتوانرێت لەم فەرموودەوە وەربگیرێت: ئیمان و ئیسلام و ئیحسان.

٣. زانستی ئوصوڵی فیقهی ئیسلامی لە چەندین دەروازەدا پەیوەستە بە ئاشتی کۆمەڵایەتییەوە، چونکە ئەویش سەر بە زانستە شەرعییە یەکانە یەکەمجار، پاشان مەبەستی لێی سەلامەتی بیرکردنەوە و پتەوکردنی پەیوەندی نێوان دەقە شەرعییەکان و چۆنییەتی بیرکردنەوەی دروست لێیان بۆ دەرهێنان و تێگەیشتنی گوفتار و ڕەفتارە قبوڵکراوەکان لە قەدەغەکراوەکان، ئەمیش سەر بە زانستە مرۆییەکانە، کە بەهۆی دەقە دانراوەکانی عەقڵی مرۆڤەوە هاتووەتە ئارا و مەبەستی دەستخستنی چاکە و دوورکەوتنەوە لە خراپەیە، ئەو ڕێسایەی کە شەریعەتەکان لە دەوری دەسوڕێنەوە،

٤. لەو دەروازانەی دیکە کە پەیوەستن بە ئاشتی کۆمەڵایەتییەوە لە زانستی ئوصوڵی فیقهدا، دەروازەی بەڵگە و مەقاصید و حوکمی شەرعی، دەروازەی فەتوادان و دابەزاندنی دەقەکان بۆ سەر ئەرزی واقیعە لە دەرئەنجامی کارلێکی مرۆیی و بەدەمەوەچوونی لەگەڵ دەوروبەرەکەی و ئەوەی لە میشکیدایە لە پرسیار و




ئاراستەی ئەو کەسەی دەکات، کە لە سروشتی دەقەکان تێدەگات و مەنهەجێکی ڕاست دەگرێتە بەر بۆ مامەڵەکردن لەگەڵیدا و پێی دەوترێت موجتەهید، دەروازەی فرەیی و لەبەرچاوگرتنی بەدەمەوەچوونی واقیعی فیکری مرۆیی و شێوازی بیرکردنەوە لای، بەهۆی فراوانی واتابەخشینی دەقە دانراوەکانەوە کە خەسڵەتی بەردەوامیێتیان تێدایە لە سەردەمی وەحییەوە هەتا کۆتاییهاتنی ئەم دونیایە کە شوێنی هەوڵدان و ئەزموونکردنە.

٥. کۆمەڵگای کوردی بە سروشتی خۆی واناسراوە خۆشەویستی هەیە بۆ ئایین و پابەندە پێوەی، ئایینی پیرۆزی ئیسلام کاریگەری هەیە لەسەر بیرکردنەوە و کارەکانی ڕۆژانەی، ئاشتی کۆمەڵایەتیش کاریگەری ڕوونیان هەیە لەسەر بیرکردنەوەی زانا و شەرعزانەکانی، ئەمە وێڕای واقیعی فەتوادان لای زاناو موجتەهیدی کورد، کە -بەسروشتی مەدرەسە و مەنهەجی فێربوونی شەرعی- کە دوورە لە زیاد و کەمکردن و گونجاوە لەگەڵ ژیانی کۆمەڵایەتی و پێداویستییەکانیدا، بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندییەکانی و دوورکەوتنەوە لە خراپەکان.

٦. توێژینەوەکە نموونەی لە واقیعی کۆمەڵگەی کوردی هێناوە و لەڕێیانەوە ڕۆڵی ئاشتی کۆمەڵایەتی تێیدا و لە ئەحکامەکانیدا ڕووندەکاتەوە، ئەوانیش: پێشینەی خانووبەرە، حوکمەکانی دیاری حەج و عومرە، چەند ژنی، واقیعی مامەڵە لەگەڵ کەسی بەرانبەر کە هاوڕات نییە لەکاتی سەختی لەجەنگدا، حوکمی مارەکردنی ژن بەژن و مۆبایل لای ئافرەتان. هەوڵدراوە ئاشتی کۆمەڵایەتی لەڕێی: بیانووبەستن(سد الذرائع) و دابونەریتەوە بسەلمێندرێت، بە بەڵگە و زەڕوورەت و حاجەت لە مەقاصیدە شەرعییەکان، سنووردارکردنی ڕێگە پێدراوی حوکمی شەرعی، فەتوادان سەبارەت بە موجتەهیدەکان و فرەیی یاخود بەرانبەر لە فیکری ئوصوڵیدا، هەموو ئەوانە لەچوارچێوەی مەنهەجی پتەوکردنی ئاشتی کۆمەڵایەتی.

٧. توێژینەوەکە پێگەی ئاشتی کۆمەڵایەتی لەڕێی ئەو دەروازە ئوصوڵییانەوە لە کۆمەڵگەی کوردیدا سەلماندووە و گرنگی و پێویستی لەبەرچاوگرتنی لە بیرکردنەوەی ئیجتیهادیدا ڕوون کردووەتەوە، هەرئەویش پێوەرێکی گرنگە و دەکرێت لەڕێیەوە تێبگەیت لەوەی موجتەهید یان موفتی یان زانا هەبێت لە سەقامگیریی و هاوسەنگی لە بۆچوون و فەتوا و ئیجتیهاددا، ئەمە وێڕای ڕادەی پابەندبوونی بە بنەما بنەڕەتییەکانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام و مەقاصیدە بەرزەکانییەوە، بەمەبەستی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە و بەدیهێنانی مەبەستی دەقەکانی.

## سەرچاوەکان:

### - پاش قورئانی پیرۆز.

### أ. سەرچاوە عەرەبییەکان:

الإباحة في الشريعة الإسلامية: موفق منور سدايو، رسالة ماجستير غير منشورة مقدمة إلى كلية الشريعة والدراسات الإسلامية بجامعة الملك عبد العزيز ـ مكة المكرمة، ١٩٨٠.

الاجتهاد المقاصدي ـ حجيته، ضوابطه، مجالاته ـ: أ.د. نور الدين مختار الخادمي، ط ١، مكتبة الرشد، المملكة العربية السعودية، الرياض ٢٠٠٥.

أحكام الزواج والطلاق في الفقه الإسلامي المقارن ـ دراسة مقارنة بالقانون ـ: أ.د. مصطفى إبراهيم الزلمي، ط ٤، مطبعة رۆژهەلات ـ أربيل، ٢٠١١.

الإحكام في أصول الأحكام: أبو الحسن سيد الدين علي بن أبي علي بن محمد بن سالم الثعلبي الآمدي (ت ٦٣١هـ)، تحقيق: د. سيد الجميلي، ط١، دار الكتاب العربي، بيروت ـ لبنان، ١٤٠٤هـ

أحكام القرآن: القاضي محمد بن عبد الله أبو بكر بن العربي المعافري الاشبيلي المالكي ( ت٥٤٣ هـ)، راجع أصوله وخرج أحاديثه وعلق عليه: محمد عبد القادر عطا، ط ٣، دار الكتب العلمية، بيروت – لبنان، ١٤٢٤ هـ - ٢٠٠٣م.

إحياء علوم الدين: أبو حامد محمد بن محمد الغزالي الطوسي (ت ٥٠٥ هـ)، دار المعرفة – بيروت.

الآداب الشرعية والمنح المرعية: محمد بن مفلح بن محمد بن مفرج، أبو عبدالله، شمس الدين المقدسي الرامينى ثم الصالحي الحنبلي (ت ٧٦٣ هـ)، المحقق: شعيب الأرناؤوط وعمر القيام، ط ٣، مؤسسة الرسالة، بيروت ـ لبنان، ١٩٩٩.

آداب الفتوى والمفتي والمستفتي: أبو زكريا محيي الدين يحيى بن شرف النووي ( ت ٦٧٦ هـ)، المحقق: بسام عبد الوهاب الجابي ـ ط ١، دار الفكر – دمشق، ١٤٠٨ هـ

أدب المفتي والمستفتي: عثمان بن عبد الرحمن، أبو عمرو، ابن الصلاح الشهرزوري (ت ٦٤٣هـ)، المحقق: د. موفق عبد الله عبد القادر، ط ٢، مكتبة العلوم والحكم - المدينة المنورة ١٤٢٣هـ-٢٠٠٢م.

الأدلة عند الأصوليين ـ أنوعها، أقسامها، ترتيبها، عمومها ـ: عبد الرحمن بن عمر آل زعتري، من موقع بيت العلم، (www.riyadhalelm.com/play-١٤٧٠٧.html)، تأريخ الزيارة ٢٠١٨/٣/١٤.

الأدلة المختلف فيها عند الأصوليين: د.محمد السعيد علي عبد ربه، مطبعة السعاد- مصر١٩٨٢م.

إرشاد الفحول إلى تحقيق الحق من علم الأصول: محمد بن علي بن محمد الشوكاني ( ت ١٢٥٠ هـ )، تحقيق: أحمد عزو عناية، ط ١، دار الكتاب العربي، بيروت ـ لبنان، ١٩٩٩ م.
الاستدلال بسد الذرائع الضوابط وإشكالات التطبيق: أ.د. عياض السلمي، من موقع (www.fiqh.islammessage.com)، تاريخ الزيارة ٣/١٥ /٢٠١٨.
الاستقامة: تقي الدين أبو العباس أحمد بن عبد الحليم ابن تيمية الحراني الحنبلي الدمشقي (ت ٧٢٨ هـ)، المحقق: د. محمد رشاد سالم، ط ١، جامعة الإمام محمد بن سعود، المدينة المنورة، ١٤٠٣ هـ.
الأشباه والنظائر: عبد الرحمن بن أبي بكر، جلال الدين السيوطي ( ت٩١١ هـ)،ط ١، دار الكتب العلمية، بيروت ـ لبنان، ١٤١١هـ - ١٩٩٠م.
**الْأَشْبَاهُ وَالنَّظَائِرُ عَلَى مَذْهَبِ أَبِيْ حَنِيْفَةَ النُّعْمَانِ: زين الدين بن إبراهيم بن محمد، المعروف بابن نجيم المصري (ت ٩٧٠هـ)، وضع حواشيه وخرج أحاديثه: الشيخ زكريا عميرات، ط ١، دار الكتب العلمية، بيروت – لبنان، ١٤١٩ هـ - ١٩٩٩ م.**
أصول الفقه الإسلامي: أ.د. وهبة الزحيلي ( ت ١٤٣٧ هـ )، ط ١، دار إحسان ـ طهران، ١٩٩٧ م.
أصول في المعاملات المالية المعاصرة: أ.د. خالدبن عبد الله المصلح، من موقع الشيخ في النت ((www.almosleh.com/ar/index-ar-show-٤٩٦٧٧.html، تأريخ الزيارة ٢٠١٨/٣/١٥م.
إمارة سوران في عهد الباشا الكبير محمد كور باشا الراوندوزي: عوني الداوودي، منشور في مجلة: الحوار المتمدن، العدد: ٦٩٠ –( ٢٠٠٣ / ١٢ / ٢٢ )، من موقع الحوار المتمدن (www.ahewar.org/debat/show.art.asp?aid=١٢٨٤٦).
الإمام النورسي والتعامل الدعوي مع القوميات ـ دراسة تاريخية ـ: د. ليث سعود جاسم، دار سوزلر للنشر، القاهرة، ٢٠١١م.
الأمن الاجتماعي ضبط المصطلح وتأصيله الشرعي: د.عماد محمد رضا علي التميمي، د.إيمان محمد رضا علي التميمي، بحث مقدم إلى المؤتمر الدولي الذي تقيمه كلية الشريعة في جامعة آل البيت بعنوان: الأمن الاجتماعي في التصور الإسلامي، بتأريخ(١٣-١٤/ شعبان/١٤٣٣هـ ـ٣-٤/تموز/٢٠١٢).
البحر المحيط في أصول الفقه: أبو عبدالله بدرالدين محمد بن عبد الله بن بهادر الزركشي(ت ٧٩٤هـ)، ط ١، دار الكتبي، ١٤١٤هـ - ١٩٩٤م.
البيان في مذهب الإمام الشافعي: أبو الحسين يحيى بن أبي الخير بن سالم العمراني اليمني الشافعي (ت ٥٥٨ هـ )، المحقق: قاسم محمد النوري، ط ١، دار المنهاج – جدة، السعودية، ١٤٢١ هـ- ٢٠٠٠ م.

تشنيف المسامع بجمع الجوامع لتاج الدين السبكي (ت ٧٧١ هـ ): بدر الدين محمد بن بهادر بن عبد الله الزركشي ( ت ٧٩٤ هـ )، دراسة وتحقيق: د. عبد الله ربيع، ود.سيد عبد العزيز، ط ٢، مؤسسة قرطبة، القاهرة، ٢٠٠٦م.

التعريفات: علي بن محمد بن علي الزين الشريف الجرجاني (ت ٨١٦ هـ)، المحقق: ضبطه وصححه جماعة من العلماء بإشراف الناشر، ط ١، دار الكتب العلمية، بيروت –لبنان، ١٤٠٣هـ - ١٩٨٣م.

التقرير والتحبير: أبو عبد الله، شمس الدين محمد بن محمد بن محمد المعروف بابن أمير حاج ويقال له ابن الموقت الحنفي ( ت٨٧٩ هـ) ط ٢، دار الكتب العلمية، بيروت ـ لبنان، ١٤١٧هـ - ١٩٩٦م.

تقييد المباح: مصطفى مؤيد حميد السامرائي، أطروحة الدكتوراه غير منشورة مقدمة إلى الجامعة الإسلامية ـ بغداد، كلية الفقه وأصوله، ٢٠٠٦ م.

تقييد المباح ومدى الإلزام به في فقه الأحوال الشخصية ـ دراسة تأصيلية تطبيقية ـ: أحمد عبد الله أحمد أبو مزيريق، رسالة ماجستير غير منشورة مقدمة إلى جامعة اليرموك ـ الأردن، ٢٠١١ م.

تنبيه الأصدقاء في بيان التقليد والاجتهاد والاستفتاء والإفتاء: لابن الخياط القرداغي (ت ١٣٣٥هـ)، دراسة وتحقيق: د.أميد نجم الدين جميل المفتي،ط ١،دار لبنان للطباعة والنشر، بيروت ـ لبنان، ٢٠١٤م.

الجامع لمسائل أصول الفقه وتطبيقاتها على المذهب الراجح: عبد الكريم بن علي بن محمد النملة، ط ١، مكتبة الرشد – الرياض – المملكة العربية السعودية، ١٤٢٠ هـ - ٢٠٠٠ م.

جهود الشيخ عبد الكريم المدرس الفقهية: د.عبد الله ملا سعيد ملا ويسي كرتكي، ط ١، أربيل ٢٠١٢م.

حوار شخصي مع الأستاذ محمد الفرنجي تلميذ الأستاذ بديع الزمان سعيد النورسي، في نيودلهي ـ الهند، شباط ٢٠١٣م.

دورالتصوف في الأمن والسلام الاجتماعي: محمد الطاف، ود. أبوبكر، بحث محكم منشور في مجلة القسم العربي، جامعة بنجاب، لاهور ـ باكستان، العدد ٢٤، ٢٠١٧م.

دورعلماء الشريعة في ترسيخ السلم الإجتماعي: أ.م.د. كمال صادق ياسين، بحث مقدم إلى المؤتمر الدولي: مقومات السلم الاجتماعي ـ قراءة إسلامية في ضوء الواقع المعاصر ـ أربيل، ٢٠١٤م.

رجوع المفتي عن فتواه ـ مشروعيته، وأسبابه ـ وأثره ـ: د. جميل بن عبد المحسن بن حمد الخلف، بحث محكم منشور في مجلة البحوث والدراسات الشرعية. القاهرة، العدد ١٦، محرم ١٤٢٥هـ

الزجر في الفتوى في الشريعة الإسلامية: مريم محمد رمضان أبو جزر، رسالة ماجستير غير منشورة مقدمة إلى كلية الشريعة والقانون في الجامعة الإسلامية ـ غزة، ٢٠١٢ م.
سد الذرائع وتطبيقاته في المذهب الشافعي: حنان عبد الكريم القضاة، ومحمد خالد منصور، بحث منشور في مجلة: دراسات علوم الشريعة والقانون ـ الجامعة الأردنية، المجلد ٤٢، العدد ٢، ٢٠١٥م.
سير أعلام النبلاء: شمس الدين أبو عبد الله محمد بن أحمد بن عثمان بن قايماز الذهبي (ت ٧٤٨ هـ)، المحقق:الشيخ شعيب الأرناؤوط وجماعته، ط ٣، مؤسسة الرسالة، بيوت ـ لبنان ١٤٠٥ هـ ـ ١٩٨٥م.
شرح تنقيح الفصول: أبو العباس شهاب الدين أحمد بن إدريس بن عبد الرحمن المالكي الشهير بالقرافي (ت٦٨٤هـ)، المحقق: طه عبد الرؤوف سعد، ط ١، شركة الطباعة الفنية المتحدة ١٣٩٣ هـ - ١٩٧٣م.
شرح صحيح البخارى لابن بطال: ابن بطال أبو الحسن علي بن خلف بن عبد الملك ( ت ٤٤٩ هـ)، تحقيق: أبو تميم ياسر بن إبراهيم، ط ٢، مكتبة الرشد، الرياض ـ السعودية، ١٤٢٣هـ
شرح النووي على صحيح مسلم المسمى بالمنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج: أبو زكريا محيي الدين يحيى بن شرف النووي (ت٦٧٦هـ)، ط ٢، دار إحياء التراث العربي، بيروت ـ لبنان، ١٣٩٢هـ
الشعاعات: بديع الزمان سعيد النورسي ( ت ١٩٦٠ م)، ط ٤، دار سوزلر، مصر، ٢٠١٤.
صحيح البخاري المسمى بالجامع المسند الصحيح المختصر من أمور رسول الله صلى الله عليه وسلم وسننه وأيامه: محمد بن إسماعيل بن إبراهيم بن المغيرة البخاري، أبو عبد الله (ت ٢٥٦هـ)، ط ١، دار الشعب – القاهرة، ١٤٠٧ – ١٩٨٧م.
صحيح مسلم المسمى بالجامع المسند الصحيح المختصر بنقل العدل عن العدل إلى رسول الله صلى الله عليه وسلم: مسلم بن الحجاج أبو الحسن القشيري النيسابوري ( ت ٢٦١هـ)، المحقق: محمد فؤاد عبد الباقي، دار إحياء التراث العربي، بيروت ـ لبنان.
ضوابط الفتوى في الشريعة الإسلامية: محسن صالح ملا نبي صالح الدوسكي، ط ٢، مكتبة نزار مصطفى الباز، المملكة العربية السعودية ـ الرياض، ٢٠٠٧ م.
فتاوى فقهية: الشيخ عبد الرحمن بن الملا محمد ابن الخياط القرداغي (ت١٣٣٥هـ)، مخطوطة مصورتها موجودة عند الباحث، ونسختها الأصلية في مكتبة المخطوطات بمكتبة المجمع العلمي العراقي ـ بغداد، وتحت الرقم(١٦٤٥)، وقد تم شراؤها وإدخالها ضمن مخطوطات المكتبة بتأريخ ٢٠١٣/٧/٩م.
الفروق المسمى بـ أنوار البروق في أنواء الفروق: أبو العباس شهاب الدين أحمد بن إدريس

بن عبد الرحمن المالكي الشهير بالقرافي ( ت ٦٨٤هـ)، عالم الكتب، بيروت ـ لبنان.
قاعدة الاجتهاد لا ينقض بالاجتهاد وأثرها في الأحكام الشرعية: آيات إبراهيم الغلبان، رسالة ماجستير غير منشورة مقدمة إلى كلية الشريعة والقانون، بالجامعة الإسلامية ـ غزة ، ٢٠١٣ م.
قاعدة سد الذرائع وتطبيقات العمل بها في المعاملات المالية والمصرفية المعاصرة.. دراسة فقهية تأصيلية تطبيقية: د. علي القرداغي ، بحث ألقي في مؤتمر شورى الفقهي السادس، من قبل شركة شورى للاستشارات الشرعية، في ٣٠ محرم-١صفر ١٤٣٦هـ الموافق ١٦-١٧ نوفمبر ٢٠١٥م، بدولة الكويت. وعنوانه: تطبيقات العمل بقاعدة سد الذرائع وضوابطها الشرعية في المعاملات المالية المعاصرة « نظرة جديدة في التكييف الفقهي لأسهم شركات المساهمة وتطوير المشاركة المتناقصة »، من موقع منتدى العلماء: ((www.msf-online.com/?p=٥٨٥٠، تاريخ الزيارة ٢٠١٨/٣/١٥.
قضايا السلم الاجتماعي ومناهجه في القرآن الكريم: احميدة النيفر، موقع الملتقى الفكري للإبداع، ((www.almultaka.org/site.php?id=٩٨٠، تأريخ الزيارة: ٢٠١٨/٣/١٠.
قواعد التصوف: للشيخ أبي العباس أحمد بن أحمد بن محمد بن عيسى الزروقي الفاسي (ت ٨٩٩ هـ )، تقديم وتحقيق: عبد المجيد خيالي، ط ٢، دار الكتب العلمية، بيروت ـ لبنان، ٢٠٠٥.
قواعد وأصول إسلامية في ترسيخ السلم الاجتماعي: أ.م.د.رزكار سليمان مولود، بحث مقدم إلى المؤتمر الدولي المنعقد من قبل كلية العلوم الإسلامية بجامعة صلاح الدين ـ أربيل، بتأريخ ١ ـ ٣ / ٤ / ٢٠١٤، وعنوان المؤتمرهو: مقومات السلم الاجتماعي ـ قراءة إسلامية في ضوء الواقع المعاصر.
الكلمات: بديع الزمان سعيد النورسي (ت ١٩٦٠ م)، ط ٤، دار سوزلر، مصر ٢٠١٤.
لسان العرب: لابن منظور، محمد بن مكرم بن منظور الإفريقي المصري ( ت ٧٧١ هـ )، ط ١، دار صادر، بيروت.
اللمعات: بديع الزمان سعيد النورسي ( ت ١٩٦٠ م )، ط ٤، دار سوزلر، مصر، ٢٠١٤.
مؤسسة الإباحة في الشريعة الإسلامية: عبد السلام التونجي، كلية الدعوة الإسلامية، ليبيا، ١٩٩٣ م.
مجلة مجمع الفقه الإسلامي التابع لمنظمة المؤتمر الإسلامي بجدة:تصدر عن منظمة المؤتمر الاسلامي بجدة، موجود في برنامج المكتبة الشاملة، الإصدار ٣,٦٤، ضمن قسم: الجوامع والمجلات ونحوها.
المجموع شرح المهذب ((مع تكملة السبكي والمطيعي)): أبو زكريا محيي الدين يحيى بن شرف النووي ( ت ٦٧٦هـ)، دار الفكر، بيروت ـ لبنان.
مجموع الفتاوى: تقي الدين أبو العباس أحمد بن عبد الحليم بن تيمية الحراني ( ت ٧٢٨

هـ )، تحقيق: عبد الرحمن بن محمد بن قاسم، نشره مجمع الملك فهد، المدينة المنورة ـ السعودية، ١٩٩٥م.
المحصول: أبو عبد الله محمد بن عمر بن الحسن بن الحسين التيمي الرازي الملقب بفخر الدين الرازي خطيب الري ( ت ٦٠٦هـ)، دراسة وتحقيق: الدكتور طه جابر فياض العلواني، ط ٣، مؤسسة الرسالة ١٤١٨ هـ – ١٩٩٧م.
المحلى بالآثار: أبو محمد علي بن أحمد بن سعيد بن حزم الأندلسي القرطبي الظاهري ( ت٤٥٦ هـ)، دار الفكر، بيروت ـ لبنان.
المرأة في الفكر الإسلامي: د.جمال محمد فقي رسول الباجوري ( باجلاني )، ط ١، مديرية دار الكتب للطباعة والنشر، جامعة الموصل، ١٩٨٦ م.
مرتكزات السلام الاجتماعي في القرآن الكريم: إسماعيل آدم عبد الرحمن آدم، أطروحة الدكتوراه غير منشورة مقدمة إلى كلية الآداب، قسم الدراسات الإسلامية بجامعة الخرطوم، ٢٠٠٨ م.
المسائل المالية المختلف فيها ودور المقاصد الشرعية في الترجيح بشأنها: هيمن باقي خضر، رسالة ماجستير غير منشورة مقدمة إلى كلية الشريعة والقانون / جامعة إفريقيا العالمية، ١٤٣٦ ـ ٢٠١٥م.
المستصفى: أبو حامد محمد بن محمد الغزالي الطوسي ( ت ٥٠٥ هـ)، تحقيق: د. محمد سليمان الأشقر، ط١، مؤسسة الرسالة، بيروت ـ لبنان، ١٩٩٧م.
المُعَامَلاتُ المَالِيَّةُ أَصَالَة وَمُعَاصَرَة: أبو عمر دُبْيَانِ بن محمد الدُّبْيَانِ، ط ٢، مكتبة الملك فهد الوطنية، الرياض – المملكة العربية السعودية ١٤٣٢ هـ.
المعجم الجامع للتعريفات الأصولية: د.زياد محمد احميدان، ط ١، مؤسسة الرسالة ناشرون، بيروت ـ لبنان، ٢٠٠٦م.
المغني: أبو محمد موفق الدين عبد الله بن أحمد بن محمد بن قدامة الجماعيلي المقدسي الدمشقي الحنبلي، الشهير بابن قدامة المقدسي ( ت ٦٢٠ هـ)، مكتبة القاهرة، ١٣٨٨هـ – ١٩٦٨م.
مقومات السلم الاجتماعي في الإسلام: أ.د. محمد خليل جيجك، بحث مقدم إلى المؤتمر الدولي المنعقد من قبل كلية العلوم الإسلامية بجامعة صلاح الدين ـ أربيل، بتأريخ ١ ـ ٣ / ٤ / ٢٠١٤، وعنوان المؤتمرهو: مقومات السلم الاجتماعي ـ قراءة إسلامية في ضوء الواقع المعاصر ـ
الموافقات: إبراهيم بن موسى بن محمد اللخمي الغرناطي الشهير بالشاطبي ( ت ٧٩٠هـ)، المحقق: أبو عبيدة مشهور بن حسن آل سلمان، ط ١، دار ابن عفان، ١٤١٧هـ ـ ١٩٩٧م.




مُوْسُوعَة القَواعِدُ الفِقْهِيَّة: محمد صدقي بن أحمد بن محمد آل بورنو أبو الحارث الغزي، ط ١، مؤسسة الرسالة، بيروت – لبنان، ١٤٢٤ هـ – ٢٠٠٣م.
موسوعة كشاف اصطلاحات الفنون والعلوم: محمد بن علي ابن القاضي محمد حامد بن محمد صابر الفاروقي الحنفي التهانوي (المتوفى: بعد ١١٥٨هـ)، تقديم وإشراف ومراجعة: د. رفيق العجم، تحقيق: د. علي دحروج، نقل النص الفارسي إلى العربية: د.عبدالله الخالدي، الترجمة الأجنبية: د.جورج زيناني، ط ١، مكتبة لبنان ناشرون – بيروت ١٩٩٦م.
موقف الفقه الإسلامي من التعديلات التي أجريت على قانون الأحوال الشخصية في إقليم كردستان العراق ـ دراسة مقارنة ـ: د. سعد الدين ملا عبد الله البلبيتاني، أطروحة الدكتوراه غير منشورة مقدمة إلى كلية العلوم الإسلامية بجامعة صلاح الدين ـ أربيل، ٢٠١١ م.
نشر العرف في بناء بعض الأحكام على العرف ـ مطبوع ضمن الجزء الثاني من مجموعة رسائل ابن عابدين ـ: ابن عابدين، محمد أمين بن عمر بن عبد العزيز عابدين الدمشقي الحنفي ( ت ١٢٥٢هـ)، دار إحياء التراث العربي، بيروت ـ لبنان.
نظرية العرف في المذاهب الإسلامية وإمكانيات التجديد: أ. د. نورالدين مختار الخادمي، بحث مقدم بندوة تطور العلوم الفقهية «فقه العصر: مناهج التجديد الديني والفقهي» التي تنظمها وزارة الأوقاف والشؤون الدينية بسلطنة عمان خلال ٥-٨ أفريل ٢٠١٥م.
نور الصباح في فقه تقييد المباح: أحمد خالد الطحان، شبكة الألوكة (( www.alukah.net.

**ب.سەرچاوە کوردییەکان:**

بۆ وایگووت «ڕوونکردنەوەیەک دەربارەی مەلای خەتێ«( لم قال هذا ؟ « توضيح حول الملا خطي»): مەلا محەمەدی وەرتێ، گۆڤاری (دەنگی زانا) (صوت العالم) الكوردية، والتي تصدر عن إتحاد علماء المسلمين في كوردستان ـ أربيل، العدد ٣٨، رمضان ١٩٩٩ م.
ڕۆڵی لێژنەی فەتوا لە کوردستاندا ـ بڕیار و وەڵامە شەرعییەکانی لێژنەی باڵای فەتوا ـ (دور لجنة الفتوى في كوردستان ـ المقررات والأجوبة الشرعية للجنة العليا للإفتاء ـ): مەلا محەمەد مەلا ئیسماعیل ئێنەیی، چ١، هەولێر ٢٠١٧ ز.
شەریعەتی ئیسلام بەپێی پەیڕەوی ئیمامی شافیعی «خوا لێی رازی بێت» مەلا عبدالكريمی مدرس، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر ٢٠٠٩ م.
فەتواکەی مەلای خەتێ ئەفسانەی مێژوونوسێک ( فتوى الملا الخطي أسطورة مؤرخ ): حەسەن محمود حمە کریم، چاپی یەکەم، سلێمانی ٢٠٠٦.

## پێشەکی:

خێزان یەکێکە لە گرنگترین دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگە، هەر لە سەرەتای ژیانی مرۆڤایەتییەوە بوونی هەبووە، سەرچاوەی پێگەیاندن و ژیان و ئاسوودەیی مرۆڤەکان بووە، هیچ کۆمەڵگە و شارستانیەتییەک بەبێ خێزان نەبووە، بەجۆرێک سەرجەم پێداویستییە (دەروونی، کۆمەڵایەتی، پەروەردەیی، بایۆلۆژی، هێمنی، سۆزداری ... هتد) مرۆڤ لەم دامەزراوەیەدا دابینکراوە. لەگەڵ ئەوەی بەپێی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیا و ژیانی کۆمەڵگەکان کۆمەڵێک دامەزراوە بوونەتە یارمەتیدەری خێزان و هەندێک ئەرکیان لەسەری کەمکردووەتەوە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ئەرکە سەرەکییەکە هەر لە چوارچێوەی خێزاندا نەچووەتە دەرەوە و نەتوانراوە ئەو ژینگە سروشتییە جێگرەوەی بۆ دروست ببێت، لەبەرئەوە جێگیریی و ئاسایشی خێزان وەکو چەمک و ڕەهەندێکی بەڵگەنەویست بۆ ئاسایشی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگە هەژمار دەکرێت.

هەردوو بیری سۆسیالیستی و سەرمایەداری کە خاوەن دەسەڵاتدارە زلهێزەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بانگەشەیان بۆ دەکرد و بنەماکانیان جێبەجێ دەکرد، بەتایبەتی لە سەدەی (٢٠) زیانێکی گەورەیان بە ئاسایشی خێزانیی گەیاند، لەڕێی (بانگەشەکردن بۆ سەندیکاکانی ژنان و بەگژداکردنەوەیان لەگەڵ پیاوان، پیادەکردنی بیری ململانێی لە سەرجەم کایەکانی ژیاندا، هێنانەناوەوەی بیری مادیگەرایی، کەسایەتی سەربەخۆ بۆ هەریەک لە پیاو و ئافرەت و منداڵەکان، بەرزکردنەوەی ئاستی پێویستی و گوزەران، سنوربەندکردنی خێزان بەشێوەیەکی ڕەها بە دەقە یاساییەکان، قورسکردنی پرۆسەی هاوسەرگیریی کردنی فەرمی، بانگەشەکردن بۆ دواخستنی پرۆسەی هاوسەرگیریی بۆ دوای تەمەنی (٣٠)ساڵی، و چەندین کاری تر) کە ئاسانکاری کرد بۆ پەراوێز خستنی ڕۆڵی خێزان لە کایەکانی ژیاندا.

ئەوەی جێگەی سەرنجە، وڵاتانی ڕۆژئاوا بە حوکمی ئەوەی خاڵی بەهێزیان هەیە لە بواری (تەکنۆلۆژیا، ئابووری) بەوهۆیەشەوە توانیویانە لایەنی (ڕامیاری، سەربازی) خۆیان بەهێز بکەن و دەستیش بگرن بەسەر ئیرادە و بیری گەلانی تریشدا، لەگەڵ ئەوەی ئاسایشی خێزانیان بەتەواوی لە مەترسیدایە، بەڵام لە ئێستادا زۆر پێیانەوە دیار نیە، لەبەرئەوەی بەلایەنی ماددی کۆمەڵێک دامەزراوە

و خزمەتگوزارییان بەردەست کردووە تاڕادەیەکی کەم توانیویانە هەندێک لە ئەنجامە خراپ و زەرەر و زیانەکانی بۆماوەیەکی کاتی پەردەپۆش بکەن، بەڵام لە وڵاتانی وەکو ئێمەدا کە ئەو خاڵە بەهێزانەمان نیە، ئەگەر ئاسایشی خێزانیمان بکەوێتە مەترسییەوە، ئەوا دەرهاویشتەکانی زۆر جەرگبڕ دەبێت.

لەڕێی ئەم نووسینەوە هەوڵ دەدەین لە (٣) بواردا کە خێزان ڕۆڵی سەرەکی تیایاندا هەیە، پاراستنی ئاسایشی خێزانیی بخەینە بەر دیدی خوێنەران، کە بریتین لە:

## یەکەم: لایەنی دەروونی: پێکدێت لە

### ١- تەندروستی دەروونی ئەندامان:

دەروونێکی هێمن و ئاسوودە لە نیشانەکانی کەسێتی هاوسەنگە، تاک لەناو خێزانێکی تەواو و سروشتیدا بەتەواوەتی پێویستی و خۆراکی دەروونی وەردەگرێت و ئامادەش دەکرێت بۆئەوەی بتوانێت بەر لە کۆسپ و ناخۆشییەکان بگرێت و ببێتە خاوەنی جیهانێکی ئاوەدان لە ناخی خۆیدا، ئەوەش لە ڕێگای چەند کردار و چالاکییەکەوە کە خێزان پێی هەڵدەستێت وەک (بوونی کات بۆ کۆبوونەوە و بەیەکەوەبوونی ئەندامانی خێزان بەیەکەوە، بوونی پەیوەندی ڕاستەخۆ و بەردەوام، پاڵپشتی ئەندامان لە کاتی پێویستی و ناخۆشیەکاندا، ڕێز و پێزانین، بەرزکردنەوەی هۆشیاریی و شارەزابوون لە ڕووداو و شێوازی هەڵسوکەوت لەگەڵیدا، بارودۆخ و کەشێکی گەشبینانە)، بەو شێوازە کەسەکان بەهێز دەبن و دەتوانن لە قۆناغەکانی تردا بە سەرکەوتوویی گوزەر بکەن.

### ٢- دەریای سۆزداری:

ئەندامانی خێزان بەبێ جیاوازی پێویستییان بە خۆشەویستی هەیە زیاتر لە نان و ئاو و خۆراک، هەروەک خوای گەورە لە وەسفی نیعمەتەکانی بەسەر بەندەکانییەوە دەفەرموێت: (وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ) (١)، واتا یەکێک لە بەڵگە و نیشانەکانی پەروەردگارتان «کە وەکو ناز و نیعمەتێک بەسەر بەندەکانییەوە

---

١ - سورة الروم، الآية (٢١).

باسی دەکات» بریتییە لەوەی کە لە نەفسی خۆتان هاوسەرەکانی بۆ خولْقاندوون بۆئەوەی لایان هێمن ببنەوە و لە نێوانتاندا هۆگریی و بەزەیی دروستکردووە، ئەمە بەڵگەیەکە بۆ خاوەن بیرەکان)، هەروەها پێغەمبەری خوا (د.خ) دەفەرمووێت: (لیس منا من لم یرحم صغیرنا ویوقر کبیرنا)، واتا لە ئێمە نیە ئەوەی سۆز و بەزەیی نەبێت بەرامبەر بە بچووکەکان و ڕێز لە گەورەکانمان نەگرێت، بەتایبەتی لەناو خێزاندا ئەندامان پێویستە ئەو پیویستەیە وەربگرن بۆ ئەوەی لەڕووی دەروونییەوە کەسێکی تەندروست دەربچێت.

**٣- دابینکردنی ڕێز و ستایش:**

بۆچوونێکی باو هەیە، کە بریتییە لەوەی ڕێز بۆ کەسانی دەرەوەی خێزانە، لەڕاستیدا هەستکردن بەوەی کەسەکان بەهایان هەیە بە پلەی یەکەم پێویستە لە خێزانەوە دەستپێبکەوێت، لەبەرئەوەی خێزان چۆن ئەندامەکانی پێشکەش بە کۆمەڵگە بکات، کۆمەڵگەش بەوشێوەیە دەیناسێت، وشە و کرداری دایک و باوک شێوازی گفتوگۆ و هەڵسوکەوت و ڕەفتاری دایبابان دەبێتە بەردی بناغەی کەسێتی منداڵەکان لە داهاتوودا، ئەو پیاوەی بەڕێزە لای خەڵک و هەست بە بوونی خۆیَ دەکات ئەو کەسەیە کە لەخێزانیکی هاوسەنگ و بەڕێزەوە هاتووە، هەروەها ئەو ئافرەتەی توانای ئەوەی هەیە لەگەڵ تەنگ و چەڵەمەکان کاردانەوەی تەندروستی هەبێت و بەڕێزەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەی بکات، ئەو کەسەیە پەروەردەیەکی هاوسەنگ و تەندروست کراوە.

> **خێزان چۆن ئەندامەکانی پێشکەش بە کۆمەڵگە بکات، کۆمەڵگەش بەوشێوەیە دەیناسێت، وشە و کرداری دایک و باوک شێوازی گفتوگۆ و هەڵسوکەوت و ڕەفتاری دایبابان دەبێتە بەردی بناغەی کەسێتی منداڵەکان لە داهاتوودا**




ئەوەی گرنگە لەم بوارەدا ئەوەیە ئەندامانی خێزان بەدڵێکی ساف و بێگەرد تەماشای یەکتر بکەن، ڕەفتار و هەڵسوکەوتەکان بە ڕووە چاک و گەشبینەکەیەوە ببینن، بەوشێوەیە هەست بە ناخۆشی شکاندن و شەرمەزاری ناکەن، لە وڵاتی جەزائیر دابونەریتێکیان هەیە، لەکاتی بەیەکگەیشتنی بوک و زاوا هەریەکەیان دیارییەک پێشکەش بە هاوسەرەکەی دەکات، کە بریتییە لەوەی کورەکە دەڵێت (کەرامەتم دیارییە بۆ تۆ)، کچەکەش دەڵێت: قبوڵم کرد، بەهەمان شێوە کچەکەش هەمان کار دەکات. لێرەدا هاوسەرەکان بۆچی ئەمە دەکەن؟ دیارە مەبەستیان دوو شتە، یەکەمیان کەرامەت زۆر بەنرخە لەبەرئەوە وەک دیاری پێشکەشی خۆشەویستەکەی دەکات، دووەم بریتییە لەوەی دیارییەکی لەو شێوەیە ئەو هەستیارییە لەنێوانیاندا ناهێڵێت کە زۆرێک لە هاوسەران لەسەری جیادەبنەوە و پێیانوایە سوکایەتییان پێکراوە، لەبەرئەوە پێویستە هاوسەران ئەوەندە لەیەک نزیک بن سەرووی ڕێز و ستایش بکەون، بەجۆرێک بێڕێزی کردن لە فەرهەنگی ژیانیاندا نەمێنێت.

### ٤- هەڵسوکەوتی شیاو لەگەڵ هەڵچوون و ناخۆشییەکان:

کورد گوتەنی لە کاتی شەڕدا بەشی ئاشتی تێدا بهێڵنەوە، هەموو خێزانێک بە قۆناغی هەوراز و نشێودا تێدەپەڕێت وەک (خۆشی، ناخۆشی، گرفت، نەخۆشی، نەبوونی، لێکتێنەگەیشتن، تورەبوون، خەفەت، دووری، نزیکی، بێکاری ... هتد)، بەڵام هێزی خۆشەویستی بەهێز و ڕەوشتی بەرز و پەروەردەی تەندروست لە توانایدا هەیە بەرگەی هەموو ئەو ڕەشەبایانە بگریت و نەلەنگێت، بەڵام ئەگەر لەکاتێک لە کاتەکاندا کەسی بەرامبەر هاوسەر بێت یان منداڵ وەکو پێویست نەبوو ئەوا ئەو حاڵەتەی وەکو نەخۆشی و نەخۆش تەماشا دەکرێت، نەخۆش لەکاتی نەخۆشیدا قسەی لێ ناگیرێت، نازی هەڵدەگیرێت، زیاتر گرنگی پێ دەدرێت، هەرچی بڵێت بەقسەی دەکرێت، ئەندامانی خێزان لە دەوری کۆدەبنەوە ئەگەر بیەوێت، ئەگەر نەیویست دەوری بێدەنگ دەکرێت بۆ ئەوەی پشوو بدات و ئاسوودە بێت، دوای چاکبوونەوەش ڕەفتارە نەشیاوەکانی بەچاویدا نادرێتەوە.

### ٥- گەشەپێدان بە گەشەی عەقڵی:

دەروونددروستی کەسەکان لەناو خێزاندا ژینگەیەکی نموونەییە بۆ گەشەی عەقڵی ئەندامەکانی، لەبەرئەوەی سیستمە ناوەکییەکانی مرۆڤ وابەستەی یەکترین کە بریتین لە لایەنەکانی (لۆژیکی-عەقڵ، سۆزداری-دەروون، تەندروستی-جەستە)، هەرکاتێک یەکێکیان کێشەی بۆ دروستبوو کاریگەری نەرێنی دەکاتە سەر لایەنەکانی تر، هەروەها کاتێک هەموویان لە شوێنی خۆیان بە ڕێکوپێکی دەچوون بەڕێوە دەبێتە هۆی گەشەی هەموویان، واتا لاشەی تەندروست و دوور لە نەخۆشی پاڵپشتی دەکات لە گەشەی عەقڵ و دەروونێکی ئاسوودە، دەروونێکی ئاسوودە و خۆش هۆکاری سەرەکی تەندروستی جەستە و عەقڵێکە کە بەڕێکوپێکی گەشە دەکات و بیر دەکاتەوە، بەواتای ئەوەی کاتێک کەشێکی دەروونی گونجاو لەناو خێزاندا هەبوو گەشەی بیر و عەقڵی ئەندامەکان تەندروست دەبن و ڕاست و باش و جوان بیردەکەنەوە، ڕاست و جوان و باش بڕیار دەدەن، ژیانیان ڕاست و باش و جوان بەڕێوەدەچێت.

### ٦- هاوسەنگی لە نێوان متمانە بەخۆبوون و پیرۆزی خێزان:

دایک و باوکی بەهێز منداڵە کۆرپە لاوازەکەی دەپارێزێت، تەواوی هێزەکەی لەپێناوی پاراستنی کۆرپەی بەکاردەهێنێت، کاتێکیش لاواز دەبن و منداڵەکانیان بەهێز دەبن، تەواوی توانایان بەکاردەخەن بۆ پاراستنی دایک و باوکیان، ئەمە نموونەی خێزانی تەندروستە، بەڵام گرنگە لەو ناوەندەشدا ئەو هەستە بەوشێوەیە بمێنێتەوە.

خێزان ناوەندی پێگەیاندنی دەروون و ناخە، بۆئەوەی کەسێکی (دەروونددروست، هێمن، ئاسوودە، خاوەن متمانە، بەهێز، خاوەنی بیر و بۆچوون) دروستبکات، ئەم کەسە بەهێزە پێویستە بەهێزییەکەی بۆ خزمەتی خۆیی و خێزانەکەی بەکاربهێنێت، نەک بەهێزییەکەی لەکاتی ناخۆشیی و ناکۆکی لە بەرامبەر هاوسەر یان دایک و باوک بخاتە گەڕ، چۆن دەتوانین ئەو کارە ئەنجامبدەین؟ لێرەدا نموونەیەک دەهێنینەوە، شۆفێری کارامەی بە ئەزموون لەکاتی پێشهاتەکانی ڕێگاوباندا زۆر بەئاسانی خۆی و ئۆتۆمبێل و سەرنشینەکانی ڕزگار دەکات، بە خێرایی و بەبێ بیرکردنەوە دەتوانێت ئاڕاستەی شیاو هەڵبژێرێت، هۆکاری ئەو سەرکەوتنەش دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆکار، یەکەمیان ئەوەیە کە پێشتر خۆی پەروەردە کردووە،

ئەزموونی زۆری کۆکردووەتەوە، دووەمیان بریتییە لەوەی زۆر مەبەستییەتی بە سەلامەتی و بێ کێشە لەو بارودۆخە دەربچێت، لەبەرئەوە سەلامەتی سەرنشینەکانی بە ئەرکی سەرەکی خۆی دەزانێت، واتا هەموو شۆفێرێک پاراستنی سەلامەتی سەرنشینەکانی لەکاتی گەشتکردندا لە هەموو شتێکی پێ گرنگترە، ئەم بەهایە لەناخی هەموو شوفێرێکدا چەسپاوە و بە پیرۆز تەماشای دەکەن.

ئێمەش کەسی بەهێزمان دەوێت لە خێزاندا، کە ئامادەکرابێت بۆئەوەی ئەرک و پەیامی پاراستنی دەروونی و جەستەیی و کۆمەڵایەتی پەروەردەیی ئەندامانی خێزانەکەی وەکو پەیامی گەورەی خۆی تەماشا بکات، واتا خێزانی لە لا پیرۆز بێت، بەهای باڵا بێت و بە هیچ شتێک نەیگۆڕێتەوە و بۆ ساتێکیش بیرنەکاتەوە هێز و تواناکەی لە دژیان بەکاری بهێنێت، بەڵکو هەمووی بخاتە خزمەت پاراستنی خێزانەکەیەوە.

### ٧- لایەنگیریی بۆ خێزان:

سەرەتا هەردوو هاوسەر هەریەکەیان لایەنگیرییان هەیە بۆ خێزانەکەیان واتا ماڵی (دایک و باوک)ی خۆیان، هەر ئەوەندەی گرێبەستی هاوسەرگیریی دەبەستن وردە وردە کار بۆ ئەوە دەکەن لایەنگیرییان بۆ ئەم خێزانە دروست ببێت کە خۆیان دەیانەوێت دروستیبکەن، خوای گەورە (المودة والرحمة) یان بە دیاری بۆ دەنێرێت، پاشان هەردوولایان ئامادەییان دەبێت هەنگاو بەرەو لای یەکتری بنێن، ئەگەر دوو کەسەکە پێشتر ئامادە و پەروەردە کراوبن لە ماڵی (دایک و باوکیاندا) لەڕووی پەروەردەی (ئایین، ڕەوشت، دەروونی و عەقڵیی و بەهای پیرۆزیی خێزان)، هەردووکیان یان لانیکەم یەکێکیان، ئەوە کەشتی خێزانیی بە هێمنی لەنگەر دەگرێت و هەردوو کەسەکە لایەنگیرییان بۆ خێزانە نوێیەکەیان دروست دەبێت، بەهەمان شێوەش ئەو دایک و باوکە کاتێک توانیان ئەو کەشی خێزانییە بڕەخسێنن لەڕووی پەروەردەی تەندروستی (ئاین، ڕەوشت، دەروونی و عەقڵی و بەهای پیرۆزیی خێزان)، ئەوا منداڵەکانیش هەمان لایەنگیرییان بۆ دروست دەبێت و بە هەموو توانایانەوە هەوڵی جوانکردن و پاراستنی دەدەن و قوربانی تەواوی بۆ دەدەن.

پرسیارێک دێتە پێشەوە، ئایا دەکرێت یەکێک لە هاوسەران لەڕووی پەروەردەی (ئایین، ڕەوشت، دەروونی و عەقڵی و بەهای پیرۆزیی خێزان) ئاستێکی باشی

هەبووبێت، بەڵام ئەوەی تریان وەک پێویست نەبێت دەتوانن خێزانێکی بەختەوەر دروستبکەن؟ بەڵێ مەل بە باڵێک نافڕێت، بەڵام خێزان بە بوونی ژن یان پیاوێکی باش دەتوانێت بفڕێت و ببێتە هۆی ڕاستکردنەوە و ڕێککردنەوەی ئەوەی تریان، پاشان منداڵەکانیش بە هەمان ڕێچکەدا بڕۆن، لەبەرئەوەی کەسی باش وەکو هەوێن وایە کارەکان دەمەیەنێت و دەوروبەرەکەی بەرەو خۆی ڕادەکێشێت و خراپەکان چاک دەکاتەوە و ناشرینەکان جوان دەکات، ئەمە نهێنی خێزانی بەختەوەرە کە خوای گەورە هەمیشە ڕێگەی پاراستنی خێزانەکانی بە سەلامەتی هێشتووەتەوە، کە تاکە کەسێک خێزانێک ڕاست و بەختەوەر دەکات.

## دووەم/ لایەنی کۆمەڵایەتی: پێکدێت لە

### ١- پەیوەندی ڕاستەوخۆ و بەردەوام لە نێوان ئەندامانی خێزان:

بوونی پەیوەندی ڕاستەوخۆ لە نێوان سەرجەم ئەندامانی خێزاندا هۆکارێکە بۆ دروستبوونی هۆگری و خۆشەویستی و ئاسوودەیی، ئەم پەیوەندییە پێویستە ڕۆژانە و ڕاستەوخۆ بێت، بە جۆرێک هەریەکێک لە ئەندامانی خێزان باوک، دایک، برا، خوشک، بێت هەریەکەیان بەجیا (نهێنییەک، کارێک، پێویستییەک، شتێکی تایبەتی) لەگەڵ هەریەک لەوانەی تر بە جیا هەبێت، هەتا ئەو کاتەی لە یەک ماڵدا دەژین و هێشتا کوڕ و کچەکان ماڵی خۆیان دروست نەکردووە، لەبەرئەوەی بەوشێوەیە ئەندامی خێزان هەست بەوە دەکەن کۆمەڵێک کەسی دڵسۆز و ئەمین لە دەوروبەری هەیە، کە دەتوانێت متمانەی تەواویان پێ بکات لە کاتی پێویستیدا.

هەستی کۆمەڵایەتی بوون هەستێکی سروشتییە، هەر لەسەرەتای تەمەنەوە منداڵ کاتێک بە تەنیا دەبێت دەگری و داوا دەکات کە کەسانێک لە دەوری بن، هەتا گەورە دەبێت پێویستی بە زیادبوونی کوالیتی ئەو پەیوەندییە هەیە، پێویستی بە قوڵبوونەوە هەیە، خێزان و پەیوەندییەکانی وەکو بنکەی فڕۆکەکان وایە، هەر کات فڕین دوای ماندووبوون دەتوانن بۆی بگەڕێنەوە، لەکاتی کێشە و گرفتەکان پشتی پێ ببەستن، لە کاتی نەبوونی و نەخۆشی هانای بۆ ببەن، هەستێکی خۆش هەست بکەیت کە بە خێزانەکەت پشتت قایمە، ئەو هەستە خێزانەکان بەهێز دەکات و بوون و ئاسایشیان دەپارێزێت.

### ٢- پەیوەندی ڕاستەوخۆ و بەردەوام لەگەڵ خزمە دوو سێیەکان:

خزمە پلە یەکەکان بریتین لەوانەی ڕاستەوخۆ بە کەسەکەوە بەستراون وەک (دایک، باوک، برا، خوشک، هاوسەر، کوڕ و کچ)، ئەوەیان لە بڕگەی پێشتردا تاوتوێ کرا، خزمە پلە دووەکان بریتین لەوانەی بەهۆی یەکێک لە پلە یەکەکانەوە بە ئێمەوە بەستراون وەک (نەنک و باپیر، کوڕەزا و کچە زا، بوک و زاوا، مام و خاڵ و پور)، پلە سێیەکان ئەوانەن لەڕێی پلە دووەکانەوە پێمان دەگەن.

سەبارەت بە کەسانی پلە دوو، گرنگە لە نێوان هەفتەیەک تا مانگێک جارێک ئەو پەیوەندییە بگەیەنرێت، پەیوەندییەکە لانیکەم نیمچە بەردەوام و ڕاستەوخۆ بێت، بەڵام لەگەڵ پلە سێیەکان لە نێوان شەش مانگ تا ساڵێک لانیکەم بە ناڕاستەوخۆیی و ناوبەناو بگەیەنرێت، لە حاڵەتی دووری و نەتوانیندا لە ڕێی هۆکارەکانی پەیوەندییەوە خزمەکان بەسەر بکرێنەوە، ئەمە بریتییە لە خشتەی کارکردن لەسەر پەیوەندییەکان و بە پلەی جیاواز ئەم فەرموودەیە دەیانگرێتەوە کە دەفەرموێت: مَن كانَ يُؤْمِنُ باللهِ واليَومِ الآخِرِ فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ (٢)، واتا هەرکەس بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە بە پەیوەندییەکانی بگەیەنێت، ئەم فەموودەیە و دەقەکانی تریش کە باس لە گرنگی پەیوەندییەکان دەکاتەوە و بە ئیمان و دینداریەوە گرێیان دەدات، ئەوەش گرنگی پەیوەندییەکان دەردەخات کە سروشت و فیترەی مرۆڤ لەسەر ئەو گەیاندنە ئاو دەخواتەوە و هاوسەنگی خۆی دەپارێزێت.

### ٣- پەیوەندی ڕاستەوخۆ و بەردەوام لەگەڵ هاوڕێیان:

لە پەیوەندییەکاندا هەرکەس تامی خۆی دەدات، یەکێک لەوانە باس لە گرنگی بوونی هاوڕێیە، جا ئەو هاوڕێیە لە شوێنی کار و خوێندن بێت، یان لە شوێنی نیشتەجێبوون و مزگەوت بێت، گرنگە خۆمان هاوڕێمان هەبێت و هانی منداڵەکانیش بدەین هاوڕێی باش بگرن یان باشیان بکەین.

باوک لە هاوڕێ لە پێشترە، کەچی بە باوکان دەڵێین لەگەڵ منداڵەکانتان وەکو هاوڕێ بن، بۆچی وا دەڵێین؟ وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەیە کە هاوڕێ فەرمان ناکات بەسەرتدا، بەڵکو داوات لێدەکات، قسەکانی ناسەپێنێت پێشنیازت بۆ دەکات، لەبەرئەوە قسەکانی جێی بڕواپێکردنە، هەر لەبەرئەوە ڕۆڵی هاوڕێ هەستیارە و قسە و ڕەفتارەکانی بەبێ پەردە

---

٢ – صحيح البخاري، عن أبي هريرة، برقم (٦١٣٨)



دەچیتە دڵەوە، هەر لەبەر ئەوەیە پێغەمبەرمان (د.خ) دەفەرمویێت: المرءُ على دينِ خليلِه فلينظرْ أحدُكم مَن يُخالِلُ (٣)، کەسەکان لەسەر ئایینی هاوڕێ خۆشەویستەکەیەتی، کەواتە بزانن کێ دەکەن بە هاوڕێی گیانی بە گیانیتان.

### ٤- کارامەیی هەڵسوکەوت لەگەڵ گرفت و ئالانگارییە کۆمەڵایەتییەکان:

گرفت و ئاڵانگارییەکان بەشێکن لە ژیانی تاک و خێزان و کۆمەڵگە، کەسەکان پێویستە لەسەر کارامەیی چارەسەری گرفت و سەرکەوتن بەسەر ئاڵانگارییەکان ڕابهێنرێن بۆئەوەی بتوانن ژیان بە سەلامەتی بگوزەرێنن، لەبەرئەوە دەرکەوتووە لە حاڵەتی ئاسایی هەمووان کەسانی چاکن، بەڵام کاتێک گرفت دروست دەبێت کەسەکان بەها شاراوەکانیان دەردەکەوێت(٤)، لە ئەنجامی ڕوانین بەو کەیسە خێزانییانەی کە هاتووەتە بەردەستمان دەرکەوتووە، کە کەسەکان لە حاڵەتی هێمنی و ژیانی ئاساییدا یەکتریان بە دڵە، بەڵام کاتێک کێشە دێتە پێشەوە لەگەڵ هاوسەر و منداڵەکان، یان لەگەڵ هاوڕێ و خزمان، ئەو کات شێواز و کارامەیی چارەسەرکردنیان پێ نیە، لە جیاتی ئەوەی بیر لە کوژاندنەوەی ئاگرەکە بکەنەوە بەنزینی پیادا دەکەن، پاشان کاتێک ئاڵانگاریی دەرەکی دێتە پێش ژیانیان، نازانن بەسەریدا سەربکەون و لە بەرامبەریدا چۆک دادەدەن و دەروونیان دەڕووخێت و ئاسایشی خێزانەکەیان دەخاتە مەترسییەوە.

### ٥- گۆڕینەوەی ڕێز و خۆشەویستی:

پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە سروشتییەکان لەسەر بنەمای ئەرک و ماف و عەقڵکاری دانامەزرێت، بەڵکو لەسەر بنەمای سۆز و خۆشەویستی دادەمەزرێت، سەرەتا کەسەکان بۆ دروستکردنی پەیوەندیی لۆژیک بەکاردەهێنن و چەندین پرسیار لە خۆیان دەکەن، ئایا ئەم پەیوەندییە باش، گونجاوە، سوودی هەیە ... هتد؟ بەڵام هەر ئەوەندە ڕازی بوویت، پێویستە ئەو هەڵسەنگاندنە لاببرێت و بۆ هەموو کار و کات و هەڵوێستێک دووبارە نەکرێتەوە، لەبەرئەوەی کەسەکان ئەگەر هەڵسەنگاندنی بەردەوام خۆشیان بکەین لە تاقیکردنەوەکە دەرناچن، ئەگەر کەسێک بەوشێوەیەی کرد پەیوەندییەکانی نامێنێت و هەمووی لەدەست دەدات.

---

٣ - ابن باز ، صحيح ، الرقم (٣٠٦)

٤ - تێبینی/ ڕاست نیە بوترێت لە کاتی توڕەیی و کێشە کەسەکان لەسەر حاڵەتی سروشتی خۆیان و بەبێ ماسک دەردەکەون، لەبەر ئەوەی نائارامی حاڵەتی ئاسایی کەسەکان نیە، بەڵکو حاڵەتی هێمنی کەسەکان سروشتیان دەردەخات، بەڵام لە حاڵەتی توڕەیی و کێشەدا هەندێک بەها دەدرکەون کە کەسەکان لە قەناعەتیاندا چەسپاوە و دەردەکەوێت، وەکو نەخۆشیەکی شاراوەیە تەنها لەو بارودۆخەدا دەردەکەوێت.

### ٦- هونەری گفتوگۆ و دانوستان:

سەردەمی تەکنۆلۆژیا و کارکردن و قسەکردنی ئەلیکترۆنی، توانای کەسەکانی لە گفتوگۆ و دانوستانی ڕاستەوخۆ کەمکردووەتەوە، لە قۆناغی پێش بڵاوبوونەوەی تەکنۆلۆژیا خێزان بەئاسانی لە کاتی نان خواردن و دەوری ئاگردان کۆدەبوونەوە و توانای گفتوگۆ و قسە و دانوستانیان گەشەی دەکرد، منداڵێکی ئەو کاتە لە گەورەیەکی ئێستا توانای دانوستان و قسەی بۆ دروست دەبوو، دواتر تەلەفیزیۆن هاتەکایەوە و ئەم کارامەییەی کەمێک لاواز کرد، کاتێک خێزان بە کۆمەڵ سەیریان دەکرد هەر باش بوو، بەڵام لە ئێستادا کە هەریەکە و مۆبایلێکی پێیە و لە ژوورێکی جیایە ئەو کارامەییەی زۆر لاواز کردووە.

### ٧- ژیان بەبێ ئەستێرە:

ژیانی کۆمەڵایەتی لەناو خێزان بەبێ ئەستێرە دروست دەبێت، واتا کاتێک پیاو یان ئافرەت یان منداڵەکانیان لە هەر پلە و پۆستێکی فەرمی و کۆمەڵایەتیدا بن لە دەرەوە پێویست دەکات، کە هاتنە دەرگای ماڵەوە ئەستێرەکانی سەرشانیان لێبکەنەوە و بەوپەڕی سادەیی بێنە ژوورەوە، لەبەرئەوەی خێزان لەسەر سادەیی بەردەوام دەبێت، هەرکات یەکێکیان هەستێکی خۆ بە گەورە زانینی بۆ دروستبوو، ڕاستەوخۆ ئاسایشی خێزان دەخاتە مەترسییەوە و ئامادەیی بۆ هەڵوەشان و لێکترازان زۆر گەورە دەبێت.

## سێیەم/ لایەنی پەروەردەیی: پێکدێت لە .....

### ١- ڕوحی:

ڕۆحی مرۆڤ بە بەندایەتیکردنی ڕاستەقینە و تەندروست بۆ پەروەردگارەکەی ئاسوودە دەبێت، (فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ) (٥)، بەڵام ئەوەی گرنگە لێرەدا ئەوەیە بەردەوامی لەسەر ئەم کارە پێویستی بە ڕاهێنان و پەروەردە کردن هەیە، سەرەتا منداڵ چاو دەکاتەوە وێنە و هەڵسوکەوتی باوک و دایک و خوشک و برا و نزیکەکان دەبینێت و وەکو وێنە لای تۆمار دەبێت، ئاشکرایە وێنە سەرەتاییەکان باشتر و زۆرتر کاریگەرن، بەواتایەکی تر تا تەمەنی (٧) ساڵی بە نزیکەیی ڕەفتاری گەورەکان پێشەنگە بۆ منداڵەکان، ئەگەر باش بوو، خوداناسیی و کاری باش و خوداپەرستی

---

٥ - سورة الحجر، آية ٢٩

پێوە دیار بوو ئەوە جێی خۆی دەکاتەوە، لە دوای (٧) ساڵی هەتا (١٢) ساڵی قسە و خۆشەویستی واتە (لۆژیک و سۆز) دەبنە هاوبەشی ڕاستەقینەی ڕەفتار لە ئاڕاستەکردنی منداڵ، دوای ئەو تەمەنە بە نزیکەیی جێگیر دەبێت و لێکدانەوە و لۆژیک و حەزەکانی خۆی دەبنە پاڵنەری کار و ڕەفتارەکانی، بەڵام تا کۆتایی تەمەن کاریگەری پەروەردەکردنە سەرەتاییەکەی خێزان جێ پەنجەی لەسەر لایەنی ڕۆحی کەسەکان دەهێڵێتەوە.

**٢- دەروونی:**

پەروەردەی دەروون و ناخی منداڵ و گەورەکانیش پاڵنەرن بۆ پێگەیاندنی کەسێتییەکی هاوسەنگ، لەبەرئەوە گرنگە، بە کردارەکانی (هاندان، خۆشەویستی، پاڵپشتی، ئاسوودەیی، هێمنی، لێبوردەیی)، دەروونێکی ئاوەدان و پاک و جوان پەروەردە بکەین، ئەو کاتە ئەم تاکە دەروون دروستە دەبێتە هەوێنی خێزانێکی بەختەوەر و ئاسایشی خێزان لەسەر دەستی پارێزراو دەبێت.

**٣- کۆمەڵایەتی:**

منداڵ کەسێکی کۆمەڵایەتییە و حەزی زۆری هەیە بۆ تێکەڵاوی و هاوڕێگرتن و دروستکردنی پەیوەندی تەندروست، بەڵام لەبەر (٣) هۆکار زۆرجار ئەو توانایە لەدەست دەدات، یەکەمیان: دایک و باوکی دوورەپەرێز وا دەکەن منداڵەکە لەو ناوەندە دادەبڕن، دووەم: تەکنۆلۆژیا و بەکارهێنانە سەرنجڕاکێشەکانی کەسەکان دەباتە جیهانێکی گریمانەییەوە، سێیەم: تەمەنی نەوجەوانی وا دەکات کەسەکان لە پەیوەندییەکان بکشێنەوە، ئەم هۆکارانە ئەگەر پەروەردەیەکی تەندروستی نەبێت لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە تەندروست نابن، دواتر گرفتی کۆمەڵایەتی و ڕەفتاری بۆ دروست دەبێت، بۆ نموونە کوڕێک یان کچێک کاتێک هاوسەرگیریی دەکات ناتوانێت یان نازانێت ڕەفتاری کۆمەڵایەتی تەندروست لەگەڵ کەسوکار و نزیکەکانی هاوسەرەکەیدا بکات، لەبەرئەوەی لەکاتی پێویست پەروەردەی تەندروستی وەرنەگرتووە، ئەوەش ئاسایشی خیزانەکەی دەخاتە مەترسییەوە.

**٤- تەندروستی:**

یەکێک لە کارە سەرەکیەکانی خێزان بریتیە لە پاراستنی ژیان و تەندروستی ئەندامانی خێزان، پاشان ڕاهێنان و پەروەردەکردنی تەندروستی ئەندامەکان بەدوایدا دێت، بۆ بزان چۆن پارێزگاری لە تەندروستی خۆیان دەکەن، هەروەک پێغەمبەرمان (د.خ) دەفەرموێت: (...فإِنَّ لِجَسَدِكَ عَلَيْكَ حَقًّا ...) واتا جەستەت مافی لەسەرتە و پێویستە مافی خۆی پێ بدەیت و بیپارێزێت.

**٥- هیوایات:**

کەسەکان خاوەنی حەز و خولیان، ئەوەش وا دەخوازێت دایک و باوک و منداڵەکان خولیا و هیوایەت و حەزەکان بناسن، پاشان پەروەردە و ڕاهێنانیان بکەن لەسەر ئەنجامدانیان، بۆئەوەی ببێتە خوو، لەبەرئەوەی بەشێک لە هەستکردن بە خۆشیی و ئاسوودەی مرۆڤەکان بە ئەنجامدانی هیوایەتەکانەوە بەندە، ئەمە ئەگەر پەروەردە بکرێن، بەڵام ئەگەر پەروەردەی ئەو لایەنە فەرامۆش کرا، یان زۆرجار دوای هاوسەرگیریی بەهۆی سەرقاڵی زۆر و قۆرخکاری لەلایەن هاوسەرەوە ڕێگری کرا، ئەوا هەست بە نائارامی دەکرێت و دواتر کێشە دروست دەکات.

**٦- دارایی و پیشەیی:**

پەروەردەکردن و ڕاهێنان لەسەر پیشە لە ئێستادا پێویستە هەر لە سەرەتای تەمەنەوە دەستپێبکات، بەتایبەتی دوای ئەوەی خوێندنی ئەکادیمی ناتوانێت زەمانی پەیداکردنی هەلی کار بکات، لەبەرئەوە پلانی دارایی و پەروەردەی هەڵسوکەوت لەگەڵ پارە و سەرەت و سامان گرنگە دایک و باوک هەرزوو کاری لەسەر بکەن، بەڕێوەبردنی دارایی تەندروست پێویستی بە هەڵبژاردنی پیشە دەبێت کە لەگەڵ حەز و توانا و ئامادەکارییەکانی کەسەکە بگونجێت، ئەوەش دەبێتە هۆی پاراستنی خێزان لە قەیرانی دارایی لە داهاتوودا، لەبەرئەوەی لە ئێستادا فەرامۆشکردنی پەروەردەی دارایی و پیشەیی کێشەی زۆری بۆ هاوسەر نوێیەکان دروستکردووە و ئەگەر ئامادەکاری پێش کاتی بۆ بکرێت، خێزان لەو کێشەیە پارێزراو دەبێت.

**٧- تەکنۆلۆژی:**

تەکنۆلۆژیا بووە بە بەشێکی گرنگ لە ژیانی تاک و کۆمەڵگە، هەندێک لە توێژینەوەکان دەریانخستووە کاریگەری لەسەر پەروەردەی گەنجەکان ڕێژەی (٤١٪)(٦)ی گرتووە، زیاتر لە خێزان و پارتە سیاسییەکان و مزگەوت بەیەکەوە، ئەوەش ڕێژەیەکی بەرچاوە و پێویستی بە توێژینەوە و پەروەردە و ئامادەکاری زۆر هەیە، کە بتوانین بە ئاڕاستەی هێمنی و پاراستنی خێزان بەکاری بهێنین و بە بەرنامەیەکی تەندروست ڕێکیبخەین.

---

٦ - دانا فاضل، رسالة ماجستير، جامعة بيروت العربية، ٢٠١٤، ١٢٣.

## کۆتایی:

خێزان گرنگترین یەکەی کۆمەڵایەتییە لە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی و لە کۆمەڵگە مسوڵمانەکان بەتایبەتی تر، لەبەرئەوەی سەرچاوەی هەموو (جوانی، پاکی، ڕێکی، ئاسوودەیی، خۆشەویستی، دەروونددروستی) تاکەکانە و پارێزەری بەها و خۆشبەختی و ئاسوودەییە، هەر کارێک ببێتە هۆی دروستنەبوونی، یان تێکدانی، یان هەڵوەشانی، بە کارێکی خراپ هەژمار دەکرێت، یەکێکیش لەو بابەتانەی کە ئێستا بەردەستە و بووەتە دیاردە بریتییە لە ئاسایشی خێزانی، کە بەهۆی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی و تەکنۆلۆژیی و ئایدیای نوێی جیهانەوە کەوتووەتە مەترسییەوە، لەم نووسینە تیشکمان خستە سەر پاراستنی لایەنی (دەروونی، کۆمەڵایەتی، پەروەردەیی) وەکو هۆکاری پاراستنی ئاسایشی خێزان، هەروەها وەکو ئاماژەیەک بۆ ئامادەکاریی و پارێزگاریکردن لەو پێوانە و تایبەتمەندییانە، بۆئەوەی بزانین ڕێگری بکەین لە هۆکارە ڕووخێنەرەکان و گەشە بدەین بە بەها و کارامەییەکان کە دەبنە هۆی بەدیهێنان و پاراستنی خێزان و بەهێزکردنی بنەما و توانا و پێگەکەی لە کۆمەڵگەدا.

## سەرچاوەکان


١- قورئانی پیرۆز

٢- فەرموودەکانی پێغەمبەر(د.خ).

٣- الآثار الاجتماعية والثقافية لاستخدام الإنترنيت على الشباب، دانا فاضل محمد، رسالة ماجستير، جامعة بيروت العربية، ٢٠١٤.

٤- المواثيق الدولية وأثرها في هدم الأسرة، كاميليا حلمي محمد، أطروحة دكتورا، جامعة طرابلس، ٢٠٢٠.

٥- العادات السبع للأسر الأكثر فعالية، ستيفن آر. كوفي، مكتبة الجرير، رياض، ٢٠١٠.

٦- الإرشاد الأسري، د. عبدالعزيز عبدالله البريثن، مكتبة الشروق، عمان، ٢٠١١.

٧- فن الحوار في العلاقات الإنسانية والأسرية، ميساء جوبسون، ورقة عمل قدمت في مؤتمر الإرشاد الأسري بين رسالة العطاء ومهنية الاداء، أسطنبول، ٢٠٢٢.

سەقامگیریی و ئارامی هەر کۆمەڵگەیەک بەندە بە کۆمەڵێک پرنسیپ و بنەمای گرنگ، کە دەشێت وەک کۆڵەکە و ستوونی بەرقەراربوونیان لێیان بڕوانین. لە بەرامبەریشدا لەدەستدانی ئەو بنەما و پرنسیپانە یان نەبوونیان، کۆمەڵگە بەرەو هەڵدێر و ماڵوێرانی دەبات. یەکێک لەو کۆڵەکە سەرەکییانەی سەرجەم کۆمەڵگەکانی لەسەر دادەمەزرێت و گەرەنتی مانەوەیانە (ئاسایشی کۆمەڵایەتییە).

## ئاسایشی کۆمەڵایەتی چییە؟

لە تێڕوانینی ئیسلامییەوە – وەک ئیبن خەلدون ( ٧٣٢-٨٠٨) دەڵێت- کۆبوونەوە – الاجتماع- هاوواتای (ئاوەدانیە-العمران) کە سەرجەم ڕواڵەت و لایەنەکانی پەیامی مرۆڤایەتی و هەموو جۆرەکانی ئەو ئەمانەتە لەخۆدەگرێت، کە پەروەردگار بە مرۆڤی سپاردووە بۆ ئاوەدانی بوون(زەوی). بەمپێیەش- وەک محەمەد عیمارە دەڵێت- ئاسایشی کۆمەڵایەتی بریتییە لەو ئارامی و دڵنیابوونەی ترس و دڵەڕاوکێ لە مرۆڤ دووردەخاتەوە چ وەک تاک چ وەک کۆمەڵ لە سەرجەم بوارەکانی ئاوەدانی دونیایی.

لە تێڕوانینی واقیعبینانەی ئیبن خەلدون و پێناسەکە عیمارە، بەڕوونی دیارە کە چەمکی (ئاسایشی کۆمەڵایەتی) هاومل و بارمتەی چەندین جۆرە لە (ئاسایش) لەوانە: ئاسایشی نەتەوەیی، ئاسایشی خۆراک، ئاسایشی دەرمان، سەروەری ناوخۆیی، سەروەری دەرەکی... هتد.

پسپۆڕێکی کۆمەڵناسیش پێیوایە (ئاسایشی کۆمەڵایەتی) بریتییە لەوەی کە تاکەکان و کۆمەڵەکان پارێزراوبن لە هەموو هەڕەشەیەکی ناوخۆیی و دەرەکی، کە لەوانەیە مەترسی لەسەر بوونیان دروستبکات وەک هەڕەشەی سەربازی و هەموو ئەو مەترسییانەی ڕوو لە تاکەکان و کۆمەڵەکان دەکات وەک: کوشتن و ڕفاندن و تۆقاندن و دەستدرێژی بۆ سەر ماڵ و موڵکیان. قسەکردن سەبارەت بە ئاسایشی کۆمەڵایەتی، قسەکردنە دەربارەی (ماهیەت- چییەتی) ئەم چەمکە؛ پرنسیپەکانی، فاکتەرەکانی بەرقەراربوونی، سود و ئاسەوارەکانی، لە بەرامبەریشەوە قسەکردنە دەربارەی لێکەوتەکانی لەدەستدانی ئاسایشی کۆمەڵایەتی و لێکترازانی کۆمەڵگە (کە ئەمەی کۆتایی بابەتی نووسینەکەی ئێمەیە).

## پاڵنەرەکانی لێکترازانی کۆمەڵگە:

پاڵنەرەکان و لێکەوتەکانی لێکترازانی کۆمەڵگە، دوانەیەکی لەیەک جیانەبووەوەن، لەبەرئەوە قسەکردن لەسەر لێکەوتە و دەرهاویشتەکانی لێکترازانی کۆمەڵگە، بێ ئاماژە نەکردن بۆ پاڵنەرەکانی لێکترازان، مانایەکی ئەوتۆی نابێت و لێکۆڵینەوەکەمان کەموکوڕ دەبێت، لەبەرئەوە پێش قسەکردن لە لێکەوتەکانی لێکترازانی کۆمەڵگە، بە،کورتی ئاماژە بەگرنگترین پاڵنەرەکانی ئەو لێکترزانە دەدەین کە دەکرێ بەمشێوەیە پۆلێنیان بکەین:

**یەکەم: پاڵنەرە ئابوورییەکان و کۆمەڵایەتییەکان؛ لەوانە:**

- لاوازی قەدەغەکار – وازع-ی ئایینی و ئەخلاقی.
- هەژاریی و خراپی گوزەرانی هاوڵاتی.
- لاوازی ئینتیمای نیشتمانی و نەبوونی گیانی بەرپرسیارێتی.
- دابونەریت
- خۆپەرستی- ئەنانیەت-  و تەرەف.
- بڵاوبوونەوە و بەرزبوونەوەی ڕێژەی بێکاری.
- دواکەوتوویی هەلومەرجی کۆمەڵایەتی.
- قەیرانە ئابوورییەکان.
- کەمتەرخەمی دەوڵەت لە ڕیکخستنی بازاڕ و ناعەدالەتی لە دابەشکردنی سامان.
- قۆرخکردنی ناوەندەکانی بڕیارە ئابوورییەکان لەلایەن گرووپێکی دەستڕۆیشتوو.
- زاڵبوون و هەژموونی کۆمپانیا فەردییەکان (لەبەرگی کۆمپانیای نیشتمانی و نەتەوەیی) و قۆرخکردنی پرۆژەکانی ئابووریی و ئاوەدانی.
- دەستێکڵاوکردنی نێوان مشەخۆرە سیاسیی و سەرمایەدارەکان.

**دووەم- پاڵنەرە سیاسیی و یاساییەکان؛ لەوانەش:**

- دیکتاتۆریەتی و باڵادەستی گرووپێکی دەستڕۆیشتوو. (تاکڕەوی لە دەسەڵاتدا).
- سستی و لاوازی ئەدای دەزگاکانی دەوڵەت.
- لەدایکبوون و دروستبوونی دەوڵەت بەشێوەیەکی ناسرووشتی(نەباکامی دەوڵەت).
- توندوتیژی سیاسیی و ناجێگیری هەلومەرجی سیاسی.

- نەبوونی شەفافیەت و لێپێچینەوە(المساءلة).
- لاوازی هۆشیاری سیاسی.
- نا ئامادەیی دەوڵەتی مەشروع و دەزگایی.
- سەربەخۆنەبوونی دەزگای دادوەری.
- هەتاهەتایی -ئەبەدیبوونی- سەرکردەکان.
- نازانستیبوونی دەزگا کارگێرییەکان.
- دانەنانی کەسانی شیاو لە شوێنی شیاو.

**لێکەوتەکانی لێکترازانی کۆمەڵگە:**

بەوپێیەی تەونی کۆمەڵایەتی هەر کۆمەڵگەیەک (یەکەیەکی) فرەڕەهەندە و سەرجەم پێکهاتەکانی ئەو تەونە وابەستەی یەکترن و هەر هەژموونێکی ئەرێنی – ئیجابی- خزمەتە بە سەرجەم پێکهاتەکان، لە بەرامبەریشەوە بوونی هەر هەژموونێکی نەرێنی- سەلبی- و هەر مەترسیی و هەڕەشەیەک سەرجەم پێکهاتەکان دووچاری ناجێگیریی و لێکترازان دەبات، بەمپێیە دەکرێ بوار و لایەنەکانی لێکترازانی کۆمەڵگە بەمشێوەیەی لای خوارەوە پۆلێن بکەین و لەسەری بدوێین:

**یەکەم- لێکەوتە دەروونییەکان:**

یەکەم مەترسیی و هەڕەشەی لێکترازانی کۆمەڵگە، ئەو لێکترازانەیە، کە تاک دەکاتە ئامانج و کاریگەری ڕاستەوخۆی دەبێت بۆ سەر کەسایەتی تاک و بوون و قەوارەی خودی و هەوڵی تێکشکانی لایەنی دەروونی دەدات و چەندین ژەهری کوشندەی وەک نەخۆشییە دەروونییەکان و شڵەژانی دەروونی و تێکچوونی کەسایەتی- اضطرابات الشخصیة- لە ناخی تاکدا بەجێدەهێڵێ. بەپێی توێژینەوەکان، لەکاتی ئاساییدا لە هەر ١٥ کەس، کەسێک دووچاری گرژی دەروونی و لەدەستدانی دەروونددروستی دەبێتەوە، بەڵام لەکاتی نائاسایی و تێکچوونی هەلومەرجی کۆمەڵایەتیی و سیاسی، لە هەر ٥ کەس، کەسێک دووچاری گرژی دەروونیی و لەدەستدانی دەروونددرووستی دەبێتەوە.

مەترسییە دەروونییەکان لەم ئاستەدا ڕاناوەستێت؛ بەڵکو دەرەنجامی دڵەڕاوکێ و خەمۆکی و سەرهەڵدانی چەندین نەخۆشی دەروونجەستەیی- سایکۆسیماتی؛

حاڵەتەکانی جیابوونەوە و پەنابردن بۆ بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان، ڕوو لە زیادبوون دەکات. بەپێی توێژینەوەیەکی تازەش، لە ٥٦٪ی هاوڵاتیانی باشوور و ناوەڕاستی عێراق دووچاری شڵەژانی دەروونی و ناجێگیری دەروونی بوونەتەوە، دەرەنجامی ترس و دڵەڕاوکێ و تۆقاندن و کوشتن و تەقینەوە و لێدان و توندوتیژی سیاسی و دەروونی و ... هتد.

لە هەرێمی کوردستانیش، بەهۆی سیاسەتی چەوتی سیاسییە دەستڕۆیشتووەکان، حاڵەتەکانی خۆکوشتن و زیادبوونی نەخۆشییەکانی فشاری خوێن و شەکرە و خەمۆکی دڵەڕاوکێ و ... هتد ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ڕوو لە زیادبوون دەکات. بەدڵنیاییشەوە گەر توێژینەوەیەکی سەربەخۆ و بێلایەن ئەنجام بدرێت، ئەوا باری دەروونی هاوڵاتیانی هەرێم باشتر نابێ لە هاوڵاتیانی تری عێراق، بەتایبەت ئەم چەند مانگەی دوایی و قەیرانە دروستکراوە یەک لەدوای یەکەکان!!!

**دووەم – لێکەوتە کۆمەڵایەتییەکان:**

مەبەست لە لێکەوتە کۆمەڵایەتییەکان – وەک پسپۆڕانی بواری کۆمەڵناسی پێناسەیان کردووە، هەموو ئەو دەرەنجام و لێکەوتانەن کە دروست دەبن یان سەرهەڵدەدەن بەهۆی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییەوە کە مرۆڤ هەستیان پێدەکات، وەک تاوان، هەژاری، بێکاری، نەخۆشی، توندوتیژی سیاسی، خێزانی، پەروەردەیی ... هتد.

دەبینین، هەریەک لەو دیاردە و ڕووداوانە کۆمەڵێک لێکەوتەی کۆمەڵایەتی لێدەکەوێتەوە، کە پەیوەندی ڕاستەوخۆی هەیە بە ڕەفتاری کۆمەڵایەتی و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و بونیادی کۆمەڵایەتی و گرفتەکانی کۆمەڵگە و بنەماکانی زەبت و ڕەبتی کۆمەڵایەتی. گەرچی بابەتەکەی ئێمە تایبەت نییە بە توندوتیژی خێزانییەوە یان حاڵەتەکانی جیابوونەوە، بەڵام وەک ڕواڵەتێکی لێکترازانی کۆمەڵگە و تێکچوونی ژینگەی کۆمەڵایەتی، ئاماژە بە ئاماری حاڵەتەکانی جیابوونەوە دەدەین لە هەرێمی کوردستان لە ساڵی ٢٠٢٢.

بەپێی ئامارە فەرمییەکان، ساڵی ٢٠٢٢ لە پارێزگاکانی هەرێمی کوردستان ٥٥٨٩٦ حاڵەتی مارەبڕین تۆمارکراوە، بەڵام هەر لەو ساڵەدا ١٣٩٦٧ حاڵەتی جیابوونەوە یان تەڵاق ڕوویداوە. لێکدانەوەی ئامارەکان دەری دەخات لە ساڵی ٢٠٢٢ ئاماری جیابوونەوە ٪٢٥ی کۆی ئاماری هاوسەرگیرییە و بەواتایەکی تر تا چوار خێزانی نوێ پێکهاتووە، خێزانێک لەبەر یەکتر هەڵوەشاوەتەوە.

ڕاستە جیابوونەوە دیاردەیەکە لە هەموو کۆمەڵگەیەک هەیە و کوردستانیش بێبەری نییە لەو دیاردەیە، بەڵام ئەوەی زیاتر مایەی نیگەرانییە ئەوەیە ئاماری جیابوونەوە بەخێرایی ڕووی لە هەڵکشانە، بەڵام ئاماری هاوسەرگیریی ئەو خێراییەی نییە. ساڵی ٢٠٢٢ هاوسەرگیری لە هەرێمی کوردستان بەڕێژەی ٢٪ زیادی کردووە، لەکاتێکدا جیابوونەوە لە هەمان ساڵدا بە ڕێژەی ١٩٪ زیادیکردووە.

هەر لەم چوارچێوەیەدا و لە نموونەی لێکەوتە کۆمەڵایەتییەکانی لێکترازانی کۆمەڵگە (بەتایبەت کاتێک سیاسییە دەستڕۆیشتووەکان دەبنە سەرمایەدار و کاری سەرەکییان دەبێتە کۆکردنەوەی سامان و بەڕێوەبرنی دەوڵەتیش کاری پەراوێز- وەک ئیبن خەلدون باسی لێوە دەکات و پسپۆڕانی کۆمەڵناسی و شارەزایانی بواری سیاسەت دواتر باسیان لێوەکردووە:

- ناعەدالەتی
- نەبوونی هەلی کار
- بەرزبوونەوەی ڕێژەی تاوان
- هەژاری
- ناجێگیری بەها ئاکارییەکانی وەک ئەمانەت و یەکسانی و دادپەروەری.
- ئەنانیەت و خۆپەرستی(جا ئیتر خۆپەرستی بۆ خودی خۆی بێت یان بۆ ئەو گرووپ و دەستەی کاری تێدا دەکات).
- نەمانی هەستی نەتەوەیی و ئینتیمای نیشتمانیپەروەری.
- لاوازبوونی ئەوەی پێیدەوترێت ئەخلاقیاتی کار و پیشە.
- قوڵبوونەوەی گیانی گوێپێنەدان-لاموبالات- و خۆکەڕکردن و خۆشاردنەوە لەو ڕووداوە سیاسیی و کۆمەڵایەتییانە ڕوودەدەن لە دەوروبەر.
- ڕێزنەگرتنی کات و (هونەربازی) کوشتنی بە چەندین بیانووی بێسەروبەر و بەهانەی بێجێ.
- بەفیڕۆدانی بەرژەوەندی گشتی.
- سەرهەڵدانی سێکوچکەی (بێسەروبەری لە سیستەمی سیاسی و بەڕێوەبردن، کە پابەندبوونی پێ ڕەفزە)، (پەڕاگەندەیی کە پلاندانانی پشتگوێ دەخات)، (کەمحەوسەڵەیی سیاسی و هەڵکشان و داکشان و هەناسەسواربوونی سیاسی، کە بەخێرایی کڵپە دەکات و بەخێراییش کپ دەبێت و دەکوژێتەوە)!
- خۆدزینەوە لەو یاسا و ڕێسایانەی سیستەمی (ژینگەیی و تەندروستی ڕێکدەخەن).

**سێیەم – لێکەوتە سیاسیی و ئابوورییەکان:**

هاوشێوەی لێکەوتە دەروونیی و کۆمەڵایەتییەکان، لێکەوتە سیاسیی و ئابوورییەکانیش کاریگەری زۆریان دەبێت لەسەر ئاسایشی کۆمەڵایەتی و زەرەمەندی یەکەم تاک دەبێت و پاشان کۆمەڵگە و دامودەزگاکانی.

شاعیری بەناوبانگی ئێرانی (سەعدی شیرازی) دەڵێت: (ئەگەر پادشا سێوێکی لە باخی کەسێکدا لێکردەوە، ئیدی سەربازەکانی دارسێوەکە لە ڕەگەوە هەڵدەکێشن!!). بەمپێیەش سیاسییە دەستڕۆیشتووەکان نەک تەنها دەرگای بارگرانی و کارەسات بەڕووی هاوڵاتیاندا دەکەنەوە، بەڵکو دەبنە سەرچاوەی مەترسی و هەڵەکانی گەشەپێدان و ئاوەدانی و پەرەپێدانی ئابووری لەباردەبەن و ئەم تەوژمە مەترسیدارەش شۆڕدەبێتەوە بۆ سەرجەم ئۆرگان و دەزگاکان.

دەتوانین گرنگترین لێکەوتە سیاسییەکان و ئابوورییەکانی لێکترازانی کۆمەڵگە لەم چەند خاڵەدا کۆبکەینەوە:

- زیادبوونی هەڵاوسان و دابەزینی بەهای دراو، بۆ نموونە، بەپێی هەندێ توێژینەوە کە لەسەر گەندەڵی لە عێراق ئەنجامدراون، ئەگەر هاوڵاتییەکی عێراقی ساڵی ١٩٩٩ شمەکێکی بە ١٠٠٠ دینار کڕیبێت، ئێستا هەمان شمەک بە (١٥٠٠٠٠) سەدوپەنجا هەزار دینار دەکڕێت. ئەمەش جۆرێک لەبارگرانی بۆ هاوڵاتیان دروستدەکات و پرۆسەکان هاوسەرگیری، ئاوەدانی، خزمەتگوزاری، پەکدەخات.

- لەباربردنی هەڵەکانی گەشپێدانی ئابووری: توێژینەوە مەیدانییەکانیش باس لەوەدەکەن کە ئەو حکومەتانەی کۆمەڵگەکانیان ڕووبەڕووی لێکترازان بوونەتەوە، خەرجییان زیاد دەبێت بە بەراورد بە پرۆژە و هەڵەکانی گەشەپێدان، چونکە ئەم جۆرە حکومەتانە زیاتر ئارەزووی پرۆژەی وەهمی و خەرجی گوماناویی و بەرتیل وەرگرتن دەکەن. لە بەرامبەریشەوە خەرجییەکانی حکومەت بۆ خزمەتگوزارییەکانی بواری فێرکردن و تەندروستی کەمدەبێتەوە.

* نائامادەیی پرنسیپی ( شەرعیەتبوونی) دەوڵەت و پەرتەوازەیی و ئیفلیجی دامودەزگاکانی و سەرهەڵدانی ڕێگاکانی فێڵکردن لە هاوڵاتیان و دزی و فەرزکردنی باجی جۆراوجۆر. ئەم (ناشەرعیبوونەش کۆمەڵێک دەرهاویشتە بەدوای خۆیدا دەهێنێت؛ لەوانە: لاوازی بەشداری سیاسی، لەکەداربوونی ناوبانگی دەوڵەت، لاوازبوون و لاوازکردنی دەزگا گشتییەکان، پڕکردنەوەی پۆستە باڵاکان بە

کەسانی ناشایستە و نەزان.

بەفیڕۆدانی سامانی گشتی و بەکارهێنانی لەلایەن سیاسییە دەستڕۆیشتووەکان، بەتایبەت لە هەڵمەتەکانی هەڵبژاردن و کڕینی دەنگی(ڕاستتر بڵێین ویژدانی) هاوڵاتیان. ئەم هەنگاوەش ڕێخۆشکەر دەبێت بۆ باڵادەستی خزمخزمێنە و مەحسوبیەت چینایەتی.

- لە هەمووی ترسناکتر- سەرهەڵدانی توندوتیژی سیاسیی و مەزهەبی، جەنگی ناوخۆیی و ناجێگیری سیاسی. چەند توێژینەوەیەکیش گەیشتونەتە ئەو ئەنجامەی کە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ هەیە لە نێوان نایەکسانی کۆمەڵایەتیی و ئابووریی و توندوتیژی سیاسی. بەومانایەی لەگەڵ بەرزبوونەوەی ڕێژەی توندوتیژی سیاسی، ڕێژەی ناعەدالەتی و نایەکسانی بەرز دەبێتەوە. یەکێک لەو توێژینەوانەش لەسەر ٥٦ دەوڵەت ئەنجامدراوە بەمەبەستی زانینی پەیوەندی نێوان یەکسانی و دابەشکردنی داهات و توندوتیژی سیاسی، گەیشتووەتە ئەو ئەنجامەی کە پەیوەندییەکی کاریگەر و ڕاستەوخۆ هەیە لە نێوان نادادی و نایەکسانی و توندوتیژی سیاسی. ئەوەشی خستوەتەڕوو کە کارە توندوتیژییەکان لەو وڵاتانەدا زیادیکردووە، کە ئاستێکی باڵای لە نایەکسانی و نادادی لە دابەشکردنی داهات تۆمارکردووە.

## سەرچاوەکان


١- ابن خلدون، - عبدالرحمن بن محمد - مقدمة ابن خلدون.

٢- عمارة، محمد، الإسلام والأمن الاجتماعي.

٣- الحسن، إحسان، البناء الاجتماعي.

٤- عبيد : نهاد عبدالحليم، الوقاية من الجريمة في ضوء السنة النبوية، مجلة الأحمدية - العدد الثالث عشر -محرم ١٤٢٤ هـ - مارس ٢٠٠٣م.

٥- محمود: د صلاح الدين فهمي، الفساد الإداري كمعوق لعمليات التنمية الاجتماعية و الاقتصادية.

٦- الناصر: ناصر عبيد، ظاهرة الفساد الإداري، مقاربة سوسيولوجية – إقتصادية.

٧- ئینتەرنێت.

ئایین وەک هێزێکی ڕۆچوو بەقوڵایی ژیارە مرۆییەکاندا، بەدرێژایی مێژوو کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر یەکخستن و پەرتکردنی کۆمەڵگەکان هەبووە. واتە ڕۆڵی فرەڕووی نواندووە، لەکاتێکدا وەک بکەرێکی پابەند هەستێکی هاوبەش بە ئامانج و شوناسی بەهێز کردووە، لەهەمانکاتدا وەک هاندەرێکی تێبینیکراوی پەرتکردنە قووڵەکان کاریکردووە. بۆ تێگەیشتن لە کارلێکە ئاڵۆزەکانی نێوان لایەنە یەکخەر و پەرتکەرەکانی ئایین، پێویستی بە توێژینەوەی ورد بۆ ڕەهەندە مێژوویی و کەلتووریی و دەروونییەکان هەیە. ئەم (لێکۆڵینەوە مێژوویی)ە هەوڵی ئاشکراکردنی ئەو ئاڵۆزییانە دەدات، کە چۆن ئایین وەک هێزێکی کۆمەڵایەتی بەهێز، هەوڵی پێکهێنانی پەیوەندیی وابەستەگەلییەک دەدات، کە سنووری جیاوازییە تاکییەکان تێدەپەڕێنێت، لە هەندێ کاتی تریشدا پشکۆی ئەو گرژییانە دەگەشێنێتەوە، کە تۆڕی بوونی کۆمەڵایەتی دەدرێنێت، ئەم دوو پرۆسە گەورەیەش لەژێر ناوی (مەقەدەس)دا ئەنجام دەدات. بۆیە لە ڕێگەی پشکنینی وردی پێشینە مێژووییەکان و میکانیزمە دەروونییەکان و دیاردە هاوچەرخەکانەوە، دەستدەکەین بە گەڕان و خستنەڕوویەکی مێژوویی بۆ ئەو ڕۆڵە دووانەییەی، کە ئایین لە یەکخستن و پەرتکردنی کۆمەڵگە مرۆییەکاندا گێڕاویەتی.

### یەکەم: یەکخستنی کۆمەڵگە

لە گەشتی پێکهێنانی شوناسی کۆمەڵایەتیدا، ئایین قووڵاییەکی مێژوویی پێکدەهێنێت، کە ڕۆڵێکی زیندووی لە یەکخستنی کۆمەڵگاکاندا هەیە. (دەق)ەکان (مێژوو) دروستدەکەن، کاریگەرێتیی ئاینزا و ئایینییەکان دەخاتەڕوو، کە چۆن (ئەزموونە ئایینییە بەکۆمەڵەکان) و (بنەما ئاکارییەکان) ناسنامە جیامەندەکانیان پێکهێناوە. بە تێگەیشتن لەم مێژووە، درک بەوە دەکەین کە ئایین چۆن بەدرێژایی سەردەمەکان لە چنینی (تاڵەکانی یەکگرتنیی کۆمەڵایەتی) و بەهێزکردنی (ناسنامەی بەکۆمەڵ)دا پشکداریی دەکات.

### چوارچێوەی ئاکاری هاوبەش:

بەدرێژایی سەردەمەکان، بیروباوەڕی ئایینی سەرچاوەیەکی سەرەکیی ئاکار بووە. لە میزۆپۆتامیای کۆندا، تۆمارە یاساییە - ئایینییەکانی وەک تۆماری ئورنەمو و تۆمارەکانی حامورابی لەگەڵ پێوەرە یاسایی و ئاکارییەکان ڕەنگدانەوەی تەواوکاریی بنەما خوداییەکان بوون. ئەمەش چوارچێوەیەکی ئاکاریی هاوبەشی دروستکرد، کە کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکانی لەژێر کۆمەڵە بەهایەکی هاوبەشدا یەکخست. دواتر فەلسەفەی فەیلەسوفانێکی وەک سۆکرات و ئەفلاتون و ئەرستۆ

لەگەڵ (نەریتە ئایینییەکان) پێکەوە ژیاون. واتە لە زۆر وێستگەدا بنەما فەلسەفییەکان لەگەڵ ئاکاری ئاییندا بۆ چنینی چنراوێکی ئاکاریی یەکگرتوو تێکەڵبوون، کە بەها کۆمەڵایەتییەکانی پێکهێنا و یەکێتی نێوان هاوڵاتیانی بەهێزتر کرد. هاوکات دە ئامۆژگاریی (الوصایا العشر)ەکەی ئایینی جوولەکە و مەسیحی یان پێنج پایەکەی ئیسلام وەک بناغەیەکی ئاکاریی بۆ یەکخستنی باوەڕدارانیان و پێکهێنانی ڕێسا یاسایی و ئاکارییەکانی کۆمەڵگەکانیان کاری دەکرد.

## تیۆری شوناسی کۆمەڵایەتی:

لە شارستانێتی یۆنانیدا، فێستیڤاڵ و ڕێوڕەسمە ئایینیەکان ئادگارێکی چالاکییە هاوبەشەکان بوون. ئەم ئەزموونە بەکۆمەڵانە هەستێکی یەکگرتوویان دروستکرد، واتە پشکدارییان لە شوناسی هاوبەشدا دەکرد و دابەشبوونە کۆمەڵایەتییەکانیان تێدەپەڕاند. دواتر کۆمەڵە مەسیحییە سەرەتاییەکانی نێو ئیمپراتۆرێتی ڕۆمانی کاتێک ڕووبەڕووی چەوساندنەوە بوونەوە. ڕێوڕەسم و بیروباوەڕە هاوبەشەکانیان هۆکارگەلێک بوون بۆ یەکخستنیان، ناسنامەیەکی تایبەت بەخۆیان (مەسیحێتی) پێکهێنا، کە دابەشبوونە جوگرافیی و کۆمەڵایەتییەکانیانی تێپەڕاندبوو.

## جۆشدانی بەکۆمەڵ

یەکێک لەو کارە گرنگانەی بەدرێژایی مێژوو تەواوی ئایینەکان لە جوگرافیا جیاوازەکاندا ئەنجامیانداوە، جۆشدانی بە کۆمەڵ بووە، جۆشدانی بەکۆمەڵ ئاماژەیە بۆ ئەزموونێکی بەکۆمەڵ کە تاکە جیاوازەکان لە شوێنێکی هاوبەشدا کۆدەکاتەوە، کە دەبێتە هۆی دروستبوونی پەیوەندییەکی سۆزداریی و شوناسێکی هاوبەش کە جیاوازییە تاکەکەسییەکان تێدەپەڕێنێت. دەشێت ئەم کۆبوونەوانە لە ئەنجامی بەشداریکردن لە ڕێوڕەسمی ئایینی، یان ڕووداوە کەلتوورییەکان، یان ئەزموونە کۆمەڵایەتییەکاندا دروست بووبێت، کە دەبێتە هۆی هەستکردن بە یەکگرتوویی و وابەستەبوونی کۆمەڵایەتی. بۆنموونە ڕێوڕەسمە نهێنییەکانی ئێلیۆسینی لە یۆنانی کۆن و کۆبوونەوە نهێنییەکانی مەسیحییە سەرەتاییەکان، جۆشدانی بەکۆمەڵ نیشان دەدەن. هەروەها ئاهەنگە مەسیحییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست، وەک ئاهەنگی کۆرپوس کریستی، کە لە ڕێگەی گوزارشتگەلێکی ئایینیی هاوبەشەوە کۆمەڵگاکانیان کۆکردەوە. لێرەوە بەجۆشی ئەم (ئەزموونە بەکۆمەڵانە) وابەستەییەک دروستدەکات، کە دابەشبوونە هەرێمایەتیی و کۆمەڵایەتییەکان تێدەپەڕێنێت.

### کەمکردنەوەی دڵەڕاوکێ

نەریتە ئایینییەکان ڕۆڵێکی کاریگەر لە کەمکردنەوەی دڵەڕاوکێ و نادڵنیایی لە کۆمەڵگەدا دەگێڕن. ئایین چوارچێوەیەک بۆ ڕاڤەی ڕۆحی پێشکەش دەکات، تا ڕووبەڕووی ئاڵنگاریی و ڕووداوە سەختەکان ببنەوە، واتە مەبەست و هیوا لە ناخی تاکەکاندا دەچێنێت. لە بەرامبەر بارودۆخە سەختەکانیشدا، تاکەکان بە پەنابردن بۆ بیروباوەڕی ئایینی دڵنیایی بەدەست دێنن. ئەم تێڕامانەش کۆمەڵگە لە دەوری بەها و بیروباوەڕە هاوبەشەکان کۆدەکاتەوە، واتە یەکگرتوویی و وابەستەیی کۆمەڵایەتی بەهێزدەکات. بۆیە بنەما ئایینییەکان دەروونێک پەروەردە دەکەن، کە بەرگەی فشارەکان بگرێت و بەسەر ئاڵنگارییەکاندا زاڵبێت.




بۆ نموونە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، بیروباوەڕی ئایینی لە بەرامبەر ترس و دڵەڕاوکێ باوەکاندا وەڵام و دڵنەوایی بە مرۆڤەکان دەدا. ڕەنگە دیارترین نموونەش کارەساتی (تاعونی ڕەش ١٣٤٧-١٣٥١)ی ئەورووپا بێت، کە هەڕەشەیەکی ڕاستەقینەبوو، بۆ لەناوبردنی هەموو مرۆڤەکانی ئەو کیشوەرە! لێرەدا بیروباوەڕی مەسیحێتی لەگەڵ لێکدانەوەکانی بۆ تاعون وەک دیاردەیەکی خودایی، یارمەتیدەر بوو لە کەمکردنەوەی دڵەڕاوکێ و دابینکردنی هەستکردن بە (مەبەست) لە ماوەیەکی نادڵنیاییدا. بەهەمانشێوە لە (کۆمەڵگەی ئازتک)دا سرووتە ئایینییەکان بە خولگەی کشتوکاڵی و ڕێکخستنە گەردوونییەکانەوە پەیوەستبوون. باوەڕبوون بە دەستێوەردانی خودایی چوارچێوەیەکی بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ نادڵنیایی پەیوەست بە بەرهەم و دیاردە سروشتییەکان دابین دەکرد.

### دامەزراوەی ئایینی و پشتیوانی کۆمەڵایەتی

دامەزراوەی ئایینی بریتییە لە پەیکەرێکی کۆمەڵایەتی، کە هەڵدەستێت بە ڕیکخستن و ئاڕاستەکردنی چالاکییە ئایینیەکان، هەروەها لە بەهێزکردنی بەها و ئاکاریی هاوبەشدا ڕۆڵ دەبینێت و پشتیوانی ڕۆحیی و کۆمەڵایەتی پێشکەشدەکات، ئەمەش یەکێتی و هاوکاریی لە کۆمەڵگەدا بەهێزدەکات.

لێرەوە دامەزراوە ئاینییەکان، لەڕووی مێژووییەوە ڕۆڵێکی سەرەکییان لە پێشکەشکردنی پشتیوانی کۆمەڵایەتیدا هەبووە. بۆ نموونە دێرەکان (الادیرة) لە ئەوروپای سەدەکانی ناوەڕاستدا وەک ناوەندی ژیانی کۆمەڵایەتی خزمەتیان دەکرد، یارمەتی ماددیی و پەروەردە و تۆخکردنەوەی پەیوەندیدارێتیی و چاودێریی تەندروستی و هاوکاری داراییان پێشکەش دەکرد. هاوکات لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکانیشدا دامەزراوە مەزهەبی و سۆفیگەریی و...تاد لە ڕێگەی ناوەندەکانیانەوە (وەک تەکیە و خانەقا ... تاد) هەمان ڕۆڵیان گێڕاوە.

### چارەسەری ناکۆکیی و هەوڵە ئاشتەواییەکان

تەعالیمە ئاینییەکان و ڕێبەرە ئاینییەکان ڕۆڵی سەرەکییان لە چارەسەرکردنی ناکۆکیەکاندا هەبووە. بۆنموونە کاریگەریی تەعالیمەکانی مەسیح لە ئەوروپای سەدەکانی ناوەڕاستدا، کە جەختی لەسەر لێخۆشبوون دەکردەوە، لە چارەسەرکردنی ناکۆکییەکاندا ڕوون و ئاشکرابوون. هاوکات (بزووتنەوەکانی ئاشتی خودایی) لە ڕێگەی پابەندبوون بە بنەما مەسیحییەکانی ئاشتەوایی، ڕەنگدانەوەی بەرچاویان لە کەمکردنەوەی توندوتیژیدا هەبوو.

دواتر کۆمیسیۆنی ڕاستی و ئاشتەوایی ئەفریقای باشوور (دوای ئاپارتاید)، بەپشتبەستن بە بنەما مەسیحییەکان، هەوڵیدا دابەشبوونە کۆمەڵایەتییەکان بە داننان بە ستەمکارییەکانی ڕابردوو و هاندانی ئاشتەوایی چارەسەر بکات. هاوکات کەسایەتییەکی وەک مەهاتما گاندی، کە ئیلهامی لە بنەماکانی ئایینی هیندۆسی وەرگرتووە، بانگەشەی بۆ خەباتی ناتوندوتیژانە کرد، کە ڕۆڵی لە بەدەستهێنانی ئاشتییانەی سەربەخۆیی هیندستاندا گێڕا.

**خۆشگوزەرانی و تەندرووستی دەروونی**

ئایین بە فەراهەمکردنی چێوەیەکی دەروونی و ڕۆحی بۆ تاکەکان پاڵپشتی خۆشگوزەرانی و تەندرووستی دەروونی دەکات. باوەڕ و سرووتە ئایینییەکان سەرچاوەی هیوا و دڵنیاکردنەوە دەبەخشن و بۆ تێپەڕاندنی ئاستەنگەکان و زاڵبوون بەسەر ئاڵنگارییەکانی ژیاندا یارمەتیدەرن. پاڵپشتی ڕۆحیی و بەشداریکردن لە کۆمەڵگەیەکدا کە ئایین تێیدا تۆخ بێت، کەشی وابەستەیی و یەکدەنگی دەڕەخسێنێت، ئەمەش تەندرووستی دەروونی بەهێز دەکات و لە باشترکردنی ئاستی ژیاندا پشکداریی دەکات.

مومارەسە ئایینییەکانی وەک سروودی ڕۆحی و پەرستشە کۆمەڵییەکان پاڵپشتێکی دەروونیی بەهێز بوون بۆ کۆیلە ئەمریکییەکان. چونکە ڕەگەزی (بەکۆمەڵیی) لەژێر سەرکوتکردنە ڕێکخراوەکانی دەوڵەتدا لە پەرستشی ئایینیدا (هێمنی دەروونیی) فەراهەم دەهێنا.

هاوکات تێڕامان و گرنگیپێدانە زەینییەکان لە نەریتە ئایینیەکانی خۆرهەڵاتدا، لە بەهێزکرنی ئاسوودەیی دەروونیدا ڕەگ و ڕیشەی مێژوویی خۆی هەیە. تەواوکاریی (التكامل) مومارەسە ڕۆحییەکان و تەندرووستیی دەروونی ڕەنگدانەوەی ڕوانگەیەکی گشتگیر بوو بە ئاڕاستەی دروستکردنی (سازانی کۆمەڵگەیی).

**یاساکان و سیستمی کۆمەڵایەتی:**

لە کۆمەڵگەکانی پێش مۆدێرنەدا، زۆرجار نەریتە ئایینییەکان لەگەڵ پەیکەرە یاسایی و کۆمەڵایەتییەکاندا تێکەڵ دەبوون. دیارە چەمکی ئەورووپی بۆ (مەسیحێتی) لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ئەوە بەرجەستە دەکات، کە چۆن مەسیحێتی وەک هێزێکی یەکگرتوو کاری کردووە، شوناسێکی هاوبەش و چێوەیەکی ئاکاریی لەسەر ئاستی کیشوەرەکە فەراهەم هێناوە، واتە مەسیحێتی تەنها سەرچاوەی یاساکان نەبوو، بەڵکو هێزێکی یەکگرتوو بوو، کە کاریگەری لەسەر سیستەمی یاسایی و بەهێزکردنی شوناسی بەکۆمەڵ هەبوو.

هەروەها لە سەردەمی ئیسلامیدا سیستەمی کۆمەڵایەتی لەژێر کاریگەریی بنەما ئیسلامییەکاندا بوو، کە دادپەروەریی و ڕەفتاری ئاکارییان بەهێز دەکرد، جەختکردنەوەش لەسەر دادپەروەری و ئاکار لە بەهێزکردنی سیستمی کۆمەڵایەتیدا پشکداریی کرد.

### پردی نێوان ئایینەکان:

بەدرێژایی مێژوو، لە هەندێ ماوەدا لە نێوان ئایینەکاندا هاریکاریی لەچوارچێوە گەلێکی وەک ئیسپانیای سەدەکانی ناوەڕاستدا ڕوویداوە، واتە ئیسپانیا لە ماوەی سەدەکانی ناوەڕاست و لە وێستگەیەکی گرنگی وەک ئەندەلوسدا شاهیدی هاوکاری نێوان ئایینەکان بوو. کە زانایانی موسڵمان و جولەکە و مەسیحییەکان پێکەوە خەریکی ئاڵوگۆڕی ڕۆشنبیریی و خوێندن بوون. ئەم دەستپێشخەرییانە ئاسانکارییان بۆ لێکتێگەیشتن و هاوکاری دەکرد، واتە یەکێتی نێوان جۆراوجۆرێتییەکانی بەهێز دەکرد. هەروەها ئیمپراتۆریەتی مەغۆلەکان لە هیندستان شاهیدی دەستپێشخەرییەکانی پێکەوەژیانی نێوان ئایینەکان بوون، چونکە فەرمانڕەواکانی هەوڵیان دەدا ژینگەیەک دروستبکەن، کە هاندەری لێکتێگەیشتن بێت لە نێوان هیندۆس و مسوڵمانەکاندا.

### خێرخوازیی و ڕەفتاری کۆمەڵایەتی ئەرێنییانە

بەدرێژایی مێژوو ئایینەکان هەمیشە هاندەری کاری خێرخوازیی و خۆبەخشیی بوون. دامەزراندنی نەخۆشخانە و دامەزراوە خێرخوازییەکان لەلایەن گرووپ و دامەزراوە ئاینییەکانەوە بەرجەستەکاری ئەوەبوون، کە چۆن باوەڕ لە پشت خۆشگوزەرانی و ئاسایشی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەوەبوون. دیارە دامەزراندنی دامەزراوە خێرخوازییەکان لەلایەن گرووپە ئاینییەکانەوە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، وەک نەخۆشخانەی سوارەکان، ئەوە نیشان دەدات کە چۆن پاڵنەری ئایینی لەڕێگەی کاری خێرخوازییەوە بەشداری لە خۆشگوزەرانی کۆمەڵگەدا کردووە. ئەم دەستپێشخەرییانە پێداویستییە کۆمەڵایەتییەکان لەبەرچاو دەگرن و هەستکردن بە (بەرپرسیارێتی هاوبەش) بەهێزدەکەن.

### دووەم: پەرتکردنی کۆمەڵگە

لێرەدا هەوڵدەدەین بەوردی لە مێژوو ڕابمێنین، بۆئەوەی بتوانیین پەی بە کاریگەرییە قووڵەکانی ئایین لەسەر پەرتبوونە کۆمەڵگەییەکان ببەین. لە ڕێگەی لێکۆڵینەوەیەکی ورد بۆ سەردەمە مێژووییەکان و ئاینزا و ئایینەکان و بزووتنەوە کۆمەڵایەتی و کەلتوورییەکان، ئەم لێکۆڵینەوەیە تیشک دەخاتە سەر ئەو ڕێگە جۆراوجۆرانەی کە بیروباوەڕە ئاینییەکان بۆ کارتێکردن بەکاری دەهێنن. هەم وەک هاندەر و و هەم وەک کەناڵگەلێک بۆ پەرتکردنی کۆمەڵگەکان، جا بە شوێنپێهەڵگرتنی

هەنگاوەکانی کاریگەریی ئایینی لەسەر کۆمەڵگە و ژیارە جیاوازەکان، هەوڵدەدەین پەردە لەسەر ئەو هێزە بنەڕەتییانە لابدەین، کە بەردەوام کاریان لەسەر پەرتکردنەکان کردووە، ئەویش بە لێکۆڵینەوە لە یەکتربڕینەکانی ئایین و دەسەڵات و بونیادە کۆمەڵایەتییەکان، کە تێگەیشتنێکی قووڵتر لەو پرسەدا فەراهەم دەکەن.

## جیاوازیی تێگەیشتن

زۆرجار جیاوازییە بیروباوڕییەکان دەبنە هۆی پەرتکردن، ئەمیش دەبێتە هۆی دروستبوونی کۆمەڵی ئایینی جیامەند، کە دەتوانێت کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر پێکهاتە و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان هەبێت. ڕەنگە جیاوازییە تیۆلۆژییەکان لە مومارەسە ئایینییەکان زیاتر درێژببنەوە و کاریگەرییان لەسەر ڕەهەندە سیاسی و ئابووریی و کەلتوورییەکان هەبێت و لە دابەشبوونە کۆمەڵایەتییەکاندا پشکداریی بکەن و ڕەوتی ڕووداوە مێژووییەکان دیاری بکەن.

بۆ نموونە پەرتبوونی گەورەی ساڵی ١٠٥٤ بووە هۆی دابەشبوونی ئایینی مەسیحی بەسەر کڵێسەی ئۆرتۆدۆکسی خۆرهەڵات و ڕۆمانی کاسۆلیکی. واتە دابەشبوونەکە تەنیا دابەشبوونێکی لاهووتی نەبوو. بەڵکو لەگەڵ ئەوەشدا ڕەنگدانەوەی جیاوازییە سیاسیی و کەلتوورییەکانی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا بوو. دواتر سەرهەڵدانی ئایینزای پرۆتستانت وەک وەڵامێک بۆ (تێگەیشتنە بەرژەوەندیخوازەکانی پیاوانی ئایینی کڵێسە) و بەرزبوونەوەی ئەندازەی گەندەڵیی لەناو کڵێسەی کاسۆلیکی، بووە هۆی پەرتکردنی یەکێتی کیشوەری ئەورووپی کاسۆلیکی و دەوڵەتەکانی ئەورووپای بەسەر دوو کۆمەڵی کاسۆلیک و پرۆتستانت دابەشکرد.

لە بەرامبەریشەوە وەڵامی کڵێسەی کاسۆلیکی بۆ چاکسازیی پرۆتستانت، کە بە (دژە چاکسازیی) ناسرابوو، مەبەست لێی سەقامگیرکردن و بەهێزکردنی کاریگەریی ئاینزای کاسۆلیکی بوو. ئەمەش بووە هۆی پەرەسەندنی کێبڕکێی ئایینزایی و زیادبوونی دووبەرەکی لەناو کۆمەڵگە ئەورووپییەکاندا.

## تائیفەگەریی ئایینی

دابەشبوونە تائیفییەکانی ناو ئایینەکان دەتوانن ببنە هۆی پەرتکردن و دابەشبوونی کۆمەڵگەکان. بۆ نموونە دابەشبوونی نێوان سوننە و شیعە لە ئیسلامدا، کە ڕووداوێکی مێژوویی وەک شەڕی کەربەلا لە ساڵی ٦١ ک زەقیکردەوە، گرژیی و ململانێکانی لەناو جیهانی ئیسلامدا تاودا. دواتر ئەم دابەشبوونە لە ململانێی جیۆپۆلەتیکییەکانی

ناوچەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا ڕۆڵی بەرچاوی گێڕاوە. بۆیە دابەشبوونی سوننە و شیعە نەک هەر شوێنەواری بیروباوەڕیی (عقائدی) جێهێشتووە، بەڵکو کاریگەریی لەسەر جوڵە و بزووتنەوە سیاسیەکانی بەشی زۆری ناوچە جیاوازەکان هەبووە و گرژییە بەردەوامەکانی بەهێزتر کردووە و ڕۆڵی بەرچاوی لە ناتەبایی کۆمەڵایەتیدا گێڕاوە. دیارە کارلێکی نێوان شوناسی ئایینی و دەسەڵاتی سیاسی لە ڕێڕەوی مێژوویی ئەم کۆمەڵگایانەدا ڕوون و ئاشکران.

### حەزی ئێتنۆ- ئایینی:

زۆرجار ئایین ڕۆڵێکی چارەنووسساز لە دارشتنی شوناسی تاک و کۆمەڵدا دەگێڕێت. لەبەرئەوە خەڵکی لایەنگیریی لە گرووپێکی ئایینی دەکەن، چونکە وەک بەشێک لە شوناسەکەیان لێیدەڕوانن. دواتر ئەم خۆ ناساندنە دەتوانێت بەشداربێت لەو دابەشبوونانەدا کە لەسەر بنەڕەتە ئایینییەکان دروستبوون. لێرەوە بیروباوەڕی ئایینی لەسەر بنەمای ڕەگەز، کە گرووپێک خۆی بە باڵاتر لەڕووی ڕۆحی یان ئاکارییەوە دەبینێت، دەتوانێت ئاگری کارە دوژمنکارییەکان خۆشبکات. ئەم جۆرە تێڕوانینانە عەقڵیەتی (ئێمە بەرامبەر ئەوان) دروستدەکات، دابەشبوونی کۆمەڵگەکان گەورەتر دەکەن و ڕێگریی لە گەشەپێدانیی کۆمەڵگە گشتگیر و هاوسەنگەکان دەکەن. واتە جیاوازی بیروباوەڕ و ڕێورەسم و سرووتە ئاینییەکان، زۆرجار کۆمەڵگەی ئایینی جیاواز دروست دەکەن. بۆ نموونە جەنگی خاچپەرستەکان ئەوە بەرجەستە دەکات، کە چۆن دەتوانرێت باڵادەستی ئایینی وەک چەکێک بۆ بەدەستهێنانی قازانجی جیۆپۆلەتیکیی و ئابووری بەکاربهێنرێت. دیارە کە جەنگی خاچپەرستەکان (سەدەی ١١ و ١٣) بەهۆی پاڵنەرە ئایینییەکانەوە جۆشی سەند، کە ڕەنگدانەوەی هەستکردنی مەسیحییەکان بوو، بە باڵادەستییان بەسەر موسڵمانەکاندا. ئەم پاڵنەرە تەنیا ئایینی نەبوو، بەڵکو هۆکارە کەلتووریی و ئابوورییەکانیش زیاتر پشکۆکەی دەگەشاندەوە.

### ئایین و کۆلۆنیالیزم

سەپاندنی ئایینێکی هەژموونداری لە سەردەمی کۆلۆنیالیزمدا دەتوانێت ببێتە هۆی دروستکردنی چینی کۆمەڵایەتیی نوێ و دابەشبوون لەسەر بنەمای شوناسی ئایینی بەدیدێنێت. ئەم دیاردە مێژووییە جەخت لەسەر کارلێکی نێوان پەیکەری دەسەڵاتی ئایینی و سیاسی دەکاتەوە، کە کاریگەرییەکی بەردەوامی لەسەر کۆمەڵگاکانی دوای کۆلۆنیالیزم هەبوو. تەنانەت تا ئێستاش ئەو میراتە کۆلۆنیالیزمییە لە زۆرێک لە

ناوچەکاندا بەردەوام کار لەسەر بزووتنەوە ئایینیی و دابەشبوونە کۆمەڵگەییەکان دەکات. بۆ نموونە بەزۆریی داگیرکەرە ئەوروپییەکان ئایینەکانیان بەسەر ناوچە داگیرکراوەکاندا دەسەپاند، کە جیاوازییە کۆمەڵگەییەکانیان فراوانتر و پشکدارییان لە پێکدادانی کەلتووریدا دەکرد. دیارە سەپاندنی ئایین کاریگەرییەکی درێژخایەن لەسەر شوناسی کۆمەڵگە ژێردەستەکان بەجێدەهێڵێت.

## پێکدادانی کەلتووریی

ڕەنگە ڕووداوە مێژووییەکان و نەریتە کەلتوورییی و ملمانێ درێژخایەنەکان شێوازی هەستکردن و بەهێزکردنی ناسنامە ئایینییەکان پێکبهێنن. دوژمنایەتییە مێژوویییە ڕەگداکوتاوەکان دەتوانن ماوەی نێوان دابەشبوونە بەردەوامەکانی نێو کۆمەڵگە جیاوزەکان فراوانتر بکەن. بۆیە پێکدادانی کەلتووریی کە زۆرجار ڕەگ و ڕیشەی لە جیاوازی ئایینیدا هەیە، دەتوانێت کۆمەڵگەکان دابەش بکات. ڕووداوەکانی پێش و کاتی دابەشبوونی هیندستان تیشک دەخەنە سەر ئەوەی کە چۆن جیاوازییە ئایینییە ڕەگداکوتاوەکان، دەتوانێت ببێتە هۆی گۆڕانکاریی جیۆپۆلەتیکی گەورە، کە گرژییەکی بەردەوام لەنێو کۆمەڵگە ئاینییەکاندا دروستدەکات. لێرەوە یەکتربڕینی ئایین و کەلتوور و سیاسەت ڕۆڵی سەرەکی لە داڕشتنی دیمەنی دوای سەربەخۆیی هیندستاندا گێڕا. واتە دابەشبوونی هیندستان لە ساڵی ١٩٤٧ لەسەر بنەڕەتە ئایینییەکان، بووە هۆی دروستبوونی هیندستانێکی زۆرینەی هیندۆسی و پاکستانێکی زۆرینەی موسڵمان. دابەشبوونەکە ترۆپکی ئەو گرژییە ئایینییە مێژوویییانە بوو، کە بەهۆی سیاسەتە کۆلۆنیالیزمەکانەوە توندتر بوون.

## ناسیۆنالیزمی ئایینی

ناسیۆنالیزمی ئایینی، کە شوناسی ئایینی تێکەڵ بە خواستە سیاسییەکان کردووە، دەتوانێت لە پارچەپارچەکردن و ملمانێی کۆمەڵگەدا بەشداربێت. لەم جۆرە زەمینانەدا ئایین دەبێتە فاکتەرێک بۆ دیاریکردنی شوناسی نەتەوەیی، دووبەرەکییەکان چڕتر دەکاتەوە و ڕێگری لە هەوڵەکان بۆ گەیشتن بە لێکتێگەیشتنێکی گونجاو دەکات. بۆ نموونە لە هەندێک ناوچەی ئەوروپادا شوناسی ئایینی پەیوەندییەکی بەهێزی بە ناسنامەی نەتەوەییەوە هەبوو. بەستنەوەی پرۆتستانتیزم بە دەوڵەتی نەتەوەییەوە، وەک ئەوەی لە وڵاتانی ئەسکەندیناڤیا و بەشێک لە باکووری ئەوروپا ڕوویدا، واتە پشکداریی لەو دابەشبوونانەدا کرد،

کە لەسەر بنەڕەتە ئایینی و نەتەوەییەکان دروستبببوون، دواتر ململانێی قەوارەی زایۆنیزم و فەلەستین ئەوە دەردەخات، کە چۆن داواکارییە هەرێمایێتیی و نەتەوەیی و شوناسە ئایینییەکان دەتوانن پەرتبوونی کۆمەڵگەیی بەردەوام دروستبکەن.

بەواتایەکی تر ململانێی قەوارەی زایۆنیزم و فەلەستین بۆ هۆکارگەلێکی ئایینی و ناسیۆنالیستی دەگەڕێندرێتەوە، داواکاریی زەوی پەیوەندییەکی بەهێزی بە شوناسە ئاینییەکانەوە هەیە. دروستکردنی دەوڵەتی ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٤٨ خاڵێکی سەرەکی مشتومڕ و خاوەن شوێنەواری قووڵی ئایینی و جیۆپۆلەتیکی بووە.

**دەقگەرایی ئایینی**

سەرهەڵدانی دەقگەرایی ئایینی لە ئایینە جۆراوجۆرەکاندا، کە بە پابەندبوونە توندەکەیان بە بیروباوەڕە ئاینییەکەیانەوە دەناسرێنەوە و بەرەنگاریی هەموو نوێیەک دەکەن. نموونەی سەرهەڵدانی دەقگەرایی مەسیحی لە ئەمریکا یان دەقگەرایی ئیسلامی لە خۆرهەلاتی ناوەڕاست.

> **نەریتە ئاینییەکان ڕۆڵێکی کاریگەر لە کەمکردنەوەی دڵەڕاوکێ و نادڵنیایی لە کۆمەڵگەدا دەگێڕن.**

دەقگەرایی دەتوانێت بە پاراستنی لێکدانەوە توندەکانی دەقە ئاینییەکان بەرەنگاری گۆڕانکارییە کۆمەڵگەییەکان ببێتەوە و بەشداری لە دابەشبوونەکان بکات. زۆرجاریش لە دژایەتییکردنی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە پێشکەوتنخوازەکاندا خۆی دەردەخات و دەبێتە هۆی پێکدادانی کەلتووریی و قووڵبوونەوەی دابەشبوونە کۆمەڵگەییەکان. لێکۆڵینەوە لە زەمینەی مێژوویی بزووتنەوە دەقگەراییەکان، تێڕوانینێکی ورد بۆ بزووتنەوەی جەمسەرگیرییە کۆمەڵگەییەکان و ئەو ئاڵنگارییانەی کە ڕووبەڕووی کۆمەڵگە فرەییخوازەکان دەبنەوە، فەراهەم دەکات. ئەوەش فەرامۆش نەکەین کە ئەم بزووتنەوە دەقگەراییانە بەهۆی ڕووکەشێتیی تێگەیشتننە ئاینییەکانیانەوە زۆرجار بەدەست کارەکتەرە سیاسییەکانەوە دەبنە داشی یاریپێکردن.

## جیاکاریی ئایینی

جیاکاریی لەسەر بنەمای شوناسی ئایینی دەبێتە هۆی دروستکردنی گرووپی پەراوێزخراو، ئەمەش دەبێتە هۆی بەردەوامبوونی دابەشبوونە کۆمەڵایەتییەکان. نموونە مێژووییەکانی جیاکاریی ئایینیش جەخت لەوە دەکەنەوە کە چۆن لایەنگیرییەکان دژ بە کۆمەڵگەگەلێکی ئایینیی جیاواز دەتوانێت لێکەوتەی دوور مەودای هەبێت و ڕێگری لە یەکگرتوویی کۆمەڵایەتی دەکات. بەردەوامبوونی مومارەسە جیاکارییەکان بەدرێژایی مێژوو پرسیار لەبارەی ڕۆڵی ئایین لە دارشتنی بزووتنەوەی دەسەڵات لەناو کۆمەڵگەکاندا دەوروژێنێت.

بۆ نموونە جیاکاریی لە دژی کەمینە ئایینییەکان، وەک دژایەتییکردنی جوولەکەکان لە قۆناغگەلێکی مێژوویی جیاوازدا و دژایەتییکردنی موسڵمانەکان لە کۆمەڵگەگەلێکی وەک ئیسپانیای دوای کەوتنی ئەندەلووس و مسوڵمانەکانی میانمار، بووەتە هۆی ستەمکارییەکی بەرنامەبۆداڕێژراو. بۆ نموونە دادگاکانی پشکنینی ئیسپانیا لە سەردەمی کۆنترۆڵکردنی ئیسپانیادا جولەکەکان و موسڵمانانی کردبووە ئامانج.

## ململانێی ئاینزایی و ئایینییەکان

زۆرجار ململانێی نێوان ئاینزا و ئایینەکان کاتێک سەرهەڵدەدات، کە جیاوازییە ئایینییەکان بە سیاسی دەکرێن. بۆ نموونە جەنگی سی ساڵە (١٦١٨-١٦٤٨) کە ململانێیەکی خوێناوی نێوان دەوڵەتانی کاسۆلیک و پرۆتستانت بوو، بووە هۆی وێرانکارییەکی بەرفراوان لە تەواوی کیشوەری ئەوروپا. ئەو جەنگە ئەوە دەردەخات کە چۆن پەیوەندییە ئایینییەکان دەتوانن لەگەڵ ململانێ سیاسییەکان تێکەڵ ببن و ململانێی درێژخایەنیان لێدەکەوێتەوە و ئاڕاستەی بزووتنەوەی مێژوو بگۆڕن، هەرچەندە ئاشتی وێستڤالیا لە ساڵی ١٦٤٨ کۆتایی بە جەنگەکە هێنا، بەڵام ئەو جەنگە کاریگەرییەکی بەردەوامی لەسەر دیمەنی ئایینیی ئەوروپا بەجێهێشت. واتە کۆتایی هاتنی جەنگ لەگەڵ ئاشتی وێستڤالیا بناغەی بۆ چەمکە مۆدێرنەکانی وەک (سەروەری دەوڵەتان) دانا، بەڵام تیشکیشی خستە سەر کاریگەرییە بەردەوامەکانی دابەشکارییە ئایینییەکان.

لێرەدا دەبێت ئەوەش بڵێین کە پەیماننامە و ڕێککەوتننامەکانی ئاشتی، وەک ئاشتی ئۆگسبورگ (١٥٥٥) و ئاشتی وێستڤالیا (١٦٤٨)، هەوڵیاندا چوارچێوەی

پێکەوەژیانی نێوان دەوڵەتانی کاسۆلیکی و پرۆتستانت دابمەزرێنن، بەڵام ئەم ڕێککەوتنانە بوونە هۆی قبوڵکردنی نافەرمی دابەشکارییە ئاینییەکان نەک بەرەوپێشبردنی یەکێتی ڕاستەقینە. سەبارەت بە کۆمەڵگە و مێژووی ئیسلامیش هەمان تێڕوانین بۆ ململانێ وجەنگەکانی نێوان هەوادارانی ئیمامی عەلی و معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ڕاستە، کە دواتر کۆمەڵگەی ئیسلامی بۆ دوو کۆمەڵگەی ئایینزایی دژ بەیەک پەرتکرد و تا ئێستاش شوێنەوارەکانی لە کۆمەڵگە مسوڵماننشینەکاندا مێژوو ئاڕاستە دەکات.

لەکۆتاییدا دەتوانین بڵێین، تێگەیشتن لەوەی کە ئایین چۆن کۆمەڵگە پەرتەکان یەکدەخات، پێویستی بە دووربینییەکی مێژوویی هەیە، کە ڕۆڵی پەرەسەندنی بیروباوەڕ و دامەزراوە ئاینییەکان لە سەردەمە جیاوازەکاندا وەک خۆیان ببینێت. لەکاتێکدا دان بە کاریگەرییە ئەرێنییەکاندا دەنێت، هاوکات زەمینەی مێژوویی ئاڵۆزییەکانیش ئاشکرا دەکات، لەوانەش ئەو نموونانەی کە جیاوازییە ئایینییەکان دەبنە هۆکاری دروستکردنی ململانێ و جەنگە خوێناوییەکان. کارلێکی نێوان ئایین و یەکێتی کۆمەڵگەیی دینامیکییە، کە بەهۆی ڕووداوە مێژووییەکان و گۆڕانکارییە کەلتوورییەکان و لێکدانەوەکانی بیروباوەڕە ئایینییەکانەوە لە سەرانسەری شارستانێتییە جۆراوجۆرەکاندا پێکدێت.

هاوکات کاریگەری ئایین لەسەر (دابەشبوونی کۆمەڵگە) دیاردەیەکی فرەڕەهەندە و بە قووڵیی لەگەڵ ڕووداوە مێژووییەکان و بزووتنەوە کەلتووریی و پەیکەرە سیاسییەکان تێکەڵبووە. ئەو نموونانەی کە پێشکەشکران ئەوە دەردەخەن، کە چۆن جیاوازییە ئایینییەکان ڕۆڵی سەرەکییان لە دارشتنی ڕەوتی کۆمەڵگەکاندا هەبووە، هاوکات کاریگەرییان لەسەر دیمەنە جیۆپۆلیتیکییەکان و بەردەوامبوونی گرژییەکان جێهێشتووە. تێگەیشتن لەم نموونە مێژووییانە و بنەڕەتە کۆمەڵایەتییەکانیان بۆ بەهێزکردنی گیانی لێبوردەیی و گفتوگۆی کراوە و پێکەوەژیان لە کۆمەڵگە فرەڕەنگ و دەنگەکاندا گرنگە.

## سەرچاوەکان


١) ارنولد توينبي: مختصر دراسة للتاريخ، (ترجمة: فؤاد محمد شبل)، ج١، ط١، ١٩٦١.

٢) ج. ويلتر: الهرطقة في الغرب، تاريخ البدع والفرق الدينية المسيحية، ت: جمال سالم، دار الفارابي، بيروت، ٢٠٠٧.

٣) جوزيف بيريز: التاريخ الوجيز لمحاكم التفتيش باسبانيا، ت: مصطفى امادي، كلمة، ط١، ابوظبي، ٢٠١٢.

٤) حسن ابراهيم حسن: تاريخ الاسلام السياسي والديني والثقافي والاجتماعي، مكتبة النهظة المصرية، ج١و٢.

٥) ريتشارد هاواي: مختصر تاريخ الأديان، ت: محاسن عبدالقادر، دار الكتب العلمية، ط١، ٢٠٠٨.

٦) صائب عبدالحميد: تاريخ الاسلام السياسي والثقافي مسار الاسلام بعد الرسول ونشأة المذاهب، مركز الغدير للدراسات الإسلامية، ط١، ١٩٩٧.

٧) عبد الكافي الصطوف واخرون: دراسات في تأريخ أوربة في العصر الحديث، جامعة دمشق، ١٩٩٨.

٨) غنار سكيربک و نلز غيلجي: تاريخ الفكر الغربي من اليونانية القديمة إلى القرن العشرين، ت: حيدر حاج اسماعيل، المنظمة العربية للترجمة، ط١، بيروت، ٢٠١٢.

٩) فرنان بروديل: قواعد لغة الحضارات، ت: الهادى التيمومى، المنظمة العربية للترجمة، ط١، بيروت.

١٠) فرنان بروديل: ديناميكية الرأسمالية، ت: شفيق محسن، دار الكتاب الجديدة المتحدة، ط١، بيروت، ٢٠٠٨.

١١) كارلتون هيز: التاريخ الاوروبي الحديث، (ترجمة: فاضل حسين)، جامعة الموصل.

١٢) كريس هارمان: تاريخ شعبي للعالم، ت: طلعت الشايب، المركز القومي للترجمة، الجزء الأول والثاني، ط١، ٢٠١٩.

١٣) مالك بن نبى: ميلاد مجتمع شبكة العلاقات الاجتماعية، ت: عبدالصبور شاهين)، دار الفكر، ط٣، دمشق، ١٩٨٦.

١٤) محمد حبيدة: تاريخ أوروبا من الفيودالية إلى الأنوار، جامعة محمد الخامس أكدال، ط١، ٢٠١٠.

١٥) نور الدين حاطوم: تاريخ العصر الوسيط في أوربة، الجزء الأول، دار الفكر.

١٦) هربت فيشر: اصول التآريخ الآوروبى الحديث من النهضة الآوروبية الي الثورة الفرنسية: ت: زينب عصمت الراشد و احمد عبدالرحيم مصطفى، دار المعارف بمصر، ١٩٦٢.

١٧) پەيتەرکلۆس: ئەنترۆپۆلۆژی کلتووری، (و: خەلیل محەمەد شلّماشی)، چ١، چاپخانەی بەدرخان، سلێمانی، ٢٠٠٢.

١٨) عیمادەدین خەلیل: دەروازەیەک بۆ مێژووی ئیسلامی، و: زانا محەمەد ئەمین سەعید، چ١، سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری، ٢٠١٩.

ڕاگەیاندن لە زۆربەی کۆمەڵگەکاندا ئامڕازێکی کاریگەری دروستکردنی پێکەوەژیان و بەرقەراربوونی ئاشتی و ئاسایشی نیشتیمانی و کۆمەڵایەتییە، بەڵام ئەمە لەکاتێکدا دەبێت کە زمان لە دەستوور و یاسای وڵاتدا بەهەندوەرگیرابێت و ڕێکاری بەکارهێنانی وەک بنەمایەکی پێکەوە ژیان بۆ دیاری کرابێت. لەهەمانکاتیشدا سیستمی پەروەردە و میدیاش خرابێتە خزمەتی دروستکردنی زمانێکی گونجاو بۆ پێکەوەژیان. پێچەوانەکەشی ڕاستە کە زمان وەک ناسنامە، وەک زمانی گفتوگۆ، وەک وشە و دەستەواژەی بەکارهێنان و وەک لێکتێنەگەشتنی نێوان تاکەکان و گۆمەڵگەکان بووەتە سەرچاوەی پشێویی و ململانێ و دروستکردنی قەیران و تێکدانی ئاسایشی نیشتیمانی و نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی بەتایبەتی لەو وڵات و کۆمەڵگایانەی کە بە قۆناغی گواستنەوەدا تێدەپەڕن و فرەنەتەوە و فرەزمان و فرەئایین و فرە ڕەچەڵەکن، وەپاشخانێکی مێژوویيان لە جەنگ و ململانێدا هەیە.

دەنگ و بابەتە میدیاییەکان بە بەرهەمی جۆراوجۆر لە گۆرانیی و میوزیک و شانۆ ئەو بەرهەمانەی نمایشی هەڵسوکەوتی مرۆڤ دەکەن دەتوانرێت ڕۆڵی هەبێت لە دروستکردنی ئاشتی و پێکەوەژیان.

Siddiq,M دەڵێت»زمان توانای هەیە سنوور دروستکات لە نێوان مرۆڤەکان، فیزیکی و جیۆگرافی نموونەی ئەوەی پاکستان و هندستان دێنێتەوە.«

Pagel, M. ئەڵێت»من باسی زمانی مرۆڤەکان دەکەم، چونکە بەهۆی زمانەوە بیرکردنەوەکانت گوزارشت لێدەکەیت و ڕاستەوخۆ بۆ مێشکی یەکێکی تر دەنێریت«.

Siddiq,M,« لە هەموو پرۆسەیەکی بنیاتنانی ئاشتی و گواستنەوەی ململانێی، زمان ڕۆڵی گەورەی هەیە لە گۆڕینی ململانێ و شیکردنەوەی ململانێ، لە برینداریيەوە بۆ چاکبوونەوەی برینەکان لە ئەرکی وەک نێوەنگیرییەک تاکو توانای سازاندن. لە دروستکردنی دابڕان تاکو دروستکردنی پێکەوەژیان، لە نامۆبوونەوە بەرەو ئالودەبوون، لە ناڕازیبوونەوە بەرەو واژۆکردن، لە ڕەتکردنەوە بەرەو وەرگرتن ، لە داڕووخاندنەوە بەرەو هاندان، لە جەنگەوە بەرەو ئاشتی، لە ئاشتی بنیاتنانەوە بەرەو ئاشتی بە کلتوورکردن، لە هەموو ئەو پرسانەدا زمان دەتوانێت پردی پەیوەندی بێت«. هەروەها دەڵێت: ئەوەی لە پشت هەموو ئەو ململانێ و توندتیژیانەوەیە کە چوار دەیەیە لە ئەفغانستان بەردەوامە، هۆکاری سەرەکی

زمانی میدیا و کۆمینیکەیشنە».

Elworthy. لەبارەی توندوتیژییەوە دەڵێت:» توندوتیژی کاریگەری دەکاتە سەر مرۆڤ و توانای پێدانی زمانی بۆ دەربڕینی وشەی ناخۆش». هەروەک بەپێچەوانەشەوە دەڵێت: وشە ناخۆشەکان و توندەکان هۆکاری توندوتیژییە جەستەییەکانە.»

Fairclough دەڵێت:» زمان بەشێکە لە ناسنامە لەسەر ئاستی کەسی، کۆمەڵگەیی، نێودەوڵەتی، لەلایەکەوە دەتوانێت کەسەکان نزیک بکاتەوە، لەیەکی دیکەوە دووریشیان بخاتەوە، دەتوانێت ببێتە دیوار لە نێوانیان، دەشتوانێت هەمووان لە یەک شوێندا کۆبکاتەوە و بیانکات بە جیهانێک. نموونەی ئەو شۆڕشە درێژخایەنە دەهێنیتەوە دوای دابەشبوونی پاکستان و دواتر دروستبوونی بەنگلادیش، دواتر داوای ناساندنی زمانی بەنگلادیشی وەک زمانی دووەمی فەرمی وڵات، کە لە ١٩٤٨ - ١٩٧١ کە سەربەخۆییان وەرگرت لەژێر ناوی زمان ١٩٧١، هەروەک چۆن سەربەخۆییان وەرگرت لەژێر ناوی ئایین لە ساڵی ١٩٧٤، بەڵام دوای شەڕ و کوشتار و دروستبوونی دیوار لە نێوان خەڵکەکە بۆماوەی هەشت ساڵ. ئەوەشی سەلماند کاتێک زمان دەبێتە ناسنامەی نەتەوەیەک دەتوانێت یەکیان بخات، دەشتوانێت دابەشیان کات(فیزیکی و جیۆگرافی).

Paul Lederach پێیوایە ململانێ سرووشتێکی ژیانە، بەڵام چارەسەری ململانێ هونەرە، ئەو هونەرەش پێویستی بە زمان و گتفوگۆی باش هەیە، ئەگەر کۆمینیکەیشن و زمانی باش بەکارهات، پێداویستییەکانی وەرگر یەکیگرت لەگەڵ ئایدیا پێشنیازکراوەکان ئەوە ئەو ململانێیە کەم دەبێت و بۆ لێکنزیکبوونەوە و گونجاندن دەڕوات، ئەگەر باش نەبوو ئەوا بەرەو توندتیژی دەچێت.»

Liddicoat دەڵێت: «بۆئەوەی ڕێگری لە ململانێ و گرژی بکەین، پێویستە پلانمان بۆ زمانی ڕاگەیاندن هەبێت، بەڵام بەداخەوە مەسەلەی ئاسایشی نیشتمانی لە زۆربەی پلانی ڕاگەیاندنی وڵاتەکاندا بوونی نییە.» . «Hussain,N دەڵێت: لەگەڵ ئەوەی ڕاگەیاندن دەسەڵاتی بەهێز بووە لە مێژووی کۆمەڵگەکان و سەرچاوەی زانیاریی و مەعریفەی تاکەکان بووە، لە کۆمەڵگەی مۆدێرن توانایەکی بناغەیشی هەیە لە ژیانی سیاسیدا، بەتایبەتی لەوکاتەوە وەک ئامرازێک بۆ پڕوپاگەندە و جەنگەکان بەکارهات ، ئیتر ڕاگەیاندن بووە هۆکاری دروستکردنی

ڕا، بۆچوون ، هەروەها دروستکردنی پاڵەوان، شەڕەنگێز و دڕندە و دوژمن.»
Hussain,N ئاماژەوە بەوە دەکات، کە ئەمڕۆ بەکارهێنانی ڕۆژنامەنووس و ڕاگەیاندن لە جەنگدا بۆ پێدانی ئاستێکی جیهانییە و بۆ پیشاندانی جەنگەکەیە بە جیهان بەوشێوەی دەسەڵاتداران دەیانەوێت، ئەو نموونەی جەنگی کەنداو دەهێنێتەوە، کە چۆن ڕۆژنامەنووس و ڕاگەیاندن تەوزیف کران بۆ پیشاندانی جیهان و ڕەهەندەکان و وێنەکانی جەنگەکە.

Puddephatt, A دەربارەی ڕۆڵی میدیا دەڵێت:» ڕاگەیاندن ڕۆڵی کاریگەری هەیە بە هەردوو ئاڕاستەکە لە جەنگ و ململانێ و گرژییەکاندا، ئیتر بە بوونی بە بەشێک لە ململانێکە و بە ئاڕاستەی لایەنی ململانیکان بردنی یان بە سەربەخۆیی و وەستان و هەوڵی هێورکردنەوە و چارەسەر».

**بۆئەوەی ڕێگری لە ململانێ و گرژی بکەین، پێویستە پلانمان بۆ زمانی ڕاگەیاندن هەبێت**

هەمان ڕاپۆرت باسی کۆنفرانسێکی ئەم ڕێکخراوە دەکات لە ساڵی ٢٠٠٤ کە تایبەتی کرد بە› گەشەسەندنی میدیا و پاراستنی ئاشتیی و هاوکارییە مرۆییەکان›، کە کۆی باسەکانی (نزیکەی ٥٠ ڕۆژنامەنووسی جیهانی کۆکردبوویەوە) لەسەر ئەوەبوو چۆن میدیا لە نێوان ئەم چەمکانەدا ئیش بکات. ئەو وڵاتانەی بە قۆناغی گواستنەوەدا دەڕۆن یان سەربەخۆیی وەردەگرن ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان گرنگیان پێ دەدەن بۆ پاراستنی ئاسایش لە بەردەم میدیادا.

Hussain,N. دەڵێت:» لە پێشدا ڕۆڵی میدیا بریتی بوو لە گەیاندنی زانیاریی و مەعریفە کۆمینیکەیشنی نێوان خەڵک و حکومەت، بەڵام لە ئێستادا ئەو ڕۆڵە گۆڕانکاری بەسەردا هات و فراوان بوو ، لە ئێستا سیاسییەکان ئەکتەری ناو ژینگە و بابەتە میدیاییەکان و ئەوان وێنای گوتار و سەردێری هەواڵەکان دەکەن". زیاتریش باسی ڕۆڵی سیاسییەکان دەکات لەناو میدیادا و دەڵێت:» میدیا

وێنای گوتارەکانی خەڵک و سیاسییەکان دەکات لەکاتی قەیران و گرژییەکانیشدا سیاسییەکان بڕیاردەرن و بۆچوونەکانیان زەق دەکرێتەوە لەلایەن میدیاوە، لەکاتێکدا هەریەک لەو سیاسییانەش ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بەرهەمهێنەری ململانێ و توندوتیژییەکانن، هەربۆیە گوتارە توندەکانی ئەوان وێنا دەکرێت لەناو میدیادا».

Hussain,N: «دەڵێت میدیا لە ساڵی ١٩٨٠وە بووەتە ئەکتەرێکی گونجاوی ناو سیاسەت نەک تەنها لەسەر ئاستی ناوخۆیی، بەڵکو بەهۆی گلۆباڵیزەیشنەوە وێنای سیاسەتی نێودەوڵەتیش دەکات.

Philo دەڵێت:» تەلەفزیۆن سەرچاوەی هەواڵی لە ٨٠٪ خەڵکی فەلەستین و ئیسرائیلە، بۆ ململانێی ئیسرائیل و فەلەستین، بەڵام ئەوەی پیشانی دەدرێت هێندەی ئەوەی ڕقی دروستکردووە بۆیان ئەوەندە نەیتوانیوە دیبەیتێکی جەماوەری دروستبکات بۆ لێکتێگەیشتن کە هۆکار و ئاسەوار ئەو ململانێ چییە.

Philo دەڵێت: «هەڵبژاردنی وشە لەکاتی نووسینی هەواڵ و بابەتە میدیاییەکان و ئەو دەربڕینانە ڕۆڵی خۆی هەیە، نموونە دەهێنێتەوە و دەڵێت: جیاوازی هەیە لە نێوان›مات› و ‹توفی› و لە نێوان (قتل واستشهد)›ە، دەڵێت زۆر وشە لەکاتی ئاسایی بوترێت جیاوازە لەگەڵ ئەوەی لەکاتی جەنگ و ململانێ بوتریت.

ڕێکخرای دادپەروەریی و وردبینی ئەمریکی ڕاپۆرتێک ئامادە دەکات لەسەر ئەو زمانەی کە بەکاردێت بۆ جەنگی ئیسرائیل و فەلەستینی لەلایەن میدیاکانی فەلەستین و ئیسرائیل خۆیان و ئەو میدیایانەی پشتیوانی هەریەکە لەمانەیە، باسی ئەوە دەکات ئەو وشانەی کە بەکاردێن چۆن هۆکارە بۆ بەردەوامی ئاڵۆزییەکانی نێوانیان.

بی بی سی، ڕاپۆرتێکی ئامادەکردووە لەسەر ئەو وشانەی ڕۆژنامەنووسە فەلەستینی و ئیسرائیلییەکان بەکاریدەهێنن دژی یەک تر و دەڵێت: وشەکانی «الوحشية» و «القتل الوحشي» و «القتل الجماعي»، «القتل الوحشي بدم بارد» و «الإعدام» ثم «الذبح" ئەو وشانەن بۆ وەسفی مردنی ئیسرائیلییەکان ڕۆژنامەنووسە فەلەستینییەکان بەکاریدەهێنن لەکاتێکدا بۆ مردووی فەلەستینییەکان ئەمە بەکارناهێنن، لەلایەکی تریشەوە باسی ئەو وشانە دەکات کە ڕۆژنامەکانی ئەمریکیی و ئیسرائیل بەکاریدەهێنن وەک وشەی (ارهابي) (Philo 2004)

## سەرچاوە


1-Hussain,N. (2008). The Role of Media in National Security: A Case Study of 1998 Nuclear Explosions by Pakistan Copyright © South Asian Strategic Stability Institute Ltd, 2008.

2-7-Fairclough, N. (2001). Language and Power (2 edition). Harlow, Eng. ; New York: Routledge

3-8Liddicoat، 3-Anthony J.(2015). Language planning and questions of national security: An overview of planning approaches, Research Centre for Languages and Cultures Education, School of International Studies, University of South Australia.

4-Philo,G.(2004). The media & the Israeli-Palestinian conflict, Guardian, 14 July The Role of Media in National Security: A Case Study of 1998.

5- Puddephatt, A.(2006).conflict and the role of media , International Media Support report .

6- Paul Lederach(2003). Summary of «Of Nets, Nails, and Problems: The Folk Language of Conflict Resolution in a Central American Setting» by: Mariya Yevsyukova, Conflict Research Consortium.

7-Timothy،A،E، (2016)،Language and communication conflict in Nigeria: Implications for communicative language pedagogy, University of Calabar

## پوختە

چەمکی ئاسایشی ئابووری بە چەمکێکی تازەیەک نوێ دادەنرێت، بەتایبەت لەنێو لێکۆڵینەوەی کوردی، ڕەنگە ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ زاڵبوونی مێژوویی ڕەهەندی سەربازی بەسەر چەمکی ئاسایشی نیشتمانیدا، هەروەک چۆن هەردوو زاراوەی مفتەخۆری(الريعية) و بەرخۆریش (الاستهلاكية)ش بە کۆمەڵگەی کوردی نوێیە و لەدوای ئازادی عێراق (٢٠٠٣) و لاچوونی گەمارۆکان و هەناردەی نەوت ئیتر مووچە و بودجەی عێراق بەلێشاو و بێبەرنامە تەخشان و پەخشان کراو کۆمەڵگەی عێراقیی و کوردی لەبەرهەمهێنان دوورخرانەوە و بەهۆی دامەزراندنی سەرکیلانە و دوور لە پێوەرە زانستییەکان کرانە بەرخۆر و کاربەدەستەکانیش لە کوردستان و عێراق داهاتی ڕەیعی نەوتیان وەک شاباش بۆ مەحسوبیەت و مەنسوبیەت و بەهێزکردنی پێگەی جەماوەریی و سەربازی پارتە سەرەکییەکان دابەشکرد و خەڵکیان فێری حازرخۆری کرد و تێریشیان نەکردن، ئەمەش گرفتی لە هەیکەلەی ئابووری هەرێم دروستکرد و ئەو کەم بەرهەمە کشتوکاڵیی و پیشەسازییانەی مابوون ئەوانیش نەمان و ئاڕاستەکانیان بۆ خزمەتی کەرتە ڕەیعییەکان ئاڕاستەکران.

### یەکەم: چەمکی ئاسایشی ئابووری

ئاسایش بەو حاڵەتە پێناسە دەکرێت مرۆڤ لە مەترسییەک دەپارێزرێت، کە هەڕەشەی لێدەکات، هەروەها بەو هەستەی دڵنیایی کە تاک هەستی پێدەکات پێناسە دەکرێت، جا بەهۆی نەبوونی ئەو مەترسییانە بێت کە هەڕەشە لە بوونەکەی دەکات. بۆیە دابینکردنی خزمەتگوزاری تەندروستی، ئاسایش، سەقامگیری خێزان، خاوەنداریەتی لە خۆراک و ڕۆزی ڕۆژانە، کەمی مردن، نەبوونی ترس و زیادبوونی سەروەت و سامان و ژمارەی دانیشتوان، ئاماژەن بۆ بەردەستبوونی

حاڵەتێکی ئاسایشی کۆمەڵایەتی و ئابووری لە کۆمەڵگەدا. هەروەها پێناسەیەکی گشتگیر هەیە بۆ ئاسایش وەک ئەو توانایەی کە ڕێگە بە دەوڵەت دەدات بۆ دابینکردنی سەرچاوەی هێزی ناوخۆیی و دەرەکی و ئابووریی و سەربازی خۆی مسۆگەر بکات، لە بوارە جیاجیاکاندا، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو سەرچاوانەی کە لە ناوخۆ و دەرەوە هەڕەشەی لێدەکەن بە ئاشتی و شەڕ، بەردەوامبوونی ئازادکردنی ئەو هێزە لە ئێستا و داهاتوودا بەپێی ئامانجە دیاریکراوەکان.

پێناسەی سادەی ئاسایشی ئابووری لە ئاستی تاکدا سیمایەکی کۆمەڵایەتی هەیە، زانایان پێیانوایە ئاسایشی ئابووری بریتییە لە کۆمەڵێک ڕێوشوێن و گەرەنتی و پاراستن، کە تاک شایستە دەکات بۆ بەدەستهێنانی پێداویستییە سەرەتاییەکانی، کە بریتین لە خۆراک و جلوبەرگ و نیشتەجێبوون و چارەسەرکردن، واتە کە کەسێک خاوەنی ئامرازی داراییە توانای ئەوەی پێدەدات ژیانێکی سەقامگیر و ئاسایش بژی. ئاسایشی بەکۆمەڵ، یان کۆمەڵایەتی، ئابووری بریتییە لە بەدەستهێنانی پاراستنی مافی گرووپە جیاوازەکانی کۆمەڵگە و دابینکردنی ڕێکخستنی یاسا و یاساکان کە توانای گرنگیدان و خزمەتکردنی هەموو بەرژەوەندییەکانی ئەندامانی کۆمەڵگە، ئاسانکاری بۆ ئەرکەکەیان لە بەجێگەیاندنی کاروبار و سزادانی ئەو کەسانەی کە هەوڵی بەربەستی دەدەن بە هەر شێوەیەک بێت.

چەمکی ئاسایش لە پرسێکی ڕووتی سەربازییەوە گۆڕاوە بۆ پرسێکی گشتگیری کۆمەڵایەتی، کە پەیوەندی بەڕادەی توانای دەوڵەتان و کۆمەڵگەکانەوە هەیە بۆ جێبەجێکردنی پلان و بەرنامەی گەشەپێدانی ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی و کولتووری، هەروەها بۆ بەهێزکردنی پێکهاتەکانی خۆیان. لەو چوارچێوەیەدا "ڕۆبەرت مەکنامارا" وەزیری پێشووی بەرگری ئەمریکا و سەرۆکی پێشووی بانکی جیهانی لە کتێبەکەیدا بە ناونیشانی "جەوهەری ئاسایش"، دەڵێت: "ئاسایش کەرەستەی سەربازی نییە، تەنانەت ئەگەر ئەویش لەخۆبگرێت، نەک هێزی سەربازی و چالاکیی سەربازی نەبێت، ئاسایش گەشەپێدانە، بەبێ گەشەپێدان ئاسایش نییە و ئەو وڵاتانەی گەشە ناکەن بە سادەیی ناتوانن بە ئاسایشی بمێننەوە.

**دووەم: پێکهاتەکانی ئاسایشی ئابووری (Genders of economic security)**

ئاسایشی ئابووری لە چەند ڕەگەزێک پێکدێت، کە دەتوانرێت بەم شێوەیە کورت بکرێتەوە:

**١. ئاسایشی خۆراک (Solar Security)**

گرنگترین پێکهاتەی ئاسایشی ئابوورییە دەکرێت بەمشێوەیە پێناسە بکرێت: "توانای کۆمەڵگە بۆ دابینکردنی ئاستی پێویستی خۆراک بۆ ئەندامەکانی لە سنووری داهاتی بەردەستیان، هاوکات مسۆگەرکردنی ئاستی بژێوی خۆراک بۆ ئەو کەسانەی، کە ناتوانن بە داهاتی بەردەستیان بەدەستیبهێنن، جا ئەمە لە ڕێگەی بەرهەمهێنانی ناوخۆییەوە بێت، یان هاوردەکردن بەپێی سەرچاوەکانی خۆیان.

**٢. ئاسایشی تەندروستی (Health Security)**

تەندروستی پەیوەندییەکی نزیک بە گەیشتن بە ئاسایشی ئابووری بۆ کۆمەڵگە هەیە، کۆمەڵگەیەک کە دوور بێت لە نەخۆشی خەڵکی چالاک و بەهێزی هەیە، ئەمەش وایان لێدەکات بتوانن بەرهەمهێنان و کارکردن و گەیشتن بەڕێژەی گەشەی ئابووری گونجاو بەدەستبهێنن، لەکاتێکدا پێچەوانەکەی لە کۆمەڵگەیەکدا ڕوودەدات کە بەهۆی نەخۆشی و پەتاکانەوە کۆنترۆڵ دەکرێت. هەربۆیە وڵاتان هەوڵی بەرەنگاربوونەوەی نەخۆشییە مەترسیدارەکان دەدەن.

**٣-ئاسایشی پێکەوەژیان یان بیمەی کۆمەڵایەتی (Life security and social insurance)**

ئەم سیستەمە بە بیمەی کۆمەڵایەتی یان یارمەتییەکانی دوای خزمەت ناسراوە، کە بەشێوەیەکی سەرەکی لەسەر بنەمای بەکارهێنانی کارەکانی بیمە لە نێوان کەرتی کرێکاراندایە، بۆ دابینکردنی پاراستن و ئاسایشی کۆمەڵایەتی بۆیان. سەبارەت بە ئاسایشی تەندروستی هاوژیانی، سیستەمێکی هاوژیانییە لە نێوان هاووڵاتیان و دەوڵەتدا، کە بەشداربووەکە بەپێی داهاتەکەی بەشدارییەکی سنووورداری مانگانە دەدات بۆئەوەی خۆی و ئەندامانی خێزانەکەی بتوانن چێژ لە خزمەتگوزارییە پزیشکییە یەکگرتووەکان وەربگرن، بەبێ گوێدانە قەبارەی خێزان و قەبارەی خزمەتگوزارییە پێویستەکان، کە بریتین لە پشکنین و پشکنینی بێبەرامبەر و دەرمان بە تێچووی کەم.

### ٤-ئاسایشی کار و بەرەنگاربوونەوەی هەژاری (The fight against poverty)

بەرەنگاربوونەوەی هەژاری یەکێکە لە پێکهاتە گرنگەکانی ئاسایشی ئابووری، هەژاری نوێنەرایەتی گەورەترین مەترسی دەکات بۆ کۆمەڵگە هاوچەرخەکان. لەگەڵ بڵاوبوونەوەی هەژارای لە کۆمەڵگەدا، نەخۆشی و بەدخۆراکی بڵاودەبێتەوە، تاوان و دزی زیاد دەکات و دۆخی ناڕازیبوون خراپتر دەبێت و ناسەقامگیری سیاسی و ئابووری و ئەمنیی لێدەکەوێتەوە. هەربۆیە پڕۆژەکانی دژە هەژاریی و کارابییەکانیان لە دەستێوەردان وەک هۆکارێکی سەرەکی بۆ گەیشتن بە ئاسایشی ئابووری، یان تەنانەت ئاسایشی هەمەلایەنە لە کۆمەڵگەدا سەیر دەکرێن.

هەروەک کار سەرچاوەیەکی گرنگە لە تێرکردنی پێداویستییە سەرەتاییەکانی مرۆڤ و گۆڕینی تاک لە دۆخی هەژاریی و برسێتی و ترس، بۆ دۆخی سەقامگیری کۆمەڵایەتی و ئابووری، هەروەها ئامراز و دەروازەی کاریگەرە بۆ گەیشتن بەهێز و ئاسایشی ئابووری، بۆیە کۆمەڵگەیەک کە ڕێژەیەکی بەرزی بێکاریی و کەسانی ناچالاکی ئابووری تێیدا زاڵ بن، وەک هەژار بێ بەرهەم و کەم گەشەسەندوو سەیر دەکرێت، ئەمەش حاڵەتێکی ناسەقامگیری کۆمەڵایەتی دادەمەزرێنێت. سەبارەت بە ڕێژەی بەرزی دانیشتوانی چالاک لەڕووی ئابوورییەوە، ڕەنگدانەوەی سەقامگیری لە دۆخی ئابووری وڵاتی پەیوەندیدارە، هەروەها ڕەنگدانەوەی توانای ئەو وڵاتە بۆ گەیشتن بە ئاسایشی ئابوورییەکەی.

### ٥-ئاسایشی ژینگە (Environmental security)

ئامانجی پاراستنی سروشت لە تێکدان لە کورتخایەن و درێژخایەندا، بەمەبەستی ڕێگریکردن لە تێکچوونی ژینگە لەگەڵ کاردانەوەکانی لەسەر وڵاتان و تاکەکان. نەبوونی دەستڕاگەیشتن بە ئاوی پاک یەکێکە لە مەترسییە هەرە گرنگەکانی بەردەم وڵاتە پیشەسازییەکان، هەروەها دەکرێت ئەوە لەبەرچاو بگیرێت کە پیسبوونی هەوا، گەرمبوونی جیهان کە لە ئەنجامی کورەگەرمەکان، کارگەکان، کێشەکانی چارەسەرکردنی پاشماوەکان و هەندێکی تر لە گرنگترین هەڕەشەکانن بۆ سەر ژینگە و ژیانی تاکەکەسی.

### ٦-دادپەروەریی و دەرفەتی یەکسان (Justice and opportunity)

لێکۆڵینەوەکانی ئەم دواییانە، جەخت لەسەر گرنگی دادپەروەریی و دەرفەتی یەکسان دەکەنەوە بۆ پێشخستنی گەشەپێدان و بەرزکردنەوەی ئاستی ژیان.

ڕاپۆرتی گەشەپێدانی جیهانی بۆ ساڵی ٢٠٠٦ کە لەلایەن بانکی جیهانییەوە لەژێر ناونیشانی: "یەکسانی بەهێزی گەشەکردن بەرزدەکاتەوە بەمەبەستی کەمکردنەوەی ژمارەی هەژاری"، پشتڕاستی دەکاتەوە کە دادپەروەری دەبێت بەشێکی دانەبڕاو بێت لە هەر ستراتیژییەکی سەرکەوتوو بۆ کەمکردنەوەی ژمارەکە لە هەژاری لە هەر شوێنێکی جیهانی گەشەسەندوودا. هیچ گومانێک نییە لە گرنگی گەیشتن بە دادپەروەریی و دەرفەتی یەکسان، ئابووری گەشە دەکات و کاتێک زۆرینەی دانیشتوان ئامرازی پێویستیان هەبێت بۆ بەشداریکردن لە سوودەکانی دەرئەنجامی گەشەی ئابووری، بۆیە پێویستە ستراتیژییەکانی گەشەپێدان ئامانجیان کەمکردنەوەی نایەکسانی لە دەرفەتەکاندا بێت، پاشان بەدەستهێنانی یەکسانی و باشترکردنی کارایی و دادپەروەری.

**سێهەم: گرنگی ئاسایشی ئابووری (The Importance of Economic Security)**

ئاسایشی ئابووری چەندین سوودی گرنگ بۆ تاک و وڵاتان بەدەستدەهێنێت، ڕەنگە گرنگترین ئەو سوودانە ئەمانە بن:-

أ-ڕەخساندنی هەلی کار بۆ تاکەکان.

ب-بەشداریکردن لە بەرزکردنەوەی ئاستی سیستەمی پەروەردەیی لە وڵاتدا، بە بەرزکردنەوەی کواڵیتی و خستنەڕووی خوێندن بۆ هەمووان بە نرخێکی گونجاو، هەوڵدان بۆ خوێندنی پێشوەختە.

ج-بەرزکردنەوەی ئاستی ژیانی تاکەکان بە دابینکردنی مووچەی مانگانە بۆ ئەو تاکانەی کە کار ناکەن، یان لە ئەنجامی تەمەنی بەساڵاچوون یان تووشی نەخۆشییەکی دیاریکراو بوون ناتوانن کار بکەن.

د-بەشداریکردن لە ڕێکخستنی بازاڕەکانی کار و بەرهەم.

هـ-دابینکردن و کردنەوەی بازاڕ بۆ نمایشکردنی بەرهەمە نیشتمانییەکان، پێناسەکردنی سیستەم بۆیان.

و-سەرچاوەیەک بۆ پاراستنی یاسایی.

ی-بەشداریکردن لە پاراستنی ئازادییەکان، بۆ نموونە ئازادیی جوڵەی بازرگانی ز-کەمکردنەوەی باجەکان.

## ئاسایشی ئابووریی و مفتەخۆری لە هەرێمی کوردستان

وەک لە ناونیشانی توێژینەوەکەمان هاتووە مەبەستمان لە دەسەڵاتی مفتخۆر( الريعية)ی هەرێم گرنگیدانی کاربەدەستانە بە گەشەپێدان و پێشخستنی ئەو کەرت و بوارە ئابوورییانەی کە زۆرترین و خێراترین داهات کۆبکاتەوە لای کەمترین ژمارەی کەسە تایبەتەکانی دەوروبەری خۆیان، بەمەش گیرفانیان پڕتر و دەسەڵاتیان مەحکەمتر دەکەن بەسەر هاوڵاتیان بۆ نموونە پیشەسازی شیش و چیمەنتو کەرتی تەواوکارە بۆ وەبەرهێنان لە کەرتی خانووبەرە، کەرتی خانووبەرەش قۆرخکراوە لەلایەن کۆمپانیا ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆکانی کاربەدەستەکان و زۆرترین و خێراترین قازانجی هەیە، هەروەها ئەگەر بڕوانینە هەموو ئەو لایەنە ئابوورییانەی گرنگیان پێدراوە دەگەینە هەمان دەرەنجام.

لێرەوەیە، نەخۆشییەکانی سیستمێکی ئابووری بەکاربەر دەردەکەوێت، هەروەها هەوڵەکانی جێبەجێکردنی ڕیفۆرمی لاوەکی ئابووری لە جیاتی ڕیفۆرمی ئابووری ڕاستەقینە جێبەجێدەکرێت، لە ئەنجامدا دەسەڵاتی ئابووریی و سیاسی دەخاتە دەست دەستەبژێرێکی دیاریکراو، لەبری ڕەخساندنی هەلی کار و بازرگانی ئازاد، کە لە ئەنجامدا خۆشگوزەرانی نوێ، کارسازیی و پیشەی نوێ بۆ هەموو کەسێک لە کۆمەڵگەدا دابین بکات.

یەکێک لەو ناوانە نەخۆشی هۆڵەندییە، کە ئاماژەیە بۆ سیاسەتی ئابووری ئەو وڵاتانەی کە سامانە سروشتییەکان خراپ بەکاردێنن و تەنها پشت بە یەک سەرچاوەی ئابووری دەبەستن و کەرتە ئابوورییەکانی تر پشت گوی دەخەن . مێژووی بابەتەکە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٥٩، هۆڵەندا کێڵگەیەکی زەبەلاحی گازی سروشتی لە باکووری ڕۆژهەڵاتی وڵات دۆزییەوە بەناوی Groningen کە پتر لە ٢٧٠٠ بلیۆن مەتر سێجا گازی لەخۆگرتبوو، قازانجی دەستکەوتوو لە فرۆشتنی گازی سروشتی و باجی گەڕاوە لە چالاکییە پەیوەندیدارەکان بەم پیشەسازییە پڕ لە ئومێدەی هۆڵەندا، کاریگەریی ئەرێنی خستە سەر باری گوزەرانی خەڵک و بەرزبوونەوەی ستانداردی ژیان، بەشێوەیەک بە ئاشکرا هەستی پێدەکرا.

دراوی بیانی بە لێشاو ڕژانە نێو بانکەکان و پرۆژە زەبەلاح و ستراتیجییەکان واژۆ کران و گەشەی ئابووری بوو بە میوانی خەیاڵی سیاسەتمەداران و ئابووریناسان و هاووڵاتیان لە هەموو گۆشەیەکی وڵات. حکومەتی هۆڵەندا بەشێوەیەکی نا

هاوسەنگ، فۆکەسی خستە سەر پیشەسازیی گاز و هاندانی کۆمپانیاکان بۆ بەگەڕخستنی سەرمایە لەم بوارەدا و تاڕادەیەک بوارەکانی دیکە هەمان گرنگی و بایەخی ئەوتۆیان پێ نەدرا. بەڵام مانگی هەنگوینی زۆر درێژەی نەکێشا و زیادبوونی بەهای دراوی هۆڵەندی وایکرد، کە هەموو کاڵایەک نرخیان بچێتە سەر و ئاستی هەناردەکردنی کاڵا لە سەرجەم بوارەکان بەشێوەیەکی دراماتیکی کەم ببێتەوە. بوارەکانی کشتوکاڵ و پیشەسازی و گەشتوگوزار تووشی زیانێکی گەورە هاتن، سەرباری ئەو زیانانە ڕێژەی بێکاری لە سەرجەم ئەو بوارانەدا ڕووی لە هەڵکشان کرد. ئەم دۆخە ئابوورییە نەخوازراوەی هۆڵەندا بووە مایەی تێڕوانین و لێکۆڵینەوەی ئابووریناسان و سیاسەتمەداران لە جیهان.

لای خۆشمان (عێراق و هەرێم)، لە پاش ٢٠٠٣ هەمان هەڵەی پێش خۆیان دووبارە کردەوە و پشت تەنها بەیەک سەرچاوەی ئابووری بەسترا (نەوت)، کە بە چەمکی نوێی ئابووری پێی دەوترێت ڕەیعییەتی ئابووری و دۆخی ئاسایشی ئابووری بەتەواوی لەباربرا، بەتایبەت لە هەرێمی کوردستان پاش ڕاگەیاندنی ئابوری سەربەخۆ. بەپێی ڕاپۆرتی وەزارەتی سامانە سرووشتییەکان لەبارەی داهات و خەرجییەکانی نەوتەوە، کە لە ٢٠٠٧وە تاوەکو ٢٠٢١، لەلایەن دیلۆیت خراوەتەڕوو، بەردەوام نیوەی داهاتی نەوتی بۆ حکومەتی هەرێمی کوردستان گەڕاوەتەوە وەکو لە گرافیکی (٥)دا دەردەکەوێت. هەروەها، داهاتی نەوتی هەناردەکراو لە ٢٠٠٧دا ٠,٢٩ ملیار دۆلار بووە و لە ٢٠٢١دا گەیشتووەتە ٨,٩٧ ملیار دۆلار، بەهەمان شێوەش لە ٢٠١٧دا داهاتی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە نەوتی هەناردەکراو ٠,٠٣٠ ملیار دۆلار بووە و لە ٢٠٢١دا بەرزبووەتەوە بۆ ٣,١٧ ملیار دۆلار.




هێڵکاری کۆی داهاتی نەوت لە نێوان ساڵانی (٢٠٠٧-٢٠٢١) ملیار دۆلار

وەک لە هێڵکاریەکە دیارە داهاتی نەوت کەمێکی بۆ حکومەتی هەرێم بووە، بەپێی ڕاپۆرتەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان ئەو داهاتەش ڕاستەوخۆ بۆ دابینکردنی مووچەی فەرمانبەران تەرخان کراوە، کە ئەمەش لە زانستی ئابووری یاخود ئیدارەدانی سەرچاوە سرووشتییەکان بە "نەفرەتی سەرچاوە" Resource Curse ناودەبرێت، چونکە داهاتی سەرچاوە سرووشتییەکان "نەوت و گاز" دەبێت بۆ پرۆژەکانی وەبەرهێنان بێت. هەروەها، خەزاڵ عەبدوڵڵا لە کتێبی "دیزاین و بەهێزکردنی توانای دامەزراوەیی بۆ حکومڕانی سامانی نەوت و گاز: کەیسی هەرێمی کوردستان" لە لاپەڕە ٣٣ و ٨٣دا ئاماژە بەوە دەکات، کە چۆن داهاتی پیشەسازی نەوت و گاز بووەتە هۆی کەمبوونەوەی سەرمایەی دەوڵەت و وەبەرهێنان لە دەرەوەی کەرتەکانی دیکەدا و لە کەیسی هەرێمی کوردستان چۆن ئەزموونی ئازەربایجان و نایجیریا دووبارە دەبێتەوە، لەجیاتی ئەوەی پەیڕەوی مۆدێلی نەرویژ لە ئیدارەدانی نەوت و سەرچاوە سرووشتییەکاندا بکرێت.

لەڕاستیدا، بڕیاری دەستپێکردنی پیشەسازی نەوت و گاز لە هەرێمی کوردستان و هاتنی کۆمپانیا نێودەوڵەتییەکانی بواری نەوت توانی دەرگایەکی نوێی ئابووری بەڕووی هەرێمی کوردستان بکاتەوە، بەڵام پشتبەستنی حکومەتی هەرێمی کوردستان و بەستنەوەی کۆی داهاتی حکومەت بە نەوتەوە، یاخود تاک سەرچاوەیی داهات ڕەیعییەتی نەوت، ئاسایشی ئابووری هەرێمی وێرانکرد، چونکە گۆڕانکارییەکان لە نرخی نەوت و گۆڕانکارییە جیۆپۆلەتیکییەکان و ساسەتی بەغدا و پابەندییەکانی کەشوهەوا و گەندەلی بەهۆکاری سەرەکی لەناوبردنی ئابووری هەرێم دادەنرێت کە ئابوورییە سەربەخۆکەی شکست پێهێناو کەرتە ئابوورییەکانی تریش تووشی داڕمان بوون، واتە بۆ ڕیش چوون سمێلیشیان دانا.

لێرەدا، بەخستنەڕووی زانیاریی و ئامارە ئابوورییەکانی هەرێمی کوردستان هەڵوەستە لەسەر ڕەهەندەکانی ئاسایشی خۆراک و ئاستی بەرهەمهێنانی خۆراکە بنەڕەتییەکان، ڕێژەی هەڵئاوسان، هێزی کار و دانیشتووان، خەرجییەکانی خێزان، داهات و خەرجییەکانی تاک سەرچاوەیی نەوت لە هەرێمی کوردستان و داهاتووی سەرچاوە سرووشتییەکان دەکەین، لەکۆتاییشدا هێڵە سەرەکییەکانی گواستنەوەی ئابووری هەرێمی کوردستان هەمان ڕەهەندی کارکردنی تێدایە.

## ئاسایشی خۆراک و ئاسایشی ئابووری

ئاسایشی خۆراک بە ڕەگەزی سەرەکی دابینکردنی ئاسایشی ئابووری دادەنرێت، بەمانایەکی تر هەتا ئاسایشی خۆراک نەبێت ناتوانی هەنگاوی تر بنێیت بۆ پرۆسەی ئاسایشی ئابووری، ڕاستە ئاسایشی ئابووری کۆمەڵێک ڕەگەزی پێکهێنەری تری لە فۆرمە گشتیەکەیدا هەیە، بەڵام ئاسایشی خۆراک گرنگترینیانە، هەربۆیە کەمێک لەم بابەتەیان زیاتر دەدوێین:

ئاسایشی خۆراک و داهاتووی دابینکردنی بەرهەمە بنەڕەتییەکانی وەک گەنم، جۆ و برنج:

ئاسایشی خۆراک یاخود دابینکردنی پێداویستییە سەرەکییەکان پێویستی بە بەرهەمهێنانی نێوخۆییە، کە ئەمەش هێشتا نەگەیشتووەتە ئاستێک بتوانرێت پشتیوانی لێبکرێت و توانای کێبڕکێی لە بازاڕەکاندا هەبێت. لەڕاستیدا بەهۆی گۆڕانکارییەکانی کەشوهەوا، بەتایبەتیش لە دوای جەنگی ئۆکرایناوە، واتە لە ٢٤ی شوبات جیهان پێی نایە قۆناغێکی نوێوە، بەشێوەیەک ئێستا نەک زلهێزەکان تەنانەت هەموو وڵاتانی جیهان خۆیان بۆ گرانی کاڵاکان و بەرهەمە سەرەکییەکان لە ساڵانی داهاتوودا ئامادە دەکەن، ئەویش بە هۆکارەکانی جەنگ، پچڕانی زنجیرەی دابینکردن و گۆڕانکارییەکانی کەشوهەوا. خۆشبەختانە لە هەرێمی کوردستان ڕووبەری چاندراو بە بەرهەمە سەرەکییەکان ڕوو لە زیادبوون بووە، بەشێوەیەک بەپێی دەستەی ئاماری هەرێمی کوردستان ساڵ بە ساڵ ڕووبەری چاندراو بە گەنم، جۆ لە هەرێمی کوردستان زیادیکردووە. بەشێوەیەک ئاستی بەرهەمهێنانی گەنم لە ساڵی ٢٠١٩-٢٠٢٠ گەیشتە بەرزترین ئاست، کە نزیکەی ٣ ملیۆن تۆن بوو، بەڵام بەپێی ئامارەکانی وەزارەتی کشتووکاڵ ئەمساڵ بڕی بەرهەمهێنانی گەنم نزیکەی ٤٠٠ بۆ ٥٠٠ هەزار تۆن دەبێت، ئەمەش بەواتای ئەوە دێت کە بەرهەمی گەنم لە ٢٠٢٢دا یەک لەسەر شەشی گەنمی دوو ساڵ پێش ئێستا دەبێت، هەربۆیەش هەنگاوی سەرەکی بۆ دابینکردنی ئاسایشی خۆراک، کە گەنمە پێویستە، چونکە ساڵانە هەرێمی کوردستان پێویستی بە ١ ملیۆن تۆنە، ئەمەش نیوەی ئەو بڕەیە.

یەکێکی دیکە لە هەڕەشەکانی ئاسایشی خۆراک نەمانی ئالیک، پاوان و گژوگیا و لەوەڕگەیە، ئەوەش کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر گوندنشینان و جووتیاران و مەڕداران هەیە، کە بەپێی زانیارییەکان ڕووبەڕووی چاندراوی جۆ کەمیکردووە، وەکو لە خشتەی سێیەمدا هاتووە.

### خشتەی ١: ڕووبەری چاندراو، بڕی برشت و بەرهەمی گەنم و جۆ لە هەرێمی کوردستان[1]

| ساڵ | جۆ لە هەرێمی کوردستان | | | گەنم لە هەرێمی کوردستان | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | ڕووبەر (دۆنم) | برشت (کگم /دۆنم) | بەرهەم (تۆن) | ڕووبەر (دۆنم) | برشت (کگم /دۆنم) | بەرهەم (تۆن) |
| 2002-2003 | 731,759 | 262 | 191,979 | 1,482,205 | 300.6 | 321,513 |
| 2003-2004 | 1,065,014 | 262 | 278,569 | 1,069,537 | 300.6 | 321,513 |
| 2004-2005 | 1,412,175 | 310 | 437,249 | 1,591,690 | 235.2 | 374,408 |
| 2005-2006 | 1,565,973 | 208 | 325,754 | 1,352,448 | 289.8 | 391,896 |
| 2006-2007 | 1,736,920 | 351 | 610,118 | 1,609,580 | 406.7 | 654,601 |
| 2007-2008 | 992,855 | 70 | 69,733 | 1,497,104 | 144.3 | 216,072 |
| 2008-2009 | 1,357,670 | 273 | 370,952 | 2,216,287 | 252.1 | 558,658 |
| 2009-2010 | 1,091,295 | 196 | 213,955 | 2,514,205 | 248.5 | 624,678 |
| 2010-2011 | 460,942 | 123 | 56,549 | 2,601,239 | 153.3 | 398,752 |
| 2011-2012 | 339,407 | 123 | 41,740 | 2,270,503 | 167.9 | 381,284 |
| 2012-2013 | 409,349 | 342 | 140,020 | 2,259,673 | 458.4 | 1,035,864 |
| 2013-2014 | 663,074 | 294 | 194,637 | 2,660,297 | 331.8 | 882,585 |
| 2014-2015 | 939,820 | 218 | 204,758 | 3,281,048 | 334.5 | 1,097,427 |
| 2015-2016 | 752,280 | 244 | 183,655 | 3,195,596 | 527.8 | 1,686,784 |
| 2016-2017 | 347,088 | 325 | 90,941 | 2,659,086 | 538.1 | 1,019,281 |
| 2017-2018 | 575,256 | 224 | 128,614 | 3,774,612 | 350.6 | 1,323,426 |
| 2018-2019 | 658,810 | 427 | 281,347 | 3,304,047 | 735 | 2,426,962 |
| 2019-2020 | 525,472 | 516 | 271,152 | 4,114,677 | 707 | 2,907,401 |

برنج یەکێکی دیکەیە لە خۆراکە سەرەکییەکان، لەسەر ئاستی جیهان لە دوای گەنمەوە بە پلەی دووەم دێت و لەڕووی بەرهەمیشەوە لە دانەوێڵەکاندا لە پلەی سێیەمدایە، بەپێی زانیارییەکانی وەزارەتی کشتووکاڵ، کە دەستەی ئامار بڵاویکردووەتەوە، بڕی بەرهەمهێنانی برنج لە ماوەی دەیەی ڕابردوودا لە ٣,٤ هەزار تۆن بەرزبووەتەوە بۆ ٢٠,٤ هەزار تۆن، کە پارێزگای دهۆک ڕۆڵی گرنگی لە بەرزکردنەوەی ئاستی بەرهەمی ناوخۆیی برنج هەبووە، بەپێی زانیارییەکانی وەزارەتی بازرگانیش، برنجی بەکاربراو بۆ هەر تاکێک لە هەرێمی کوردستان لەسەرووی ٣٠ کیلۆیە.

هەروەها ساڵانە نزیکەی ٢٥٠ هەزار تۆن برنج لە بازاڕەکانی هەرێمی کوردستان دەفرۆشرێت. بڕی ئەو سەرمایەی بۆ کڕین دەچێتە دەرەوە، نزیکەی ٢٥٠ ملیۆن دۆلارە. بەم جۆرەش وەکو لە خشتەی چوارەمدا هاتووە، بەرهەمی برنجی ناوخۆ تەنیا لە ٣٢٪ی پێداویستی نێوخۆ دابین دەکات و ٦٨٪ی لە دەرەوە هاوردە دەکرێ.

---

١ دەستەی ئاماری هەرێمی کوردستان، ڕاپۆرتی شیکاری دانیشتوانی هەرێمی کوردستان عێراق، شوبات ٢٠٢١.



## خشتەی ٢: بەرهەمی برنج بە (تۆن ) لە پارێزگاکانی هەرێمی کوردستان[٢].

| سال | بەرهەمی برنج لە پارێزگای هەولێر | بەرهەمی برنج لە پارێزگای دهۆک | بەرهەمی برنج لە پارێزگای سلێمانی و هەڵەبجە | کۆی گشتی بەرهەمی برنج لە هەرێمی کوردستان |
|---|---|---|---|---|
| 2009 | 258 | 2027 | 1125 | **3,411** |
| 2010 | 151 | 13879 | 1024 | **15,274** |
| 2011 | 150 | 3750 | 1126 | **5,026** |
| 2012 | 482 | 2506 | 695 | **3,683** |
| 2013 | 61 | 3,132 | 2,083 | **5,276** |
| 2014 | 22 | 5061 | 2143 | **7,244** |
| 2015 | 558 | 3980 | 1730 | **6268** |
| 2016 | 118 | 3134 | 1,682 | **4,934** |
| 2017 | 28 | 7,811 | 3035 | **10,874** |
| 2018 | 762.5 | 9,382.4 | 3341 | **13,486** |
| 2019 | 289 | 15811 | 3,353 | **19,453** |
| *2020 | 945 | 19,365 | *90 | **20,400** |

### ئاسایشی ئاو

بەهۆی گرتنەوەی سەرچاوە ئاوییەکان، کە دەڕژێنە نێو خاکی هەرێمی کوردستان و عێراقەوە، ئاسایشی ئاو کەوتووەتە بەر مەترسییەکی گەورە و هاووڵاتیان لەبەر نەبوونی ئاو، لە شار و شارۆچکەکان خۆپیشاندان دەکەن. وەکو لە خشتەی ٣دا هاتووە، پێنج ڕووبار و لق لە هەرێمی کوردستاندا هەن، کە ئاوی ساڵانەی ئاویان ٢٩,٢ ملیار سێجایە، کە هەموو ڕووبار و لقەکانیش بە نزیکەی ڕێژەی نیوەی زیاتری ئەو بڕە ئاوە پشت بە دەرەوە دەبەستێت.

لەڕاستیدا، دابینکردنی ئاسایشی ئاو، دەتوانێت ڕۆڵێکی گەورە لە گەشەکردنی ئابوورییەکی بەردەوامدا ببینێت، هەربۆیەش بۆ نموونە لەسەر بنەمای شیکردنەوەی زانستی کە لەلایەن کلاودیا سادۆف سەبارەت پەیوەندی گەشەی ئابووریی و وشکەساڵی کردوویەتی دەرکەوتووە، لە بەڕازیل کەمکردنەوەی کاریگەرییەکانی وشکەساڵی دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی گەشەی بەرهەمی ناوخۆیی تاک بە ڕێژەی ٧٪.

## خشتەی ٣: سەرچاوە ئاوییەکانی هەرێمی کوردستان(٣)

| ڕووبار /لق | ڕووبەری ئاوڕێژ (کیلۆمەتر دووجا) | درێژی کیلۆمەتر | بڕی داهاتی ئاوی ساڵانە (ملیار مەتر سێجا) | ڕێژەی داهاتی لەنێو هەرێمی کوردستان | ڕێژەی داهاتی ئاو لە دەرەوەی هەرێمی کوردستان |
|---|---|---|---|---|---|
| خاپوور | 6240 | 160 | 4 | 42% | 58% |
| زێی گەورە | 26470 | 473 | 12.1 | 58% | 42% |
| زێی بچووک | 22250 | 456 | 9.1 | 64% | 36% |
| سیروان | 32000 | 386 | 4.1 | 41% | 59% |
| ئاوە سپی | 11690 | 220 | - | 100% | 0% |
| | تێکڕای داهاتی ساڵانە | | 29.2 | | |

---

٢ ڕۆژنامەی ڕووداو، ژمارە ٤٠٥، لاپەڕە ٨، ڕۆژی ٢٠١٦/٤/٢٥، دەستەی ئاماری هەرێمی کوردستان.

٣دەستەی ئاماری هەرێمی کوردستان، پوختەی ئاماری سەرچاوە ئاوییەکان ٢٠١٩.

هەروەها بەهۆی وشکەساڵی و کەمبوونی وەرزی بارانبارین لە هەرێمی کوردستان بەرهەمی کشتوکاڵی بۆ یەک لەسەر شەش دابەزیوە، کەواتە لێکەوتە ئابوورییەکانی گۆڕانکاری کەشوهەوا لە هەرێمی کوردستان بەڕوونی دەرکەوتوون، ژمارەی ئەو بیرانەی بۆ مەبەستی خواردنەوە لە پارێزگاکان و هەرێمی کوردستان هەڵکەنراوە ڕوو لە زیادبوون بووە، ئێستا بەشێوەیەک لە ٢٠١٩ کۆی بیرەکان گەیشتووەتە زیاتر لە ١٢ هەزار، ئەمە لەکاتێکدا ژمارەی بیرە نایاساییەکان دوو هێندەی ئەو ژمارەیە.

لە ماوەی ڕابردووشدا بەهۆی کەمبوونی ئاوی دابینکراو، ژمارەی بیرەکان چ بۆ مەبەستی ئاوی خواردنەوە، کشتوکاڵ و پرۆژە پیشەسازییەکان بێت زیادیکردووە، بەشێوەیەک لە ٢٠١٣ لە هەرێمی کوردستان ژمارەی بیرەکان بۆ ئاوی خواردنەوە ١٠٩٥٨ بیرە، بەڵام لە ٢٠١٩ گەیشتووەتە ١٢٢٦٦ بیر، ئەمە جگە لە بیرە نایاساییەکان. هەربۆیەش ڕێکخستنەوەی سەرچاوە ئاوییەکان و پێداچوونەوە بە داهاتی ئاوی ساڵانە و پێداویستییەکان و ڕێکخستنەوەی سامانی ئاو لە هەرێمی کوردستان، دەتوانرێت ئاسایشی ئاو دابین بکرێت و لەو ڕێگەیەوە ئاسایشی خۆراک بە بووژاندنەوەی کەرتی کشتوکاڵ و ڕەخساندنی کار پەرەبستێنێت.

## کۆتایی (دەرەنجام و ڕاسپاردە)

پشبەستن بە کاڵای هاوردەکراو، هەڵئاوسانی ئابووری، تاک سەرچاوەیی داهات و گوڕانکارییەکانی کەشوهەوا و گەشەکردنی خێرای دانیشتووان، ئەوە دەخوازێت هەرێمی کوردستان پێداچوونەوەیەکی خێرا بە ئابوورییەکەیدا بکات و پێناسەیەکی دیاریکراو بە ئابووری هەرێمی کوردستان بدات، کە بیگوازێتەوە بۆ قۆناغێکی نوێ، کە توانای بەرگەگرتنی گوڕانکارییەکان و هۆکارە نێوخۆیی و دەرەکییەکانی هەبێت. لیرەدا چەند پێشنیازێک بۆ سەرەتای نەخشاندنی ئاسایشی ئابووری دەخەینە ڕوو:

١-پشتیوانیکردنی جووتیار و هەڵمەتی هۆشیاری نەتەوەیی بۆ بەرهەمی نێوخۆیی و پاڵپشتی جووتیار و دابینکردنی خزمەتگوزارییە سەرەتاییەکان.

٢-هەوڵدان بۆ پاڵپشتیکردنی بازرگانی بچووک و دەستگیرۆیی گەنجان لە قەزا و ناحییەکان لە دەرەوەی شارە گەورەکان.

٣-هەمەچەشنکردنی  ئابووری (التنويع الاقتصادي) بە گرنگیدان بە کشتوکاڵ و

بەرهەمە پیشەسازییەکان و گەشتیاری لە هەرێمی کوردستان.

٤- لەسەرروو هەموو ئەمانەوە بنەبرکردنی گەندەڵی و بەبنیاتنانی حکومەتێکی دیجیتاڵی یەکگرتوو، کە فەرمانگە و وەزارەتەکان بەیەکەوە ببەستێتەوە، هەروەها هەوڵبدرێت بۆ یەکخستنی تواناکان و دانانی کات بۆ جێبەجێکردنی بڕیارە چاکسازییەکان و کارکردن بە یەکخستنی ئامارەکان و دانانی سیستمی ئەلیکترۆنی بەتایبەتیش لە بواری ئابووری و بازرگانی بەمەبەستی دەستخستنی داتایەکی دروست، کە بتوانرێت نیشانە سەرەکییەکانی ئابووری هەرێمی کوردستان بزانرێت و نەخشە ڕێگەی دابینکردنی ئاسایشی خۆراک، ئاسایشی ئابووریی و ڕەخساندنی کار و خۆشگوزەرانی هاووڵاتیان لە هەرێمی کوردستان دیاری بکات.

لەکۆتاییدا، ئەگەر گوڕانکاری لە سیستمی ئەم ئابوورییەدا نەکەین بە ئاڕاستەی ئاسایشی ئابووری، ئەوا پێویستمان بەدوژمن بۆ لەناوبردنی قەوارەی هەرێم نییە.

## سەرچاوەکان


١-سایتی فەرمی دەستەی ئاماری هەرێمی کوردستان، ڕاپۆرتی شیکاری دانیشتوانی هەرێمی کوردستان عێراق (WWW.krso.gov.krd)

٢- الأمن الاقتصادى للإنسان العربى، الواقع والأفاق، إعداد حسين عبد المطلب الأسرج، مركز الشرق العربى، على الرابط: www.asharqalarabi.org

٣- برنامج الأمم المتحده الإنمائى، تقرير التنمية الإنسانية العربية للعام ٢٠٠٩: تحديات أمن الإنسان فى البلدان العربية، نيويورک - الولايات المتحده الأميركية، ٢٠٠٩، ص ١١٧.

٤- عدنان السيد حسين، الأزمه العالمية: المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع (مجد) بيروت، ط١ ٢٠١٠.

٥- أحمد علو، عميد متقاعد: التنمية البشرية فى القرن الحادى والعشرين بين أخطار الحاضر وتحديات المستقبل، مجلة «الجيش»، العدد ٢٧٦، حزيران ٢٠٠٨.

٦- ئیندێکسی ئازادی ئابووری ٢٠٢١، حکومەتی هەرێمی کوردستان، وەزارەتی پلاندانان ٢٠١٢، گرووپی بانکی جیهانی ٢٠١٦، تۆڕی میدیایی ڕووداو ٢٠٢٠، دەستکەوتەکانی کابینەی نۆیەمی حکومەتی هەرێمی کوردستان ٢٠٢١.

7-www.lebarmy.gov.lb/ar/content/%D8%A7%D9%84%D8%A3%D9%85%D9%86





نووسینی: عەباس مەحموود عەققاد
وەرگێڕانی: مستەفای سەیدمینە

# هەڵوێستم بەرانبەر خەڵك

ساڵی ١٨٨٩ لە (ئەسوان)ی (سەعیدی باڵا) هاتووەتە دنیا. ماوەیەک فەرمانبەر بووە و، خەریکی ئیشوکاری حکوومەت بووە، پاشان دەستیهەڵگرتووە و سەرقاڵی کاری ڕۆژنامەگەریی و دواییش مامۆستایی بووە. دوای ئەوەی بزووتنەوەی نیشتیمانیی سەریهەڵدا، چووە نێو شەڕی سیاسەت و بۆ ئەنجومەنی نوێنەران هەڵبژێررا، دوایی بوو بە ئەندامی ئەنجومەنی پیران، پاشان ئەندامی کۆڕی زمانی عەرەبیی. دەیان کتێبی شیعر و پەخشانی لەمەڕ بابەتەکانی ئەدەب و فەلسەفە و کۆمەڵایەتیی و مێژوو و سیاسەت و ژیاننامەی گەورە پیاوان، وەکو: (بلیمەتیی محەمەد)، کتێبێک دەربارەی (بلیمەتیی مەسیح) و کتێبێکیش دەربارەی (ابن الرومی) و زۆری دیکەشی نووسیون.

ژیان دوو پلانی دەربارەی ڕەفتارکردنم لەگەڵ خەڵکی فێرکردم: پلانێک دەربارەی ئەوەی لە خەڵکەوە تووشم دەبێت، پەیڕەویی دەکەم و، پلانێکیش لەمەڕ ئەوەی کە خەڵک لە منەوە تووشی دەبێت. زۆر ئاسوودەم کە هەست و بیری خۆم بەفیڕۆ نەداوە و زانیومە چۆن دەست بە سامانی ژیانمەوە بگرم.

پلانم دەربارەی ئەوەی کە لە خەڵکەوە تووشم دەبێت، ئەوەیە کە تێکڕا و یەکجێ، ڕەفتار دەگەڵ سروشت و ڕەوشتیان بکەم، بەگوێرەی جیاوازیی کەس و تاکەکان، جیایان نەکەمەوە.

لە سەرەتادا کەسێک دەیان جار، بەڵکو سەدان جار تووشی ئازار و بێهیوایی دەکردم و هەموو جارێ وەکو شتێکی تازەم دیتبێ، کە پێشتر  بە خەیاڵمدا نەهاتووە، شۆک دەبووم، پاشان لەگەڵ تێپەڕینی زەمان، کردمە عادەت کە لە حیسابی سوود و زیاندا، یەک حیساب بۆ هەموو خەڵکی بکەم، بەوهۆیەوە لانیکەم زیانەکە کەمی کرد، ئەوەش بۆخۆی بە دەستکەوت و سوودێک حیسابە..

من ڕاهاتووم ڕەوشت بە هەموو جۆرەکانییەوە، پێکەوە کۆبکەمەوە و هەر جۆرەی لەژێر ناونیشانی خۆی دانێم. خەڵک خۆپەرستیی تێدایە، خەڵک سووک و چرووکی تێدایە، خەڵک هیچ و بێ نرخی تێدایە، خەڵک چەندان کەموکورتیی و شتی سەیری تێدان، ئیدی بەو جۆرە، هەتا دەگاتە کۆتایی ئەو شتە باوانەی، ئێمەی نەوەکانی ئادەم و حەوا، بۆمان ماونەتەوە، کە هیچیان تازە  نین.

جا ئەگەر خراپەیەکم لە خەڵکییەوە پێگەیشت، بۆ ناونیشانەکەی دەگەڕێمەوە، دەبینم لەوێ تۆمارکراوە و شتێک نییە چاوەڕوانیم نەکردبێت و پێم سەیربێت، خەڵک خۆپەرستیی تێدایە، خەڵک سووکیی تێدایە.. بەڵێ.. بەڵێ.. جا ئەوە چیی تێدایە؟! ئەدی پێشتر ئەوەت نەزانیوە؟  با، جار لەدوای جار زانیوتە، کە وابوو سەرسوڕمانی بۆ چییە و بۆچی ناز و گلەییان دەکەی؟

ماوەیەکی زۆریش چاودێریی خۆم کردووە، خۆم لە قایمەکەدا داناوە، هەر جارێک کە خەراپەیەکم تووش بێت، بەخۆم دەڵێم: (ئەتۆش هەر وای)، کەواتە: لۆمە و بێنەوبەرەی ناوێت!

پلانیشم بۆ ئەوەی لە منەوە تووشی خەڵکی دەبێت، ئەوەیە کە هەر جارێک هەستم بە ناڕەزایی و ڕەخنەی ئەوان کردبێت، لە خۆم پرسیوە: (ئایا ئەو بابەتە پەیوەندیی بە منەوە هەیە؟) یان بەدەربڕینێکی دیکە: (ئایا ئەگەر ئەوان لێم ناڕازیی بن، زیانم

پێ دەگات؟ ئایا عەیبدار دەبم؟ جا ئەگەر ئەو بابەتە زیانم پێ بگەیەنێت یان عەیبدارم بکات، ئەوا پەیوەندیی بە منەوە هەیە و حەتمەن دەبێ بەگوێرەی توانا چارەسەری بکەم، ئەگەر واش نەبوو، ئەوە پێویست بە نیگەرانیی و سەغڵەت بوون ناکات.

هەمیشەش پشتم بە پێوەری کردەیی بەستووە، چونکە ڕۆیشتن بەدوای بیردۆزاندا، بە هیچ ئامانجێک ناگات.جا بەردەوام پێنج شەش کەسی ناسیاو لەپێش چاوی خۆم دادەنێم، کە دەزانم لەلای خەڵکی خاوەن ڕێزن و خەڵک ڕقی لێ نیین و ڕەخنەیان لێ ناگرێت، لە خۆم دەپرسم: (پێتخۆشە وەکو ئەوان بی، وەکو وان ڕەزامەندیی خەڵکی بەدەستبێنی؟) وەڵامی ئەو پرسیارە هەمیشە بۆ من بەسوود بووە، چونکە یان کاری پێویستی کە دەبێت بیکەم، بۆم دیاری دەکات، یان دەستم پێ لە هەموو کارێک هەڵدەگرێت، لە زۆربەی حاڵەتەکاندا بۆم ڕووندەکاتەوە کە سامانی ڕەزامەندیی و ستایشکردن یان پارەیەکی قەڵبە، یان لە چاکترین باردا، پارەیەکی بەڕاستییە، بەڵام دەستلێهەڵگرتنی گران نییە.

لە ئەزموونە زۆرەکانی ئەو کەسانەوە کە بەتەواویی ناسیومن، بۆم دەرکەوتووە، ئەوانە فێڵ دەکەن و عەقڵ و ویژدانیان لە فێڵکردندا، بۆ گەیشتن بە ناوبانگێک کە بۆخۆی بۆیان گرنگ نییە، بەڵام بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی پشت ناوبانگەکە، بۆیان گرنگە، بەکاردێنن .... سوپاسی خوام کردووە کە ئەو ئامانجە هیچ بۆ من گرنگ نییە و لەلای من ئەوە ناهێنێ کەمترین ماندووبوونی بۆ بچێژم، ئەگەرچی هەموو ساتێکیش بتوانم وەکو ئەو کەسە بم کە ئاواتی هەبوونی هەندێک سامان بخوازێت تا شتێکی پێ بکڕێت، پاشان بۆی دەرکەوێت ئەو شتە شایەنی کڕین نییە، ئیدی نە نیازی بەو ماڵە و نە بەو ئاواتەش بمێنێ.

دوو پلانی ئاسان و سادە: پلانێک لەگەڵ خەڵکی، ئەویش ئەوەیە، کە هەموویان یەکجێ پێکەوە کۆکەمەوە. پلانێکیش لەگەڵ خۆم، کە بریتییە لە چڕکردنەوە و کورتهەڵێنانی هەموو هەوڵ و خەمەکانم لەوەدا کە پەیوەندیی بەخۆمەوە هەیە.

دوو پلانەکانیش وەکو گووتم- ئاسان و سادەن، بەڵام لەبیرم ناچێ بڵێم: ئاسان و سادەن بۆ ئەو کەسەی، وەکو من هەر بە سرووشت و زگماک گۆشەگیرە و کەمتر تێکەڵی خەڵکی دەبێت. بێگومان حەزکردن لە گۆشەگیرییش لە ژیانەوە فێر نەبووم، بەڵکو بەبێ فێرکردن لە دایک و باوکم وەرگرتووە، جا ئەوەی پێی خۆشە و دەتوانێت فێری بێت، با فێری بێت!

## وتەیەکی پێویست:

خوێنەری بەڕێز، ئەمەی لە چوارچێوەی ئەم بیست و شەش بڕگەدا هاتووە، دەقی ڕاپۆرتی فەرماندەی فیرقری دوازدەی سوپای عوسمانی ئیبراهیم ئەدهەم پاشایە، کە بە ئەرکێکی سەربازی هاتووەتە سلێمانی، خۆی شاهید و لە نزیکەوە ئاگاداری باردۆخی کۆمەڵایەتی و ئابووریی و ئەمنی ئەو ڕۆژگارەی ناوچەکە بووە. سەبارەت بە هۆکاری نووسینی ئەم ڕاپۆرتە ورد و پڕ زانیارییە، ناوبرا لە نووسراوێکیدا کە لە ڕێکەوتی (٢٢ی تشرینی دووەمی ١٣٠٥ ڕۆمی- ٤ی کانونی یەکەمی ١٨٨٩)دا بە مۆری خۆیەوە بۆ بابی عالی لە ئەستەنبوڵی ناردووە، تێیدا ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە، کە کاتێک ساڵێک بەر لە ئێستا واتا ساڵێک بەرلە ناردنی ئەو نوسراوە، بە ئەرکێکی سەربازیی و وەک فەرماندەی سەربازی بۆ سلێمانی نێردراوە، لەکاتێکدا کە بەڕێگەوە بووە بۆ سلێمانی وەکالەتی موتەسەڕیفییەتی سەنجەقی شارەزووری پێدراوە، لەوکاتەدا کە بۆ ئەو ئەرکە گەڕاوەتەوە کەرکوک، لەلایەن بابی عالییەوە (دەوڵەتی عوسمانییەوە) هەندێ پرسیاری لەبارەی جافەکانەوە لێکراوە، ئەویش وەک خۆی ئاماژەی بۆ کردووە لە نووسراوەکەیدا، بەرمەبنای شارەزایی لە باردۆخ و ڕەفتاری جافەکان و بوونی زانیاری لەبارەیانەوە، بەمەبەستی پێشکەشکردنی بە دەوڵەت، ئەم ڕاپۆرتە وردە خاڵ بە خاڵ دەنووسێت و لە ڕێگەی والی پێشووی بەغداد فایەق پاشا بۆ بابی عالی دەنێردێت، وەک خۆی دەڵێت، ئەگەرچی ئەوکات بەمەبەستی ناردنی بۆ بابی عالی ئامادەیکردووە، بەڵام ئەوەی ئەو ڕاپۆرتە گەشتووەتە دەستی بابی عالی یاخود نا لای ئەو نەزانراو بووە، بۆیە جارێکی تر خۆی ڕاپۆرتەکە لە کەرکوکەوە دەنێرێتەوە بۆ بابی عالی.[1]

نیازی نووسین و ناردنی ڕاپۆرتەکە هەرچییەک بێت هیچ لەو ڕاستییە ناگۆڕێت، لەبەرئەوەی ناوبراو هاوسەردەمی ڕووداوەکان بووە و خۆی فەرماندەی سەربازیی و مەیدانی بووە لەناوچەکەدا و زۆرێک لە ڕووداوەکانی بەچاوی خۆی دیوە و بەوردی سەرنج و تێبینییەکانی خۆی وردی لەسەر باردۆخی عەشیرەتی جاف تۆمارکردووە، کە هاوکارمان دەبێت لە ڕوونکردنەوە و ڕەواندنەوە تەمومژ لەسەر زۆر لایەنی کۆمەڵایەتیی و ئابووریی و کارگێڕی ئەوکاتی سەنجەقی سلێمانی

1 BOA. Y.PRK.ASK. 59.25.01.

بەگشتی و قەزای گوڵعەنبەر بەتایبەتی و جافەکانیش بەتایبەتی تر.

لەوەش گرنگتر ڕاپۆرتەکە زۆر زانیاری وردی لەسەر پرۆسەی نیشتەجێکردنی جافەکان دەخاتەڕوو، وێنای کێشمەکێشی نێوان سەرانی بەگزادەی جاف و دەسەڵاتداری لۆکاڵی دەوڵەتی عوسمانی لەسەر پرسێکی گرنگ و هەستیاری وەک نیشتەجێکردن و دەستبەردابوون لە گەرمیان و کوێستانی جافەکان بەڕوونی کێشاوە. لە ڕاپۆرتەکەشدا بەڕوونی دیارە، کە سەرانی بەگزادەی جاف و بەتایبەت محەمەد پاشای جاف زۆر دژی پرۆژەی نیشتەجیکردنی جافەکان بوون و تاڕادەی گیانبەختکردنی لەپێناو نیشتەجێنەبوونی جافەکان و هەتا کوشتنی لە ڕێکەوتی (١ی جماد الأول ١٢٩٩کۆچی/ ٤ی نیسانی ١٨٨٢زایینی)، لەگەڵ دەسەڵاتدارانی لۆکاڵی دەوڵەتی عوسمانی و ئەو تیرانەی عەشیرەتی جاف، کە مەیلیان لێبووە نیشتەجێبن بەربەرەکانێی کردووە.

ئەوەی گرنگە لێرەدا بگوترێت، پێویستە زانیارییەکانی ناو ئەم ڕاپۆرتە وەک خۆی و لە کۆنتێکستی خۆیدا بخوێنرێتەوە و بۆ هیچ مەبەستێک لە زەمین و زەمانی خۆ دانەبڕێنرێت و دەرنەهێنرێت. هەرچی مامەڵەکردنی بەندەشە لەگەڵ ئەم ڕاپۆرتەدا وەک توێژەرێکی بواری مێژووی عوسمانی مامەڵەیەکی تەواو بێلایەنانە و زانستییانە بووە، بەگوێرەی تێگەیشتن و توانا هەوڵمداوە بە ئەمانەتەوە مامەڵە لەگەڵ زانیارییەکانیدا بکەم، وەک بەشێک لە مێژووی کۆمەڵایەتی کورد لە سەدەی نۆزدەهەمدا وەک خۆی وەریبگێڕمە سەر زمانی کوردی. دواجار ئامانج و مەرامی سەرەتا و کۆتایی مێژوو پەندوەرگرتنە لە هەڵەکانی ڕابردوو. بەوهیوایەی ئەم هەوڵە خاکەڕاییەمان تۆزی سەر چەند لاپەڕەیەکی لە مێژووی کورد تەکاندبێت و گۆشە و کەلێنێکی بچووک پڕ بکاتەوە.

### دەقی ڕاپۆرتەکە

هەندێ زانیاری و لێوردبوونەوە لەبارەی جافەکانەوە(٢)

١. عەشیرەتی گەورەی جاف، کە ئاکنجی سەنجاقی سلێمانین و لە شەش هەزار ماڵی کۆچەر پێکهاتوون، لە ساڵی حەفتاونۆوە(واتا ١٢٧٩ک-١٨٦٢/١٨٦٣ز) باجی ساڵانەی بە یاسا ڕێکخراو بەگوێرەی دەفتر سێ یوک[٣] و چل هەزار قروش و

2 BOA.Y.PRK.ASK. 59.25.02.

٣ یوک: بەمانای بار دێت، باری ئەسپ، ئێستر، گا و وشتر... هتد، یەکەیەکی پێوانەی کێش بووە لە دەوڵەتی عوسمانیدا، کە قورسایی و بەهای ئەم یەکە جێگیرنەبووە و بەگوێرەی زەمین و زەمان

مەڕومالاتەکانیشیان بەمەرجی وەرگرتنی چل یەک واتا لە چل سەر یەک سەر ئاژەڵ، سی هەزار و حەوت سەت و پەنجا سەر مەڕ و بزن، سالانە بەشێوەی بڕاوە سی هەزار قروش، لە بارێکدا چۆن بە ڕاسپاردەی سالانە پێدانی سی سەرباز بە دەوڵەت ڕاسپێدرابوون. سەرۆکەکانی جاف واتا بەگزادەکان چۆن چۆنی لەو تەکالیفانەی دەوڵەت کەڵکی خراپیان (سوء استعمال)یان وەرگرتووە و چۆن چۆنی عەشایەری ناوبراویان پلیشاندووەتەوە و چۆن چۆنی بۆ نیشتەجێنکردنی خۆیان خراپەکارییان کردووە، بەند بەند بەشێوەی خوارەوە دەخەینە بەرباس و ڕوونیدەکەینەوە.

٢. جافەکان بەهۆی عادەتی دێرینەی خۆیان هەموو ساڵێک لە وەزی هاویندا دەپەڕنەوە ناو خاکی ئێران، جۆرەها ئاشوب و نائارامی ئەنجامدەدەن، بەوهۆیەوە دەوڵەتی ناوبراو دێتە دەنگ و دەعوا دەکات، ئەوەش دەبێتە هۆی قیل و قال و هۆکاری مشتومڕ و هەواڵگیڕی و سەوقککردنی سەرباز و ڕستێک تێچووی زیادە بۆ بەرپرسانی دەوڵەتی عەلییە( عوسمانی).

٣. بە ئامانجی قوتارکردنی عەشیرەتی ناوبراو لە بازنەی کۆچەرێتی و بردنیان بۆ ناو بازنەی مەدەنییەت و پاراستنی ئاسایشی ناوخۆ و بوونی هەرکەسێک بە خاوەن موڵک و ماڵ جگە لەو هەوڵانەی پێشووتر درابوون، لە ساڵی هەشتاو شەش( واتا ١٢٨٦ک-١٨٦٩ز)دا لە سەردەمی والی بەغداد مەدحەت پاشا، بەتایبەت محەمەد پاشا، کە ئەوکات خاوەنی پلەی (قاپوچی باشی) بوو، بانگێشتی بەغدادی دەکات و بە پلەی (میری میران) بە قایمقامی گوڵعەنبەر دایدەمەزرێنێت. بەشێوەی

---

گۆڕانکاری بەسەرداهاتووە. ئەمە کاتێکدا هەر بارێکی دیاریکراو لەگەڵ کالا جۆراوجۆرەکاندا دەگۆڕێت، کالا بەنرخەکانی وەک قوماش و ئاوریشم و بەهارات کێشێکی کەمێک ستانداردتریان هەیە. بۆ نمونە ١ باری ئاوریشم لە بورسا ١٥٥,٨٦ کیلۆ، لە ئەرزینجان ١٦١,٥٧٤ کیلۆ، لە ماردین ١٦٢,١٧٩ کیلۆ. باری ئاسایی ئاژەڵان کە پێی دەوترێت باری سەرەکی لە ڕۆژهەلاتی ئەنادۆڵ ١٦٢,١٤٤ کیلۆگرامە. باری وشترێک لە ناوچە شاخاوییەکانی ئەنادۆڵ ٣٩٠ کیلۆگرامە و لە ناوچە نزمەکاندا نزیکەی ٧٣٥ کیلۆگرامە. لە کۆتاییدا، یوک لەتۆمارە داراییەکانیشدا وەک زاراوەیەکی دارایی باسکراوە. لە تۆماری ڕوزنامچەی گەنجینە و تۆمارەکانی تری پەیوەست بە دارایی و پارەدا، ١ یوک ئاقچە وەک هاوتای(١٠٠،٠٠٠ ) سەت هەزار ئاقچە هاتووە. وشەی یوک لەم ڕاپۆرتەدا بەم مانا بەکارهاتووە، واتا یەک یۆک سەت هەزار ئاقچە بووە. بۆ زیاتر لەبارەی یوک، بڕوانە:

Ömer İşbilir, YÜK, osmanlı maliyesinde kullanılan bir ölçü birimi,https://islamansi klopedisi .org.tr/yuk .

تاپۆ تەواوی زەوییەکانی دەشتی شارەزووری بە بەراو و دێمەوە پێبدا، لە بەرانبەردا ناوبراو قەواڵەی پەیمانی نیشتەجێکردنی تەواوی جافەکان بدات بە حکومەت. والی ناوبراو وەک نیشاندانی نیازپاکی پلەی ناوبراوی پێدەدات و بە مووچەی پێنج هەزار قروش بە قایمقامی گوڵعەنبەر دایدەمەزرێنێت.

٤. گشت ئەو هاوکاریی و جیاووکانە لەپای ئاسانکاریکردنی محەمەد پاشا بۆ پرۆسەی نیشتەجێکردن بوو، بۆئەوەی وەکو ئەوانی پێش خۆی سنوور نەبەزێنێت، لەلایەن والی ناوبراو بە خەبەردارکردنی دەوڵەتی ناوبراو فەرهاد میرزا، کە لە سنەدا حاکم بوو لەگەڵ ژمارەیەک سەرباز دێنە سەرسنوور بۆ ڕێگری لێکردنیان و بەستنی ڕێگەی چوونیان و ماوەی دوو مانگ لە ناحییەی قزڵجە دەمێننەوە و کێڵگەکان تەلەف دەکەن و زیان بە خەڵکەکەی دەگەیەنن، بەهۆی ئەوەی لە ماوەی پەیمان پێدراوەدا پرۆسەی نیشتەجێکردن ئاکامێکی بەرچاوی نابێت والی ناوبراو سەرەڕای ئەوەی بە توندی و بە نووسرا فەرمان بە محەمەد پاشا دەکات، بڕیار دەدات پرۆسەکە بۆ ساڵی داهاتوو هەڵپەسێردرێت.

٥. ساڵی داهاتوو، کاتێک دەبینێت پاشا هیچ هەنگاوێک بۆ نیشتەجێکردن نەناوە، والی ناوبراو نامەیەکی سەرکۆنەکردن بۆ محەمەد پاشا دەنێرێت، ناوبراو بە بیانووی بێ بنەما وەڵامدەداتەوە و خەریکی کاتکوشتن دەبێت، مەدحەت پاشا ئاماژە بەوە دەکات دوو ساڵ تێپەڕیوە بەگوێرەی قەواڵەی پەیماننامەکە ئەگەر بەو نزیکانە جافەکان نیشتەجێ نەکرێن مامەڵەی توندت بەرانبەر دەگیرێتەبەر، لەکاتێکدا محەمەد پاشا گوێی بە فەرمانی توند و هەڕەشە ئامێزی نەدابوو والی ناوبراو محەمەد پاشای لەسەر کار لادابوو و پلەکەشی لێوەرگرتبوویەوە، ڕێک لەو کاتەدا بەهۆی ئەوەی والی بەغدا (مەدحەت پاشا) لە پۆستەی جیادەبێتەوە و موشیر ڕەئوف بەگ لە جێگەی بەوالی دادەنرێت مامەڵەی بەرانبەر بە محەمەد پاشا بە جێبەجێنەکراوی دەمێنێتەوە.

٦. لە ساڵی هەشتا و نۆدا (واتا ١٢٨٩ک/ ١٨٧٢-١٨٧٣ز)دا بۆ ڕزگاربوون لە دەستی زوڵم و ستەم و ئەوانەی ئارەزووی ئاکنجی بوونیان هەبوو، محەمەد پاشا ڕێگریان بوو، لە فیرقەی شاتری عەزیز شاوەیس و پێنج شەش کەس و لە فیرقەکانی ڕۆغزایی و هاروونی و ڕۆغزایی و میکائیلی بیست و حەوت کەسی خاوەن پایە دەچنە لای ڕەئوف پاشای والی بەغدا و داوای لێدەکەن لە ستەمی

تاقەتپڕوکێن ڕزگاریان بکات، چونکە ئارامییان نەماوە و داوا دەکەن فەرمانبەری نیشتەجێکردنیان بۆ دربکات، بەمەبەستی نیشتەجێکردنیان لە ویلایەتی ناوبراودا، لەگەڵ فەریق شەعبان پاشای فەرماندەی یەدەگ، میرئالای عەبدولڕەحمان بەگ دەکرێت بە مەئمور.

٧. پاشای ناوبراو بەهاتنی بۆ ناو خێڵەکان و هەریەکە لە کەسانی شارەزاو خاوەن زانیاریی و بێ پەیوەندی لەگەڵ بەگزادەکانی جاف یوزباشی یەدەگ (مەحمود) و مدیری ئەوراقی سلێمانی (سلێمانییەلی حاجی ئەفەندی) بۆ قەناعەتپێکردنی خێڵەکان، سەرەتا زەوییەکانی شێروانەی سەر بە قەزایی کفری بەشێوەی تاپۆ دەدرێت بە شاترییەکان و بەمەرجی ڕزگاربوونیان لە کۆتی ئەسارەتی پاشای ناوبراو و بەگزادەکانی جاف. لەبارەی نیشتەجێکردنیانەوە لەگەڵ فەرمانبەرێتی ناوبراو داوای دەستوەردانی موتەسەریفی سلێمانی بکەن. لەسەر بنەمای عەرزوحاڵەکان بە خەمڵاندن بڕی دوو یوک غروش وەک تەئمینات دراوە. محەمەد پاشا و بەگزادەکان بەرەو ئێران هەڵهاتوون و خەریکی تێکدانی باردۆخەکە و سەرقاڵکردنی حکومەتن، لەچوارچێوەی فێڵ و تەڵەکەکانی ئەمڕۆ قایمقامی گوڵعەنبەر مەحمود پاشای کوڕی ناردووە بۆ بەغداد و ئیختیاری مانەوەشی پێداوە.

٨. لەو سەروبەندەدا ڕەئوف پاشا لە پۆستی والیەتی جیادەبێتەوە و پاشا یەدەگەکان بۆ والییەتی، شەعبان پاشا و عەبدولڕەحمان بەگ دەگەڕێنەوە بەغدا، بەمەبەستی کردنەوەی محەمەد پاشا و بەگزادەکان بە تەبەعەی دەوڵەتی عوسمانی، عەبدولڕەحمان بەشێوەی خانەنیشینی، کە کرابوو بە مەئموری قایمقامییەتی عەشایەری جاف، بە دەستلەکارکێشانەوەی ئەمەی دواییان، هەرچی ڕەفعەت بەگیشە کە ئێستە لە سەنجاقی (نەجد) دامەزراوە، کە هەندێکیانی نیشتەجێکردبوو، لەکاتێکدا لە هەوڵی نیشتەجێکردنی بەشەکەی تریشیدا بوو، محەمەد پاشا بەهۆی هەندێ ئەزییەتدانی حکومەتی ئێرانەوە و ناردنی ئەو کەسەی لەلای شاوە بۆ والییەتی کرماشان نێردرابوو، لە ترسی پەڕینەوە بۆ لایەکیان لە ڕێگەی باش چاوشزادە ئەحمەد ئاغای ژنبرایەوە، کە ئەوکات ئەندامی ئیدارەی سلێمانی و ئەشرەف پاشا کە لە موتەسەریفییەتی سلێمانیدا بووە، گورزێکی لە ڕێوشوێن و هەوڵەکانی ڕەفعەت پاشا دەدات و لەئاکامدا ناچار بە دەستلەکارکێشانەوەی

دەکات. بەمەستی ڕاکێشانی محەمەد پاشا بەلای خۆیاندا ئاغایانی ناوبراو لەگەڵ قایمقامی قەزاکەدا بۆ لای جافەکان دەنێردرێن.

٩. لەگەڵ سەرهەڵدانی پێکدادان ناوچەکان بە دوو هەزار سوارە (ئەسپسوار) چووە بۆ جیهاد، سەرکردەی ناوبراو بە ئاگاداری ئەحمەد پاشا لە کۆتاییەکانی ساڵی نەوەدودوو (١٢٩٢ک/ ١٨٧٥ز) ئەشرەف پاشا بۆ کێشانەوەی محەمەد پاشا لە ئێران لەگەڵیدا پێکەوە دەیبات بۆ بەغداد و دووبارە قایمقامییەتی گوڵعەنبەری بۆ بەدەستدەهێنێتەوە و جافەکانی ڕادەست دەکاتەوە، بەوهۆیەوە جگەلە کەمکردنەوەی هەژموونی حکومەت، هەر لە سەرەتاوە تا بەئێستا دەگات داهاتی دەوڵەت ساڵ بە ساڵ کەمبووەتەوە و لە ناحیەی قزڵجەوە تا سەلاحییە(کفری) و قەرەتەپە کاولبوونی تەواوی ئاوایییەکانی لەلای هەمووان مەعلومە. بەو هۆکارەی ئاماژەی پێکرا لەناوچوونی موڵک و ماڵی سەنجاقی سلێمانی و کاروباری خەڵک و فەرمانبەران و کاربەدەستانی بووەتە جێگەی بەزەیی.

١٠. لەماوەی ئەو سێ ساڵەی محەمەد پاشا کە بە هەڵهاتوویی لە ئێران بووە، لەناو جافەکاندا هیچ کێشە و ناکۆکییەک ڕووینەداوە و ئاواییە وێرانبووەکانیش ئاوەدان و هەرکەس بە کەماڵی ئاسایش و ئارامییەوە خەریکی کشتوکاڵکردن بووە، ئەگەر داهاتەکانیش بە پێش خۆیی و دوای خۆی بەراورد بکرێت ئەوە بە ئاشکرا زیادبوونی پێوە دیارە.

١١. لە ساڵی نەوەتو پێنج( ١٢٩٥ک /١٨٧٨ز)دا، عەزیز شاوەیس، حەسەن، قەیتولی و دەلۆ لەگەڵ چەند کەسێکی ناسراو(معتبر)ی جاف لە سەردەمی سابت پاشا دەچنە سلێمانی و دوو مانگ دەمێننەوە، لەو ماوەیەدا بۆ نیشتەجێکردنیان دوای ناردنی چەندین تەلەگراف چەندین داواکاری و ئاە و فەریاد کارەکەیان کەڵکێکی نابێت و ڕێگەیان پێنادرێت نیشتەجێ بکرێن، بۆیە بەبێ ئومێدی و خەمباری دەگەڕێنەوە ناو خێڵەکانیان و محەمەد پاشا کە لەدەرفەتێک دەگەڕێت بۆئەوەی تۆڵەیان لێبکاتەوە، هەمان ئەو عەزیز شاوەیس و چەند کەسێکی بەناوبانگ بەند دەکات و بەرمەبنای شکایەتی لەو کەسانە ئەو بەندکراوانە ژەهرخوارد دەکات. بەهۆی لەناوبردنیان، دوای سێ ساڵ زۆربەی سەرانی عەشایەر بەڕێکەوتنی هەموویان محەمەد پاشای ناوبراو دەکوژن، لەسەر ئەو بنەمایەی ئەو (محەمەد پاشا)، کە ئەوانەی ئارەزووی نیشتەجێکرنیان هەبوو بەندی دەکردن و دەیکوشتن،

ئێمەش ئەومان کوشت، ئەمە بەئاشکرا لەلایەن سەرۆکی عەشیرەتەکانەوە گوتراوە.

١٢. لەگەڵ گەیشتنی هەواڵی کوشتنی محەمەد پاشا بە مەرکەزی ویلایەت بەمەبەستی ئەوەی جارێکی تر جافەکان ڕادەستی بەگزادەکان نەکرێتەوە لە چوارچێوەی پرۆسەی نیشتەجێکردندا لەلایەن ویلایەتەوە ئەو کارەم پێ سپێردرا و لەسەر بنەمای زانیارییەکانی پێشوویان هەردوو کەسایەتی پێشتر ناوهێنراو مەحمود و حاجی ئەفەندی بەهێنانیان بۆ زەردەلیکاو لەکاتێکدا لە ڕێگەدابوون هەموو عەشایرەکانی ئەو ڕێگە چووبوونە لایان و گوتبوویان "ئێمە لەو بەگزادە زاڵمانە ڕزگار بکەن، چەندان جار پەنامان بردووەتە لای حکومەت و فەرماندە سەربازییەکان بەزەییان نەنواندووە و ئێستە لەو شوێنانەی نیشاندەدرێت نیشتەجێ دەبین بەزەییەکتان بەحاڵماندا بێتەوە"!! بە گووتنی ئەو قسانە داواکاریان کردووە. بەگەیشتن بە گوندی ناوبراو کوڕی محەمەد پاشای کوژراو و قایمقامی گوڵعەنبەر مەحمود بەگ بەدوو بلۆک نیزامییەوە هاتە ئەوێ بە ئاگادارکردنەوەی ویلایەت فەرمانمدا مەحمود بەگ و بەگزادەکانی ترم ناردە سلێمانی بۆ دەستگیرکردنیان، مەحمود و عەبدوڵڵا بەگم ناردە مەرکەزی ویلایەت، بۆ ناردنی تەواوی بەگزادەکانی تر بۆ سلێمانی فەرمانمدا بچنە هەڵەبجە، بۆ تێگەیاندنی ناوەڕۆکی ئەو فەرمانەی بە فارسی لە ویلایەتەوە بۆ عەشایرەکان هاتبوو مەحمود و حاجی ئەفەندیم ناردە ناو عەشایرەکان، لە هەموو لایەکەوە عەشایرەکان دەهاتن و داوایان دەکرد حکومەت نیشتەجێیان بکات، لەکاتێکدا بەداخستنی ڕێڕەوەکان لە هەوڵی نیشتەجێکردندا بووین ناوبراوان مەحمود بەگ و عەبدوڵڵا بەگ لەلایەن مەرکەزەوە فەرمانێکیان هێنا، لەبارەی پێدانی ڕیاسەتی جاف بە عوسمان پاشا و هەرچۆنێک بوو لەماوەی چەند ڕۆژێکدا کارەکانیان ببینرێت.

دوای ئەوەی فەرمانم پێکرابوو بۆ پاراستنیان، دوو بلۆک نیزامییەیان لەگەڵدا بنێرم، دوای ناردنەوەی بەگزادەکان بەهاوڕێیەتی نیزامییە بۆ دەشتی شارەزوور زۆر بەداخ و پەژارەوە لەگەڵ مەفرەزەکەدا گەڕامەوە کەرکوک. ئەگەر بەو شێوە نەگەڕابایەمەوە ئەوا بەئاسانی و لە ماوەیەکی کورتدا لەگەڵ ئەو پازدە یوک قروش باقییاتەی لە زیمەی عەشایری ناوبراودا بوو لەگەڵ باجی ئەو ساڵە و مەڕوماڵات لە سایەی حەزرەتی پایەبەرز پادشاوە کۆدەکرایەوە و بە نیشتەجێکردنیش ئاسایش و ئاوەدانی دەگەڕایەوە و بوار بە خراپەکاریی و شەقاوەت نەدەدرا.

ئێستا لەکاتی گەڕانەوەی مەحمود بەگ و عەبدوڵڵا بەگ لە مەرکەزی ویلایەت لەلایەن ئەو ئەسپسوارانەی لەگەڵیاندا بوون موڵک و ماڵ و مەڕومالاتی ئەو گوندانەی لە ڕێگەدا پێیدا گوزەریان کردووە تالانکردووە. بەوجۆرە دوای کوشتنی پاشا لەلایەن دەستوپێوەند و پیاوەکانی بەگزادەکانەوە مەڕومالاتی پێنج سەت شەش سەت ماڵی عەشایریان تالانکردووە، خاوەن و کەسوکاری ئەو ماڵانەش دوای داواکردنەوەی مەڕومالاتە تالانکراوەکانیان پێیان نەدراوەتەوە و ئەو بێچارانە ڕسوا و سەرگەردان لەژێر پێیاندا دێن و دەچن.

١٣. لەکاتی کوشتنی محەمەد پاشا، کوڕەکانی سلێمان، محەمەد عەلی لەگەڵ بەهرام بەگزادە عەلی و ژمارەیەک بەگی تر بە بڕێک ئەسپسوارەوە لەناو قەزای کفریدا موڵک و ماڵی عەشیرەتی کاوخۆیان تالانکردووە و زۆر سوکایەتی و دەستدرێژییان کردووە، بەهۆی هەواڵدانی قایمقامییەتی کفری بە ویلایەت، ئەگەرچی بەندە ڕاسپێردرام بۆ گەڕانەوەی ئەو تالانیانە، بەڵام سەرەتا بەهۆی ئەوەی جافەکان چووبوونەوە بۆ دەشتی شارەزوور ئەو کارەم بۆ بەدینەهات، عەشایری ناوبراو لەچوونیان بۆ ییلاخ بەهۆی کاریگەری خراپی کەچڕەفتاری بەگزادەکان بەو جێگایانەی پێیدا تێدەپەڕین لەگەڵ ئەوەی ئاواییەکانیان کاول دەکرد و کێڵگە و زەوییە چێنراوەکانیان تەلەف دەکرد، خەڵکە گوێڕایەڵەکەشیان بەهۆی دەستدرێژیی و زوڵمی ئەوانەوە، کە خاوەن دەسەڵاتێکی لەڕادەبەدەربوون، بێگوێدانە جۆری زەوییەکان (بەراو بێت یان دێم) دەستبەرداری زەوییە باشەکانی خۆیان دەبوون و پەرێشانحالانە نیشتیمانی خۆیان بەجێدەهێشت و لە جێگەی تریش نیشتەجێ نەدەبوون و ڕەفتاری شەقاوەتیان دەگرتەبەر، بەوەش هێزێکی زیاتریان دەدا بە یاخییەکان، بەوجۆرە خراپەکاری وەها سەریان هەڵدەدا کە بەخەیاڵ و خاتری کەسدا نەیەت.

١٤. لە ساڵی حەفتاونۆدا (١٢٧٩ک/-١٨٦٢-١٨٦٣ )، لەوکاتەی عەزیز پاشا موتەسەریفی سلێمانی بوو، سەرژمێری کرابوو و قورعەکێشی کرابوو، بڕیاردرابوو هەموو ساڵێک بەشێوەی مەقتوع ئەوەی بەدەستدا بێت سی سەرباز ڕادەستی حکومەت بکرێت، لە ساڵی هەشتاو نۆوە (١٢٨٩ک/-١٨٧٢-/١٨٧٣ز) ئەو کەسانە نەدرابوو بە حکومەت، لەکاتێکدا بڕیار بوو هەموو ساڵێک لە جێگەی ئەو کەسانە پارە (بەدەل نەختینە) لە عەشایرەکان وەربگیرێت، ئەوەش تائێستا لەلایەن

حکومەتەوە ئەنجام نەدراوە.

١٥. لەکاتێکدا باجی بە یاسا بڕیارلێدراوی سەر جافەکان ساڵانە سێ یوک و چل هەزار قروش بووە، بەڵام بەگزادەکان لە هەر ساڵێکدا شەش حەوت یوک قروشیان کۆکردۆتەوە و بەشێکیان داوە و ئەوەی لێی ماوەتەوە شاردوویانەتەوە. لە ماوەی ساڵی نەوەت و سێ(١٢٩٣ک/-١٨٧٦-١٨٧٧) وە تاوەکو ئێستا زیاتر لە بڕی دوو ملیۆن باجی وەرگیراو بەرچاو دەکەوێت، ئەمە لە کاتێکدایە لە زمەی عەشایرەکاندا یەک ئاقچەش باقییات نەماوەتەوە، ئەگەرچی بەگوێرەی دەفتەرەکان خێڵەکان تەواوی قیستەکانیان داوە و ئیمزای بەگزادەکانیشی لەسەرە و سەنەدەکانیشی بەردەستە، بەڵام ئەو باقییاتانە کەوتوونەتە زمەی کێ، کەس نازانێت!

١٦. عەزیز پاشای ناوبراو کە ساڵی (١٢٧٩ک/-١٨٦٢-١٨٦٣ز) چووەتە شارەزوور، بڕیاریداوە مەڕوماڵاتی عەشایرەکان هەرچۆن بتوانرێت سەرژمێری بکرێت و بڕیاردراوە لە چل سەر سەرێک، بەمەش باجی مەڕوماڵاتی جافەکان بە بڕی سێ هەزار و حەوت سەد سەر مەڕ و بزن و سی هەزار قروش خەملێنراوە، کە پێویست بووە کۆبکرێتەوە، دواتر و لەسەر بنەمای داواکاری بەگزادەکان، داواکراوە کە مەڕوماڵاتی جافەکان بەبێ سەرژمێریی و بەشێوەی مەقتوع هەموو ساڵێک فەرمانبەرێک و کاتبێک بچێتە ناو جافەکان، بەرمەبنای ئەو داوکارییە دە ساڵە بەوجۆرە باجی مەڕوماڵات وەردەگیرێت، بەهۆی گەندەڵیی و خراپەکاری بەگزادەکانەوە هەموو ساڵێک، کە فەرمانبەر و کاتبێک دەنێردرێت بڕی ئەو باجە بۆ پێنج سەد شەش سەت سەر ئاژەڵ دابەزیوە، هەرچی بەگزادەکانە هەموو ساڵێک بەناوی باجی مەڕوماڵاتەوە چوار پێنج هەزار سەر مەڕ و بزن و ئاقچە زۆرباش وەردەگرن.

١٧. بەپێچەوانەی یاسا و دادپەروەری وڵاتەکەمان و هاوشێوەی لە هیچ وڵاتێکدا نەبینراو و نەبیستراو، چەندین جۆری باجی سەیر و نەبیستراو و باری گران لەلایەن بەگزادەکانەوە لە خەڵکی هەژار و بێدەرەتان دەسەنرێت. یەکەم (سەرانە)، ئەمە باجێک بوو لە هەر کەسێک وەرگیراوە، کە ژن بهێنێت یان کچەکەی بدات بەشوو، دەبوو ساڵانە یان (ماین، یان بارگیر یان گاجووت)ێک، یاخود دووسەد و پەنجا یان سێسەد قروش بدات. دووەم (ڕۆنانە)، گوزارشتێک بوو بۆ باجی ڕۆن، دەبوو هەر ماڵێک ساڵانە لە پێنج قییە ڕۆنەوە تاوەکو پەنجا قییە و زیاتریش ڕۆن

بدات. سێیەم (موانە)، باجی سەر مووی بزن، چوارەم (بەرکەتانە)، ئەمەش بە باجی سەر خوری مەڕ گوتراوە، پێنجەم (لبادانە)ش جۆرێکی تری باج بوو، شەشەم (تەرکانە)، ئەمەش بە باجی سەر چیخی قامیش گوتراوە، حەوتەم (دەرمالانە)، بەجۆرێکی تری باج گوتراوە کە لە خاوەنی هەرماڵێک سەنراوە جا چ ئاقچەی زۆرباش با یان ڕۆن یان موو و خوری مەڕ و بزن بووایە، یاخود لێسەندنی شتەیلێکی لەوشێوە و ستەمکردنی تاقەتپروکێن تا بە ئەمڕۆش(ساتی نووسینی ڕاپۆرتەکەن) لەناو عەشایرەکاندا بوونی هەرماوە.

١٨. ئەو زەوییە بەراو و دێمانەی ساڵی (١٢٨٩ک/ ١٨٧٢-١٨٧٣ز) شەعبان پاشا و عەبدولڕەحمان بەگ بۆ نیشتەجێکردنی جافەکان بەشێوەی تاپۆ بە خەڵکی عەشایریان دابوو، چەند ساڵێک بەر لە ئێستا هەمووی لەلایەن بەگزادەکانەوە تاپۆکانیان بەزۆر لە خەڵکەکە سەنراو خرانەسەر ناوی خۆیان، ئەگەر لێکۆڵینەوەی ورد بکرێت، ئەوە بە ڕوون و ئاشکرایی دەردەکەوێت.

١٩. ناحیەی وارماوا، کە سەر بە قەزای گوڵعەنبەر بووە و لە سی چل ئاوایی پێکهاتبوو، کە هەموو زەویی و کێڵگەکانی لە دێرین زەمانەوە ئاوەدان بوون و کاتی خۆی بەمەبەستی کشتوکاڵ تێداکردن زەوییەکانی بەشێوەی تاپۆ بە خەڵکەکەی درابوو، بەگزادەکان بە بیری خراپەکارییان و  بەمەبەستی دەستگرتن بەسەر ئەو زەوییانەدا کەوتوونەتە زوڵم و دەستدرێژیکردنێکی بێئەندازە و زۆربۆهێنەرانە بۆ سەر خەڵکی ناوچەکە، خەڵکەکەش بێ بەرگریکردن ناچاربوون زەوییەکانیان بەجێهێشتووە و ماڵەکانیان بۆ خاکی ئێران گواستووەتەوە. بەمەش تەواوی ئەو زەوییانە چۆڵکراون و بە بەتاڵی جێهێڵراون، دواتر بەگزادەکان ئەو زەوییانەی چۆڵکراون بەشێوەی زیادکرن و لە بەرانبەر (بەدەل)دا ئەو زەویی و زارانەیان بەو کەسانەی تاڵبی بوون فرۆشتوویانن، ئەمە لەکاتێکدایە ئەو مامەڵانە پێچەوانەی حوکم و فەرمانەکانی یاسای زەویی و زاری همایونی بووە، کە خاوەنی ئەو زەویی و زارانە ئامادەنەبوون.

هەرچۆنێک بێت مامەڵەی نیزامی ئەو زەویی و زارانە ڕاستی نەهاتووە و بە ئەنجام نەگەشتووە، فەرمانبەری دەفتەری خاقانی ( تاپۆ)ی سلێمانی ڕۆشتووە بۆ قەزای ناوبراو و بەشێوەی غیابی مامەڵەی ئەو زەوییە چۆڵانەی کردووە بەناوی کوڕێک  لە بەگزادەکانی جاف کە ناوی عەبدوڵڵا بەگ بووە و تەمەنی

تەنها پێنج شەش ساڵان بووە. ئەگەرچی ئەو مامەڵە بە ئاشکرا دیار و بەرچاوە کە پێچەوانەی یاسایە، بەڵام بۆ ئەوەی ئەوە بەتەواوی بخرێتەڕوو و ئاشکرا بکرێت پێویستە کاربەدەستێک بۆ ئەو پرسە دابمەزرێنرێت و بچێتە ئەوێ بۆ لێکۆڵینەوە.

٢٠. لە ناحیەی (شەمێران و شەک میدان)ی سەر بە قەزای گوڵعەنبەر، ئەو ئاوانەی لە چەند کانی و سەرچاوەیەک هەڵدەقوڵان و ڕووبارێکی گەورەیان پێکهێنابوو، لەپای ئەو ڕووبارە چل پەنجا هەزار دۆنم زەوی گەورە و فراوان هەبوو، لەکاتێکدا ئەگەر بخرایەتە زیادکردنەوە(مزایدە) بە پێنج یوک مشتەری هەبوو، بەبێ موزایەدە و بە بەدەلی چوار هەزار قروش کراوە بەناوی کوڕێکی عوسمان پاشای جافەوە، چۆن لەلایەن فەرمانبەری دەفتەری خاقانییەوە تاپۆ و قەواڵەی پێدراوە، ئەوەش بەهۆی ئەوەوە بووە، کە ناوبراو براکەی (مەحمود پاشای جاف) قایمقامی گوڵعەنبەر بووە، کە فەرمانبەری ناوبراو چووە بۆ ئەوێ و زەوییەکی وەها گەورە و فراوانی بەبێ موزایەدە بە (٤٠٠٠) قروش لەسەر ناوی منالێک تاپۆکردووە، ئەوەش زیانگەیاندنێکی ئاشکرایە بە خەزێنەی دەوڵەت. لەکاتێکدا بۆ فرۆشتنی زەوی بەراوی وەها چەندین فەرمان هەیە، کە دەبێت بە موزایەدە بفرۆشرێت، بەڵام ناوبرا خودسەرانە و بەوجۆرە بە نرخێکی جوزئی تاپۆی کردووە و فرۆشتویەتی، ئەو ڕەفتارە خودسەرانەی فەرمانبەری ناوبراو و هەرچی قایمقامی گوڵعەنبەریشە، بە خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات و چۆنییەتی زیانگەیاندنی بە خەزێنەی دەوڵەت ڕوون و ئاشکرایە.

جگەلەوەش لە قەزای ناوبراودا، لە چەند جێگەیەکی تر و بەهۆی ئەو ئاوانەی لە سەرچاوەی بچووک هەڵقوڵاون زەویی بەراوی تر، کە بەبێ بوونی حەقی ئیقرارکردن فەرمانبەری ناوبراو بەهەر هۆکارێک بێت حەقی ئیقراری پێداون، بەهۆی ئەوەی بەو ڕادەیە ماڵی میری بەفیڕۆداوە و زیانی پێگەیاندووە پێویستە ناوبراو لەلایەن حکومەتەوە لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکرێت و لەو جێگەیە دەربکرێت و پارێزگاری لە لەناوبردنی دەرامەتی دەوڵەت بکرێت و لە جێگەی ئەو فەرمانبەرێکی دەستپاک دابنرێت.

٢١. لە ساڵی سێ سەد(١٣٠٠ک/١٨٨٢--١٨٨٣ز)دا جارێکی تر ژمارەیەک لە پیاوماقوڵانی عەشایەری ناوبراو هاتنە کەرکوک داوای ئاسانکاریی نیشتەجێکردن و ڕزگارکردنیان لە دیلی بەگزادەکانیان لە پایە بەرزەکانی دەوڵەت کردووە، کاتێک

بۆ وەڵامدانەوەی ئەو دۆخە حەواڵەی لای والی پێشوو تەحسین پاشاکراون، نابراو میرئالای بەکر سدقی بەگی ناردووەتە ناو جافەکان، لەگەڵ بەگزادەکاندا دیداری کردووە و ناوبراو ئەوەی پێیگوتراوە و پێی سپێردراوە فیداکارانە بەجۆرێک ئەنجامیداوە، کە هەم بووەتە جێگەی سوپاسی والی ناوبراو و هەمیش کارەکەی بەجۆرێکی تری وەها چارەسەرکردووە، کە ببێتە هۆی ڕازیکردنی بابی عالی و هەمیش سەرانی جاف و بەگزادەکانی جافیش منەتداری خۆیکردووە، ئەگەرچی بە فەرمی ڕایگەیاندووە، کە کەچڕەفتارییەکانی عەشایری ناوبراو زیانی بە خەڵکانی تر گەیاندووە و ڕاستی باردۆخەکە بۆ هەموولایەک دیار بووە.

**پێشنیازی ڕێوشوێنەکان بۆ نیشتەجێکردنی عەشیرەتی جاف**

٢٢. بۆئەوەی ئەو خێڵانە لە ڕێگەی نیشتەجێکردنەوە ببن بە هاوڵاتی دڵسۆز و لەدەستدرێژیی و زیادەڕۆیی بپارێزرێن و لە دەوارنشینەوە بکرێن بە نیشتەجێ و بە کشتوکاڵکردن و کشتیاریی بژین و پشوو بدەن، هەنگاو و ڕێوشوێنی لەپێشینە و پێویست بریتییە لەوەی، مەحمود پاشای جاف، کە ئێستا قایمقامی گوڵعەنبەرە لەسەر کارلاببرێت و سەرۆکایەتی جاف بەشێوەیەکی یەکجارەکی هەڵبوەشێنرێتەوە، پاشای ناوبراو و براکانی پەیوەندییان بەو ناوچەوە ببڕێنرێت، تاوەکو پرسی نیشتەجێکردن بەئەنجام دەگەیەنرێت لە پایتەخت نیشتەجێبکرێن، دواتریش بە هیچ جۆرێک نەهێڵرێت بگەڕێنەوە ئەو ناوچە، ئەمانە بۆ پرسی نیشتەجێکردن بابەتێکی گرنگ و پڕبایەخە.

٢٣. دوای دوورخستنەوەی ئەوان و ڕاگەیاندنی هەڵوەشاندنەوەی یەکجارەکی سەرۆکایەتی جاف لەناو عەشایرەکاندا، ئینجا کەسێکی بەدەسەڵات و شارەزا لە بیروبۆچوونی دەوڵەت و عادات و تەقالیدی جافەکان و کەسێکی بە شەرەف و خاوەن لێوەشاوەیی بە قایمقامی قەزای گوڵعەنبەر دابمەزرێنرێت. ئەگەر لەڕێگەی یاسا دانراوەکانەوە هەوڵی لابردنی خراپییەکانی ئێستا و ڕابردوو بدرێت، ئەوا لە ماوەیەکی کەمدا تەواوی ئەو دەرامەتانەی دەوڵەت بە نایاسایی لەدەستچوون و لەگەڵ گەڕانەوەی خۆشگوزەرانی خەڵک بۆ ڕادەی پێشووی کارێکی ئاشکرا دەبێت.

٢٤. دوای بەجێگەیاندنی ڕێوشوێنەکان بەوجۆرە، کە دێینە سەر شێوازی نیشتەجێکردن، لەبەرئەوەی عەشایری ناوبراو وەک ئەوەی لەسەری ڕاهاتوون هەموو ساڵێک لە کۆتایی مانگی مارتدا ڕوودەکەن کوێستانەکان و لە سەرەتایی

مانگی تشرینی یەکەمدا دەگەڕێنەوە بۆ ئەم ناوچانە ( گوڵعەنبەر)، لەبەرئەوە دەبێت نیشتەجێکردنیان لە مانگی نیسان یان تشرینی یەکەمدا بێت، ئەوەش کارێکی نکوڵی لێنەکراوە. بۆئەوەی پرۆسەی نیشتەجێکردن بەتەواوی جێبەجێ بکرێت، دەبێت یەکەم کار سێ تابوور سەرباز ئامادە بکرێت، یەکێکیان لە سەگرمە، ئەویتر لە پەیکوڵیی و سێیەمیشیان لە دەربەندباسەڕە نیشتەجێ بکرێت. بەجێگیرکردنی ئەو هێزانە ڕێگا سەرەکییەکان بگیرێت و هەرچی ڕێگە لاوەکییەکانی تریشە بە دە کەسی سەربازی ببەسترێت.

بەوجۆرە کاتێک خۆیان بە گەمارۆدراوی دەبین، ئەوکات بۆ جێبەجێکردنی بنەما و ڕێساکانی نیشتەجێکردن فەرمانبەری تایبەت هەڵبژێردرێت و بەپشتیوانی خودا و ژمارەیەک سوارە پرۆسەکە دەستپێبکرێت، پرۆسەکە لە ماوی بیست ڕۆژدا کۆتایی پێ دێت و پێویست بە باسکردن ناکات، چونکە ئەمانە کاتی خۆیشی گوند و زەوییان هەبووە، بەڵام سەرۆکەکانیان ڕێگەیان نەداوە خانوو دروست بکەن و کشتوکاڵ بکەن، ئێستا مادام جەور و ستەمی بەگزادەکان و زاڵییەتی سەرۆکەکانیان لەسەر نەماوە و تەئمیناتی ڕاستەقینە و بەهێزیان دراوەتێ، ئیدی ئەو خێڵانەی کە لە شەش حەوت هەزار دەوارنیشین پێکهاتبوو هەر زوو دەستدەکەن بە خانوو دروستکردن و ئەو زەوییانەی، کە ساڵانێکی زۆربووە نەکێڵراون و دانەچێنراون دەستدەکرێت بەکێلان و چاندنیان، هەتا وەک زەربولمەسەلێک دەگوترێت تا نزیک ناحیەی سەنگاو دادەچێنرێت و بەگیان و دڵ هەوڵی داچاندنی دەدەن. بەوەش ئەو ناحییە شەست حەفتا سەعات مەسافەی بووە سەرتاپایی شین و ئاوەدان دەبێت، بەوجۆرە دەبێتە جێگەی چاوتێبڕین و چاولێکەری لەلایەن تەواوی خەڵکی ناوچەکە. بەهۆی ئەمانەوە تەواوی ئەو زەرەروزیانەی بە هۆی هاتن و چوون بەسەر خەڵک و موڵک و ماڵ و کێڵگەکانیاندا دەهات بەتەواوی کۆتایی پێدێت، بەوەش موڵک و ماڵی تایبەت و میللەت خەزێنەی دەوڵەت چۆن سودی لێوەردەگرێت و دەبێتە چ سەرچاوەیەکی داهات و سامان، ناخەملێنرێت و پێوانە ناکرێت!

ئەگەر بێینە سەر بابەتی ئاژەڵ و مەڕوماڵاتەکان، ئەگەر وابێت بە خەیاڵدا، ئەگەر بێتو لە وەرزی هاویندا ئاژەڵەکان نەبرێنە کوێستان لەناودەچن، بەهەمان شێوەی خەڵکەکەی تر چۆن لەهاویندا مەڕوماڵاتەکانیان بە شوانێکدا ناردۆتە کوێستا، دەکرێت جافەکانیش وەکو ئەوان مەڕوماڵاتەکانیان تەنها بە شوانەکاندا

بنێرنە کوێستان( واتا خۆیان نیشتەجێ بن و هەموو ماڵە جافەکان لەگەڵ ئاژەڵ و مەڕوو ماڵاتەکانیاندا نەڕۆنە کوێستان).

٢٥. بەوجۆرە لەگەڵ بەجێگەیاندنی پرۆسەی نیشتەجێکردن و کۆتاییهێنان بە جەور و ستەم و دەستدرێژی، بۆئەوەی ئەو گوندانەی کە ئاوەدان دەکرێنەوە ڕێکبخرێن و زەبت بکرێت و تایبەتمەندێتی و بەرژەوەندییەکان لەبەرچاوبگیرێت بوونی مەرجەعێک مەرجی سەرەکییە. ڕەنگە گوڵعەنبەر بەو مەرجەعە وەربگیرێت، بەڵام لەبەر زۆری گوندەکان و دووری مەودای نێوانیان وادەکات کاروباری میریی و ڕووبەڕوبوونەوەی یاخیبووەکان وەکو پێویست ئەنجام نەدرێت، ئەمە لەکاتێکدایە بەهۆی ستەم و زۆرداریی و شەقاوەتی هەمەوەندەکان وەک بەشێک لە مولحەقاتەکانی سلێمانی، زۆربەی گوندەکان زیانیان بەرکەوتووە و چۆڵ و کاولبوون. بۆ ئەو مەبەستەش قەزای قەرەداغ، کە بێبایەخ ماوەتەوە و کراوە بە ناحیە دووبارە بکرێتەوە بە قایمقامییەت و بۆ نیشتەجێکردنی عەشایری ناوبراو. ئاوەدانکردنەوەی گوندەکانی ناوچەی چەمەڕەش (چمرش)، کە کەوتبووە ناوەڕاستی سەلاحیە (کفری) و قەزاکانی خودی قەرەداغ و گوڵعەنبەر و ناحییەکانیان بەمەبەستی کردنی بە مەرکەزێک قەزایەکی تێدا دابمەزرێنرێت و قایمقام و فەرمانبەرانی تری بۆ دابمەزرێنرێت، سوودێکی گەورە و لە بن نەهاتووی بۆ حکومەت و سیاسەتی دەوڵەت و ناوچەکە دەبێت، ئارامیی و ئاسایشیش بۆ ئیستراحەتی خەڵکەکەی پێویستە. بەوپێیە ئەنجامدانی ئەو کارە لە سنووری دەسەڵاتی بەرزی بەڕێزتانایە.

٢٦. مەعلومی جەنابتانە چ قەزای گوڵعەنبەر و چ عەشایری جاف لەبەرئەوەی سەر بە سەنجەقی سلێمانین، کاتێک کە مەحمود پاشا لاببرێت و سەرۆکایەتی جاف هەڵبوەشێنرێتەوە و ئەوانە لەگەڵ بەگزادەکاندا ببرێن بۆ مەرکەزی ویلایەت و وەک بەشێک لە پلانی نیشتەجێکردن، ئەگەر بابەتی تەشکیلکردنی قەزایەک لە ناحییەی سەنگاو بە موتەسەڕیفییەتی سلێمانی رابگەیەنرێت لەبەر نەبوونی زانیاریی و شارەزایی موتەسەڕیف، حەواڵەکردنی ئەو پرسە بۆ مەجلیسی ئیدارەی لیوا کارێکی سروشتی دەبێت، ئەمە لەکاتێکدایە، کە بەهۆی ئەوەی زۆربەی فەرمانبەرانی لیوا و مەشایەخ و پیاوماقوڵانی ئەو ناوچە لەگەڵ بەگزادەکانی جافدا تێکەڵییان هەبووە، لەکاتی خستنەبەرباس و خواسی بابەتی ناوبراو، لەبەرئەوەی ڕاستەوخۆ بەربەرژەوەندییە کەسییەکانیان دەکەوێت، ئاشکرایە

بەلەبەرچاوگرتنی کەوتنەمەترسی بەرژەوەندییەکانیان، لەکاتی هاتنەبەرباسی زیانەکانی جێبەجێنەکردنی پرۆسەی نیشتەجیکردن و بەدیهێنانی شارستانیبوون و ئارەزووی ئەسناف و بازرگانەکان، ئەندامانی مەجلیسی ئیدارەی سلێمانی بە ناچاری لە هەمبەر هەموو ئەوانەدا بێدەنگی هەڵدەبژێرن. هەموو ئەو خاڵانەی شەرح و شرۆڤەکران لەلایەن هەموو ئەوانەی ئارەزووی بەرژەوەندی دەوڵەت و میللەت دەکەن بەڕاستی لە پەسن و پەسەندکردنیاندا گومان ناکرێت.

هەموو ئەو لێکۆڵینەوانەی کردوومن و لەمبارەشەوە ئەوەی بە چاوی خۆم دیومن، لەبارەی شێوازی ئیسلاحکردنی جافەوە، وەک لەسەرەوە بەند بە بەند ڕوونمکردووەتەوە و خستوومەتەڕوو و بۆ کاری پێویست عەرزی جەنابی بەرز و بەڕێزتانی دەکەم.

فەرماندەی فیرقەی دوازدە

فەریق

بەندە

مۆر

سەید ئیبراهیم ئەدهەم

### پاشکۆی لایحە[٤]

وەک لەلایحەکەدا هاتبوو، مەحمود پاشا بە دابڕانی لە بەگزادەکانی جاف ئێستە لەگەڵ محەمەد عەلی بەگی برایدا لەئەستەموڵە، براکەی عوسمان پاشا بووەبە قایمقامی قەزای گوڵعەنبەر و دوو برای تریشی بە هۆکاری زانرا مردوون، ئیستە لەگەڵ عوسمان بەگدا دوو برای تریشی هەیە سلێمان وعەبدولفەتاح بەگ کە ئێستە لە گوڵعەنبەرن.

---

4 BOA.Y.PRK.ASK. 59.25.03.





٥

علاوهٔ مطالعات

مقدماً لایحه‌ده عرض اولنان جاف بکزاده‌لرندن محمود پاشا ذاتاً انفصال ایدلرک برادری
محمد علی بکله برابر الیوم درسعادتده بولندیغی کبی برادری عثمان بکده کلعنبر قضاسی
قائمقامی اولوب ایکی برادر بیننده کچنده علت معلومه ایله وفات اتمش ایسه‌ده الیوم
موقعی ایله عثمان بکله دها ایکی برادری اولان سلیمان و عبدالفتاح بکلر کلعنبرده اولدقلری
عرض اولنور فرمان



Y.PRK.ASK.00059.00025.003



# شێخ مستەفای خەرپانی
## لە ئەرشیفی مەشیخەتی عوسمانیدا



**د.هێمن عومەر خۆشناو**

بنەماڵەی زانای گەورە شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی هەر لە کۆنەوە ڕۆڵێکی گەورەی زانستییان لە ناوچەی هەڵەبجە و بگرە تەواوی کوردستان هەبووە، بەتایبەتی شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی، کە مامۆستا و ئیجازەدەری زۆر لە زانا گەورەکانی کورد بووە. یەکێک لە نەوەکانی ئەو زانا گەورەیە شێخ مستەفای موفتیی هەڵەبجەیە. ئەگەرچی لەنێو سەرچاوەکانی مێژووی زانایانی کورددا شتێکی کەمی لەسەر گوتراوە و نووسراوە، بەڵام لەنێو دۆسیەی مەشیخەتی ئەرشیفی عوسمانیدا- کە تایبەتە بەو زانایانەی بە ڕەسمیی لە دەوڵەتی عوسمانیدا ناسێنراون چەند زانیارییەکی لەبارەوە دەبینرێت، لەگەڵ زانیارییەکانی تردا دەبنە بەشێک لە مێژووی ژیانی ئەم زانایەمان.

## ناوی تەواوی:

وەک لە بەڵگەنامەکەدا هاتووە و خۆی ژیاننامەکەی نووسیوەتەوە، ئاماژە بەوە دراوە، کە ناوی سەید مستەفا کوڕی سەید مەحموود[1] کوڕی زانای گەورە سەید مەلا عەبدوڵڵای ئەفەندیی خەرپانییە. مامۆستای مودەڕیس لە کتێبی (علماؤنا فی خدمة العلم والدین) ناوی ئەو زانایە و ئەو بنەماڵەیەی تەنیا بە شێخ هێناوە، کەچی لە بەڵگەنامەکەدا لەبری شێخ پێشناوی سەییدی بۆ دانراوە و لە هەمان کاتیشدا لە ئیجازەنامەکەشیدا ناوی بە سەید مستەفا هاتووە.

## ساڵ و شوێنی لەدایکبوونی:

مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس، بۆ لەدایکبوونەکەی ساڵی ١٢٩٥ی کۆچی داناوە، کەچی خۆی لەو بەڵگەنامەیەی کە بۆ دەوڵەتی عوسمانی نووسیویەتی ساڵەکەی بە مانگی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی ١٢٨٨ی کۆچی بەرامبەر مانگی نیسانی ساڵی ١٢٨٧ی ساڵی مالیی داناوە و شوێنی لەدایکبوونیشی قەسەبەی هەڵەبجە ناوەندی قەزای گوڵعەنبەر بووە. ئەم مێژووەی ناوبراو بۆ خۆی نووسیویەتی دەکاتە بەرانبەر کۆتایی مانگی مایس و سەرەتای مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٨٧١ی زایینی. بەڵام هەر لەنێو دۆسیەکەیدا تەزکیرەی دەوڵەتی عوسمانی دەبینرێت و لەوێدا ناوی بە شێخ مستەفا کوڕی شێخ مەحموود هاتووە، وادیارە ئەوکاتە تەمەنی حەوت ساڵی بووە و مێژووی لەدایکبوونی بە ساڵی ١٢٩٥ نووسراوە. لەلایەکی ترەوە خۆی لە ساڵی ١٣٣٢ی کۆچیدا لە کاتی نووسینی داواکارییەکدا ئاماژەی بەوە داوە، کە تەمەنی ٣٨ ساڵە، واتە هەر نزیک دەبێتەوە لە ساڵی ١٢٩٥ی کۆچی.

---

١ مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس لە کتێبەکەی خۆیدا وەها شێخ مەحموودی ناساندووە: شێخ مەحموود کوڕی شێخ عەبدوڵڵای خەرپانیی تەکیەییە، لە ساڵی ١٢٥٠ی کۆچی لە گوندی خەرپانی لەدایکبووە، واتە پێش مردنی باوکی بە چوار ساڵ، ناوبراو بچوکترین کوڕی شێخ عەبدوڵڵا بووە و لەلای برایەکانی پەروەردەی وەرگرتووە. دوای فێربوونی قورئانی پیرۆز و کتێبە بچووکەکان، ئەنجا لە مەدرەسەکەی باوکیدا دەستی بە خوێندن کردووە، کە لەوسادا یەکێک بووە لە مەدرەسە هەر بەناوودەنگەکان. دوای ئەوە بۆ خوێندن زۆر شوێنی کوردستان گەڕاوە، دوایین شوێن چووەتە کەرکووک و دوای تەواوکردنی خوێندن و وەرگرتنی ئیجازەی زانستیی، لە مزگەوتی گەورەی هەڵەبجە جێگیر بووە و هەر لەوێ بووە ئیمام و وتارخوێن و مودەڕیس و موفتی، ئیدی بەردەوام دەبێت تا خوای گەورە لە ساڵی ١٣١٩ی کۆچی بۆ لای خۆی دەباتەوە. (علماؤنا فی خدمة العلم والدین، عبدالکریم المدرس، ص ٥٥٩).

## خوێندنی تا ئیجازە وەرگرتنی:

وەک خۆی ئاماژەی پێ کردووە خوێندنی سەرەتایی کە بریتی بووە لە قورئانی پیرۆز و تەجوید و فێربوونی فارسی و عەرەبی و تورکی لە مەدرەسەی شێخ مەحموود ئەفەندی باوکی بووە و دواتر زانستەکانی نەحوو و سەرف و مەنطق و وەضع و بەیان و بەلاغەت و حیکمەتی خوێندووە و پاشان هەر بۆ خوێندن چووەتە مەدرەسەی بیارەی موبارەکە و لە خانەقا و مەدرەسەی پۆستنشینی تەریقەتی نەقشبەندی حەزرەتی شێخ عومەر ئەفەندی[٢] دا و لە خزمەتی مەلا عەبدولقادر ئەفەندی[٣] زانستەکانی تەواوکردووە و لە ڕۆژی ٧ی جەمادی یەکەمی ١٣١٥ک/ ١٨٩٧/١٠/٤ز ئیجازەی مەلایەتی هەر لای ئەو زاتە وەرگرتووە.

بە پێی بۆچوونی مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس، شێخ مستەفا لە کاتی خۆیدا بۆی نەلواوە ئیجازە وەربگرێت و گەڕاوەتەوە هەڵەبجە بۆئەوەی لە شوێنی

---

٢ شێخ عومەر زیائوددین (١٨٣٩/٨/٧ز- ١٩٠١ز) کوڕی شێخ عوسمانی سیراجەدینە، لە گوندی بیارە لەدایکبووە، لای باوکی پەروەردە کراوە و دوای ئەوەی کەمێک پێگەیشتووە باوکی ناردوویەتی بۆ تەکیەی تاڵەبانی لای شێخ عەبدولڕەحمانی تاڵەبانی، ئەویش لەگەڵ شێخ عەلی خالصی کوڕی خۆی دادەنێت و بەیەکەوە لای سەید محەمەدی مزگەوتی بلاغ دەست بە خوێندن دەکەن. دواتر دەگەڕێتەوە هەورامان و لای مەلا حامیدی کاتب و چەند مامۆستایەکی تر درێژە بە خوێندن دەدات. دوای مردنی باوکی و هەروەها شێخ محەمەد بەهائەدینی برای، سەرپەرشتی تەریقەت دەکات و چەند خانەقایەک لە ناوچە جیاوازەکان دەکاتەوە، لەنێویشیاندا لە بیارە مەدرەسەیەک دادەمەزرێنێت و مەلا عەبدولقادری کانی کەوەیی تێدا دەکاتە مودەڕیس. شێخی ناوبراو خزمەتێکی گەورەی بە لایەنی زانستیی کردووە و هەر لە مەدرەسەکەیدا بە دەیان و سەدان زانا پێگەیشتوون. (بۆ زانیاری زیاتر لەوبارەیەوە بڕوانە علماؤنا فی خدمة العلم والدین، ل ٤١٢).

٣ ناوی عەبدولقادر کوڕی شێخ عەبدولڕەحمان کوڕی سەید یوسفە، بە بنەچە دەگەڕێنەوە سەر باپیرە گەورەیان ئەبوبەکری موسەنیفی چۆڕی. لە ساڵی ١٢٨٠ی کۆچی لە گوندی کانی کەوەی ناحیەی بازیان لەدایکبووە و هەربۆیە بە مەلا عەبدولقادری کانی کەوە ناسراوە. لە سلێمانی لای مەلا عەبدولڕەحمانی پێنجوێنی خوێندوویەتی و دواتر چووەتە لای مەلا ئەحمەدی نۆتشی و لای ئەو ماوەتەوە هەتا ئیجازەی لەسەر دەستی ئەو وەرگرتووە. دواتر بووەتە مودەڕیسی گوندی کوچک چەرمۆی سەر بە شاری سنەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان. لە ساڵی ١٣٠٣ی کۆچی شێخ عومەری زیائودین بەدوایدا دەنێرێت، کە بێتە بیارە و لە مەدرەسەکەیدا دەرس بداتەوە. ئەویش مۆڵەت لە مەلا ئەحمەدی نۆتشی مامۆستای وەردەگرێت و بەدەم بانگهێشتەکەی شێخی زیائودین دەچێتە بیارە و لەوێش شێخی زیائودین فاتیمەی کچی خۆی دەداتێ. مامۆستای کانی کەوەیی زۆر لێهاتوو بووە و خزمەتێکی بێ سنووری کردووە و زۆر مامۆستای گەورەی لەسەر دەستی پێگەییون. ئیتر هەر لە بیارە دەمێنێتەوە تا کۆچی دوایی لە ساڵی ١٣٣٨ی کۆچی و هەر لەوێ لە بەرامبەر ئارامگای شێخ عومەری زیائودین دەنێژرێت. (بڕوانە: علماؤنا فی خدمة العلم والدین، ل ٣٠٩).

باوکی دابنیشێت، بۆیە ئەو کاتەی دەیانەوێت فەرمانی فەتوادانی بۆ دەربکەن، داوای ئیجازەی عیلمی لێ دەکرێ و لەسەر ئەوە کارەکەی دەوەستێت. بۆ ئەو مەبەستە چوونەتە بیارە بۆ خزمەتی مەولانا عەبدولقادری کانی کەوەیی، ئەویش فەرمانی بە شێخ حەیدەری کوڕی شێخ عەلی تەوێڵەیی خەلیفەی شێخی سیراجەدین کردووە، کە خۆشنووسێکی چاک بووە، ئیجازەنەمەکەی بۆ بنووسێتەوە. مەولانا عەبدولقادریش ئیجازەنامەکەی بۆ مۆرکردووە و ناردوویانەتە ئەستەنبوڵ تا فەرمانی فەتوادانەکە بۆ شێخ مستەفا دەربچێت.[٤]

ئیجازەنامەکەی مامۆستا مەلا عەبدولقادری کانی کەوەیی مودەڕیسی مەدرەسەی بیارە بۆ شێخ مستەفا ئاوا دەستپێدەکات: الحمد لله الذی دل بذاته علی ذاته وتقدس فی صفاته عن شائیة النقص وسماته وشهد علی وحدانیته نظام ملکه وانتظام مصنوعاته وزین السماء الدین بنجوم العلماء الراسخین....... وبعد فیقول العبد العاجز الفقیر المعترف بکمال التقصیر فی الباطن والظاهر عبدالقادر ابن عبدالرحمن افاض الله علیهما شأبیب الرحمة.....

له ئیجازەنامەکەدا ئیجازەدەر ناوی ئیجازەوەرگر وەها دێنێت: الفاضل المکرم قرة عیون اهل الود والوفا ونور صدقة اصحاب الصدق والصفا اخی وحبیبی السید مصطفی وفقه الله تعالی بمنه وفضله لما یحبه ویرضی... وەک ئاشکرایە و خۆیشی لە ئیجازەنامەکەدا باسی کردووە مامۆستای ئیجازەدەر ئیجازەی لە مامۆستا عەبدولقادری موهاجیر و مامۆستا مەلا ئەحمەدی نۆتشەیی کوڕی مەلا عەبدولڕەحمانی نۆتشەیی وەرگرتووە، کە ئەویش لە مەلا محەمەدی خەتێ و ئەویش لە مەلا عەبدولڕەحمانی ڕۆژبەیانی و ئەویش لە سیبغەتوڵڵا ئەفەندیی ماوەرانیی.... هتد وەرگرتووە.

لە کۆتایی ئیجازەنامەکەدا مامۆستا مەلا عەبدولقادر ناوی خۆی وەها نووسیوە: الداعی المدرس بقریة بیارە: عبدالقادر. هەروەها لە پەراوێزی ئیجازەنامەکەدا وەک تەسدیقکردنێک، شێخ عومەری زیائوددین دوعای خێری بۆ کردووە و نووسیویەتی: اللهم اجعل الشیخ مصطفی مروجا للعلم بالعلم والعمل، واجعل له

---

٤ نوسخەیەکی ئیجازەنامەکە لە ئەرشیفی مەشیخەتە لە ئەستەنبوڵ، وادیارە نوسخەیەکیش لەلای بنەماڵەکەیان ماوە، هەروەک مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس لە بنەماڵەی زانیاراندا ئاماژەی پێداوە. (بڕوانە: بنەماڵەی زانیاران، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، ل ٢٠٨).

نورا یهتدی به الی الرشد، اللهم اغفر لی ولوالدی وصلی علی النبی وآله اجمعین، وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمین. الداعی خادم الفقراء النقشیة والقادریة: ضیاء الدین عمر العثمانی.

ئەم ئیجازەنامەیە دواتر لە ساڵی ١٣٣٢ی ڕۆمیدا لە ئەنجومەنی کارگێڕیی قەزای گوڵعەنبەر(هەڵەبجە) تەسدیق کراوە.

## شێخ مستەفا و دەرسدانەوە و موفتییاتی لە هەڵەبجە:

دوای وەرگرتنی ئیجازە، شێخ مستەفا لە بیارەوە دەگەڕێتەوە هەڵەبجە و هەر لە مزگەوتەکەی باوکی دەبێتە ئیمام و وتاربێژ و مودەڕیس. دوای چەند ساڵێک و لە ساڵی ١٣٢٥ی ڕۆمی بە مووچەی مانگانەی چوارسەد قرووش لە فەرمانگەی ئیفتای هەڵەبجە دادەمەزرێت. وەک خۆیشی ئاماژەی پێداوە جگە لە موفتیاتی، کە بەشێوەی ڕەسمیی دامەزراوە، لە مزگەوتی گەورە وتار و دەرسدانەوەی خۆبەخشانە و بەخۆڕاییە.

هەر لەنێو دۆسیەکەیدا و لە بەڵگەنامەیەکدا ئاماژەی بەوە داوە، کە تەمەنم بۆتە ٣٨ ساڵ و لە ٢٩ی صەفەری ١٣٢٨ک/ ١٩١٠/٣/١١ز بوومەتە موفتیی قەزای گوڵعەنبەر و لە کارەکەی خۆم بەردەوامم، تا ئێستا هیچ ڕوتبە و نیشانێکی دەوڵەتیم نەدراوەتێ. سەبارەت بە بەرهەمی نووسراویشی وەک خۆی ئاماژەی پێداوە زمانەکانی تورکی و فارسی، بەتایبەتیش عەرەبی باش دەزانێت و تا مێژووی نووسینی تەزکیرەکە هیچ بەرهەمێکی نووسراوی نەبووە.

## ئەم چەند بەڵگەنامەیە کە مۆری خۆیشی تێدایە و وەک تەزکیرە هاوپێچی کردووە، ٢١ی ڕەجەبی ١٣٣٤ک/ ١٩١٦/٥/٢٤ز لەسەر نووسراوە.

بیست ساڵی کۆتایی ژیانی ئەم زانایەمان، وەک مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس ئاماژەی پێداوە وێڕای ئەوەی لە ناوەندیی هەڵەبجە و لە مزگەوتی گەورە خزمەتێکی بێپایانی بە خەڵک و زانست و زانایان کردووە، بەڵام لە دوو لاوە تووشی پەرێشانیی بووە، یەکێکیان لە ساڵی ١٩٢٠ و لە سەردەمی هاتنی سوپای داگیرکەری ئینگلیز و سزادانی لەلایەن ئینگلیزەوە، لەبەرئەوەی شێخ مستەفا دژیان وەستاوەتەوە. ئیتر ناوبراو ناچار دەبێت زۆربەی زۆری موڵک

و ماڵەکەی بفرۆشێت، هەروەها تووشبوونی بە نەخۆشیی پرۆستاتیش لەلایەکی ترەوە، بەڵام شێخ ڕەسوڵی کوڕی شێخ محەمەدی تەکیەیی، کە خاڵی منداڵەکانی بووە، نەیهێشتووە مزگەوت و مەدرەسەکەی بێناز ببێ و لەو ڕووەوە هاوکار و پشتیوانێکی گەورەی بووە.

شێخ مستەفای موفتیی لە ساڵی ١٣٥٧ی کۆچی (بەرامبەر ساڵی ١٩٣٨ی زایینی) لە شاری هەڵەبجە چووەتە بەر دلۆڤانی خودا و هەر لەوێش نێژراوە. دوای ئەو شێخ جەمیلی کوڕی لە جێگەی دانیشتووە و لە خزمەت بەردەوام بووە.

## سەرچاوەکان:


✓علماؤنا فی خدمة العلم والدین، عبدالکریم محمد المدرس، دار الحریة للطباعة، بغداد ١٩٨٣.

✓بنەماڵەی زانیاران، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، بەرگی دووەم، چاپخانەی شەفیق، بەغدا، ١٩٨٤.


کۆدی ئەرشیفی مەشیخەت:

✓ IST-MFT-MSH-SAİD-0190-0014-4-2741B



ئامادەکردنی: د.سامان سەڵاح

# ڕەوشی خوێندنی میری لە گوڵعەنبەر (هەڵەبجە)

## لە بەڵگەنامەیەکی دەوڵەتی عوسمانیدا

لەماوەی ئەم چەند ساڵەی ڕابردوودا، توێژەرانی کورد کۆمەڵێک بەڵگەنامەی نوێیان لە ئەرشیفی عوسمانییەوە خستەڕوو، کە ڕووناکیان خستە سەر چەندین لایەنی شارەوە لە مێژووی کورددا. لەو ڕێیەوە، زانیاری لەسەر ناو و ژیاننامەی چەندین کەسایەتی کوردستان لە قۆناغی تەخمین و ناڕوونییەوە چوویە قۆناغێکی زانستی بەڵگەدارەوە. ئەم بەڵگەنامەیەش کە لێرەدا خراوەتە ڕوو، یەکێکە لەو بەڵگەنامە گرنگانەی، کە هەندێک زانیاری گرنگ لەبارەی سروشتی خوێندن و ئەو وانانەوە ئەخاتە ڕوو، کە لە ساڵی ١٩١١دا لە قوتابخانەی سەرەتایی قەزای گوڵعەنبەردا خوێندراوە کە ئەوکاتە سەنتەری قەزاکە هەڵەبجە بووە.

وەک لە خشتەکەدا دیارە، ناوی وانەکان بە زمانی عەرەبی و کاروباری ڕەسمی قوتابخانەکە بە زمانی تورکی بووە. وانەکان بەشێوەیەکی گشتی بابەتی ئایینی، بیرکاریی و خۆشنووسییان لەخۆگرتووە. هەر لە خشتەکەدا ناوی چەندین کەسایەتی شارەکە کە ئەوکاتە قوتابی سەرەتایی یان پێش سەرەتایی بوون هاتووە، کە ڕەنگە گرنگترینیان، ئەحمەد موختار جاف، داود نیازی (داود بەگ)، عەبدوڵڵا سلێمان (گۆرانی شاعیر) و حیلمی شاعیر بن. لە خوارەوە بەڵگەنامەکە کە لە سێ خشتەی سەرەکی پۆلەکانی یەکەم، پۆلی یەدەگ و بەشی یەدەک پێکهاتوون دانراون، نووسینە تورکییەکانی سەر خشتەکە تەرجەمەکراون و ناوی وانەکان کە بە زمانی عەرەبین وەک خۆیان دانراونەتەوە.

ئەوەی تێبینی ئەکرێت ئەوەیە، کە ناوی هەموو قوتابییەکان پاشگری ئەفەندی پێوەیە و بۆ بەستنەوەیان بەناوی باوکیانەوە وشەی بن (ابن)ی عەرەبی بەکارهێنراوە و لێرەدا وەرگێڕدراوە بۆ (کوڕی) کوردی.

وەرگێڕدراوی بەڵگەنامەکە:

ناو و خوێندنی چەندین کەسایەتی گرنگی شاری هەڵەبجە، وەکو ئەحمەد موخ

خشتەی تاقیکردنەوە گشتییەکانی قوتابخانەی سەرەتایی قەزای گوڵعەنبەر سەر بە سەنجاقی سلێمانی:

| سالی ١٣٢٩-١٣٣٠ کۆچی | | | پۆلی یەکەم | | | | | | سالی ١٣٢٧-١٣٢٨ هەتاوی | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| پلەبەندی لە قوتابخانە | شوێنی لە دایکبوون | ناو و نازناوی قوتابییەکان | ناوی وانەکان | | | | | | | | | |
| | | | قران معجز البیان | علم حال شریف | حساب ذهنی | قرائت | املاء | حسن خط | کۆ نمره | نمرەی ئاکار | پلەی پۆل | تێبینییەکان |
| ١ | هەڵەبجە | محەمەد نەزهەت ئەفەندی کوڕی سلێمان بەگ | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ٦٠ | ١٠ | ١ | یەکەمی پۆل |
| ٢ | هەڵەبجە | ئەحمەد حەمدی افندی کوڕی محەمەد بەگ | ١٠ | ١٠ | ٩ | ٩ | ١٠ | ١٠ | ٥٨ | ١٠ | ٥ | بەرزبوونەوە |
| ٣ | هەڵەبجە | ڕەشید مدحت ئەفەندی کوڕی علی افندی | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ٦٠ | ١٠ | ٢ | دووەمی پۆل |
| ٥٠ | هەڵەبجە | ئەحمەد ڕەفعەت ئەفەندی کوڕی عەبدوڕەحمان ئەفەندنی | ١٠ | ١٠ | ٨ | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ٥٨ | ١٠ | ٦ | بەرزبوونەوە |
| ٥ | شەترە | مستەفا مەدحی ئەفەندی کوڕی والی ئاغا | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ٨ | ٨ | ٩ | ٥٥ | ١٠ | ٨ | وەک پێشوو |
| ٨ | هەڵەبجە | ڕەشید فائیز ئەفەندی کوڕی نادر ئاغا | ١٠ | ١٠ | ٧ | ٩ | ٥ | ٧ | ٤٨ | ١٠ | ١٤ | وەک پێشوو |
| ٧ | هەڵەبجە | ئەمین ناطق ئەفەندنی کوڕی مەحمود ئاغا | ٩ | ١٠ | ١٠ | ٩ | ٩ | ٦ | ٥٣ | ١٠ | ٩ | وەک پێشوو |
| ١٤ | بالیکندەر | شێخ مستەفا ئەفەندنی کوڕی شێخ ئەمین ئەفەندی | ١٠ | ١٠ | ٦ | ٩ | ٨ | ٩ | ٥٢ | ١٠ | ١٠ | وەک پێشوو |
| ١٢ | شەترە | کەریم موکەڕەم ئەفەندنی کوڕی والی ئاغا | ١٠ | ١٠ | ٦ | ٩ | ٨ | ٩ | ٥٢ | ١٠ | ١٠ | وەک پێشوو |
| ١٤ | هەڵەبجە | ئەمین مونیر ئەفەندنی کوڕی مەلا محەمەد ئەفەندنی | ١٠ | ١٠ | ٩ | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ٥٩ | ١٠ | ٤ | چوارەمی پۆل |
| ١٣ | هەلەبجە | مەحمود سامی ئەفەندی کوڕی مەلا ئەحمەد ئەفەندی | ١٠ | ١٠ | ٩ | ٩ | ١٠ | ٩ | ٥٧ | ١٠ | ١٧ | بەرزبوونەوە |
| ٥٢ | هەڵەبجە | ئەحمەد موختار ئەفەندی کوڕی عوسمان پاشا | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ١٠ | ٦٠ | ١٠ | ٣ | سێیەمی پۆل |
| ١٠ | هەڵەبجە | عەلی زەکی ئەفەندی کوڕی شێخ مستەفا ئەفەندی | ١٠ | ١٠ | ٨ | ٧ | ٥ | ٨ | ٤٨ | ١٠ | ١٠ | بەرزبوونەوە |
| ٦ | هەڵەبجە | ئەحمەد حیلمی ئەفەندی کوڕی باوڵ ئاغا | ٨ | ١٠ | ٧ | ٦ | ٥ | ٦ | ٤٢ | ١٠ | ١٦ | وەک پێشوو |
| ٩ | هەڵەبجە | تۆفیق فایەق ئەفەندی کوڕی حاجی عەلی ئەفەندی | ٩ | ١٠ | ٨ | ٧ | ٨ | ٧ | ٤٩ | ١٠ | ١٢ | وەک پێشوو |
| ١٥ | ئەباعوبەیدە | سەید جەعفەر ئەفەندی کوڕی سەید فەتاح ئەفەندی | ٩ | ١٠ | ٦ | ٥ | ٣ | ٥ | ٣٨ | ١٠ | ١٧ | وەک پێشوو |
| ٤ | هەڵەبجە | ساڵح سالم ئەفەندی کوڕی مەحمود ئاغا | ٩ | ١٠ | ٨ | ٧ | ٥ | ٦ | ٤٥ | ١٠ | ١٥ | وەک پێشوو |

| سالی ٣٢٩-٣٣٠ کۆچی | | | پۆلی یەدەک | | | | | | سالی ٣٢٧-٣٢٨ی هەتاوی | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| پلە بەندی لە قوتابخانە | شوێنی لە دایکبوون | ناو و نازناوی قوتابییەکان | ناوی وانەکان | | | کۆنمرە | ئاکارجوانی | نمرەی پۆل | تێبینییەکان |
| | | | ئەلفوبێی عوسمانی | حیسابی زیهنی | خۆشنوسی | | | | |
| ١٦ | هەڵەبجە | عەبدولا ئەفەندی کوڕی سلێمان بەگ | ١٠ | ١٠ | ٤ | ٢٤ | ١٠ | ٨ | بەرزبووەوە |
| ١٧ | هەڵەبجە | سلێمان بەهجەت ئەفەندی کوڕی محمد بەگ | ١٠ | ١٠ | ٥ | ٢٥ | ١٠ | ٥ | بەهەمان شێوە |
| ١٨ | هەڵەبجە | مەحمود شەوکەت ئەفەندی کوڕی خالس ئەفەندی | ١٠ | ١٠ | ٦ | ٢٦ | ١٠ | ٣ | بەهەمان شێوە |
| ١٩ | هەڵەبجە | محمد راغیب ئەفەندی کوڕی عەزیز ئاغا | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ئامادەی تاقیکردنەوە نەبوو |
| ٢٤ | هەڵەبجە | عەلی غالب ئەفەندی کوڕی کەیخەسرەو ئاغا | ٩ | ٨ | ٣ | ٢٠ | ١٠ | ١٥ | بەرزبووەوە |
| ٢٠ | بالیکندەر | محمد فکری ئەفەندی کوڕی شێخ ئەمین ئەفەندی | ٩ | ٧ | ٦ | ٢٢ | ١٠ | ١١ | بەهەمان شێوە |
| ٤٧ | عەشیرەت ی جاف | عەبدوڵلا موخلس ئەفەندی کوڕی حاجی عەبدولڕەحمان ئاغا | ٩ | ١٠ | ١٠ | ٢٩ | ١٠ | ١ | یەکەمی پۆل |
| ٥٣ | هەڵەبجە | محەمەد موحسین ئەفەندی کوڕی عەزیز ئاغا | ٩ | ٨ | ٧ | ٢٤ | ١٠ | ٧ | بەرزبووەوە |
| ٢٨ | هەڵەبجە | محەمەد عادل ئەفەندی کوڕی شێخ قادر ئەفەندی | ٨ | ٦ | ٨ | ٣٣ | ١٠ | ١٢ | بەهەمان شێوە |
| ٥٥ | هەڵەبجە | سەعید سەعدی ئەفەندی کوڕی فەرەج ئاغا | ٨ | ٩ | ٨ | ٢٥ | ١٠ | ٤ | بەهەمان شێوە |
| ٣٣ | هەڵەبجە | ئەحمەد جەمیل ئەفەندی کوڕی والی ئاغا | ٩ | ١٠ | ٤ | ٢٣ | ٩ | ١٠ | بەهەمان شێوە |
| ٢٢ | هەڵەبجە | سالح سولحی ئەفەندی کوڕی دەروێش ئەمین ئاغا | – | ٨ | ١ | ٩ | ٩ | ٠ | ماوە (کەوتوو) |
| ٣٩ | هەڵەبجە | محەمەد نورەدین ئەفەندی کوڕی حاجی ئەمین ئەفەندی | ٩ | ٩ | ٣ | ٢١ | ٩ | ١٣ | بەرزبووەوە |
| ... | هەڵەبجە | محەمەد واسیف ئەفەندی کوڕی ... ئەحمەد ئاغا | ٧ | ٩ | ٣ | ١٩ | ٩ | ١٦ | بەهەمان شێوە |
| ٤٩ | هەڵەبجە | مەحمود سائب ئەفەندی کوڕی | ٩ | ٥ | ٦ | ٢٠ | ١٠ | ١٤ | بەهەمان شێوە |

| | | عەبدورەحمان ئەفەندی | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٤٦ | هەڵەبجە | رەزا سەیدی ئەفەندی کوڕی عەبداللە ئاغا | ٦ | ٣ | ٣ | ١٢ | ٥ | ٠ | ماوە |
| ٤٤ | هەڵەبجە | عەلی تالب ئەفەندی کوڕی عەبدولکەریم ئاغا | ١٠ | ٤ | ٣ | ١٧ | ٨ | ١٩ | بەرزبووەوە |
| ٤١ | هەڵەبجە | عەبدولا مەهدی ئەفەندی کوڕی سەعید ئاغا | ٧ | ٤ | ٣ | ١٤ | ٦ | ٠ | ماوە |
| ٢٦ | هەڵەبجە | محەمەد کەمال ئەفەندی کوڕی عبدالصمد ئەفەندی | ٧ | ٧ | ٣ | ١٧ | ٨ | ١٩ | بەرزبووەوە |
| ٣٦ | هەڵەبجە | سەعید سیدقی ئەفەندی کوڕی ئەحمەد ئاغا | ٧ | ٥ | ٣ | ١٥ | ٨ | ٢١ | بەرزبووەوە |
| ٣٠ | هەڵەبجە | ڕەشید شەوقی ئەفەندی کوڕی کەیخەسرەو ئاغا | ٧ | ٢ | ١ | ١٠ | ٦ | ٠ | ماوە |
| ٣٢ | هەڵەبجە | ڕەشید زەکی ئەفەندی کوڕی ڕەسول ئاغا | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | بەشداری تاقیکردنەوەی نەکرد |
| ٣٧ | هەڵەبجە | فەرەج لوتفی ئەفەندی کوڕی مەحمود ئاغا | ٥ | ١ | ١ | ٧ | ٥ | ٠ | ماوە |
| ٢٧ | ئەستەمبوڵ | سالح فەیزی ئەفەندی کوڕی ئەحمەد ئاغا | ١٠ | ٦ | ٩ | ٢٥ | ٧ | ٦ | بەرزبووەوە |

| سالی ٣٢٩-٣٣٠ کۆچی | | | بەشی یەدەک | | | | | سالی ٣٢٧-٣٢٨ی هەتاوی | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ژ.لە بەندی لە قوتابخانە | شوێنی لە دایکبوون | ناو و نازناوی قوتابییەکان | ناوی وانەکان | | | کۆنمرە | ئاکارجوانی | نمرەی پۆل | تێبینییەکان |
| | | | ئەلفوبێی عوسمانی | حیسابی زیهنی | خۆشنوسی | | | | |
| ٣٥ | هەڵەبجە | عەبدولقادر ڕمزی ئەفەندی کوڕی ئەمین بەگ | ٨ | ٥ | ٥ | ١٨ | ١٠ | ١٧ | بەرزبووەوە |
| ٣٨ | هەڵەبجە | سەید نووری ئەفەندی کوڕی شێخ عارف ئەفەندی | ٣ | ٣ | ٢ | ٨ | ١٠ | ٠ | ماوە |
| ٢٧ | هەڵەبجە | محەمەد فەخری ئەفەندی کوڕی ئەمین ئاغا | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | بەشداری تاقیکردنەوەی نەکرد |
| ٢٩ | هەڵەبجە | ڕەشید ڕەشیدی ئەفەندی کوڕی مەحمود ئاغا | ٤ | ٣ | ٢ | ٦ | ١٠ | ٠ | ماوە |
| ٤٠ | هەڵەبجە | سەید ئەحمەد ئەفەنی کوڕی حاجی مەلا عەزیز ئەفەندی | ٥ | ٤ | ١ | ٦ | – | – | ماوە |
| ٥٤ | هەڵەبجە | ئەحمەد شاکر ئەفەندی کوڕی حاجی عەزیز ئاغا | ٦ | ٨ | ٣ | ١٧ | ١٠ | ٢٠ | بەرزبووەوە |
| ٥٧ | هەڵەبجە | محەمەد کەریم ئەفەندی کوڕی محەمەد عەلی ئاغا | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ئامادەی تاقیکردنەوە نەبوو |
| ٣١ | هەڵەبجە | محەمەد فەوزی ئەفەندی کوڕی ئەحمەد ئاغا | ٣ | ٠ | ١ | ٤ | ٥ | ٠ | ماوە |
| ٤٢ | ئەستەمبول | تۆفیق ئەفەندی کوڕی ئەحمەد ئاغا | ٠ | ٠ | ٠ | ٣ | ٦ | ٠ | ماوە |
| ٥٦ | هەڵەبجە | ساڵح زەوقی ئەفەندی کوڕی حەسەن ئاغا | ٤ | ٠ | ٠ | ٤ | ٦ | ٠ | ماوە |
| ٥٨ | هەڵەبجە | ئەمین زیاد ئەفەندی کوڕی ساڵح ئاغا | ٢ | ١ | ٠ | ٣ | ٥ | ٠ | ماوە |
| ٥٤ | هەڵەبجە | ئەمین جەوهەر ئەفەندی کوڕی سەلیم ئاغا | ٣ | ٤ | ٠ | ٧ | ٦ | ٠ | ماوە |
| ٢٥ | هەڵەبجە | عەلی هادی ئەفەندی کوڕی ئەحمەد سلێمان ئاغا | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | بەشداری تاقیکردنەوەی نەکرد |
| ٥١ | هەڵەبجە | کەریم نەدیم ئەفەندی کوڕی عەلی ئاغا | ١ | ٠ | ٠ | ١ | ٤ | ٠ | ماوە |
| ٤٨ | هەڵەبجە | داود نیازی ئەفەندی کوڕی عوسمان پاشا[١] | ١٠ | ١٠ | ٨ | ٢٨ | ١٠ | ٢ | دووەمی پۆل و |

[١] داود بەگ، کە بە داودبەگی عەبابەیلێ یان داودبەگی جاف ناسراوە، کوڕی حەمەسەعید بەگی کوڕی عوسمان پاشای جاف کوڕی محەمەد پاشای جافە، لە گوندی عەبابەیلێی چەند کیلۆمەتر ڕۆژهەڵاتی هەڵەبجە و بناری شنروێ دانیشتووە و کۆشکێکی گەورەی بۆ خۆی هەر لەو گوندە دروستکردووە، هەتا ئێستاش پاشماوەی کۆشکەکەی ماوە.

|  |  |  |  |  |  |  |  |  |  |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
|  |  |  |  |  |  |  |  |  | بەرزکرایەوە |
| ٥٩ | سلێمانی | عەباس حیلمی ئەفەندی کوڕی شێخ مەعروف ئەفەندی | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | بەشداری تاقیکردنەوەی نەکرد |
| ٤٢ | عەشیرەتی جاف | محەمەد سابت ئەفەندی کوڕی مستەفا بەگ | ٩ | ١٠ | ٥ | ٢٤ | ١٠ | ٩ | بەرزبووەوە |
| ٢٣ | عەشیرەتی جاف | مەحمود حەسەن ئەفەندی کوڕی فەقێ ئەحمەد ئەفەندی | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | بەشداری تاقیکردنەوەی نەکر |
| ٦٠ | عەشیرەتی جاف | حەسەن حوسنی ئەفەندی کوڕی وەیس ئەفەندی | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | بەهەمان شێوە |

لە ماوەی ساڵی خوێندنی ٣٢٧-٣٢٨ دا، بەپێی مەعریفەتی بچووکمان لەو تاقیکردنەوە گشتیانەی، کە ئەنجامدارون لە شەست قوتابی ئامادەبوو، سی و هەشتیان دەرچوون بۆ پۆلی دواتر و بیست و هەشتیشیان وەک دەرنەچوو دیاریکران و پشتڕاستکرایەوە. بە سێ پارچە خشتە، بەپێی ڕێنماییەکان یەکێکیان گلدرایەوە و دووانیشی ڕەوانەی بەڕێوەبەرایەتی بەرزی مەعاریفی موسڵ کرا. لە ٥ ئەیلول ٣٢٨.



لە پەراوێز و لابەلای دەستنووسەکان هەندێکجار چەند خەتێک دەبینیت، کاتێک لێی دەڕوانیت و لێی دەکۆڵیتەوە، هەندێک مێژووی نووسراوت بۆ دەخەنە ژێر پرسیار و لێکۆڵینەوەی ترەوە، هەربۆیە دەبێت هەمیشە لێکۆڵینەوەکان بەکراوەیی بهێڵرێتەوە، وەگەرنا ڕۆژێک بەهۆی ئەو پەراوێز و نووسینانەوە لێکۆڵینەوەکانت دەکەونە ژێر پرسیار و لێکۆڵینەوەی ترەوە و ئەوەی لە پێشوودا نووسیوتە، دەخرێتە پەراوێز و لێی ناڕوانرێت.

لەم ماوەیەدا مامۆستا عادل سدیق بەرگەیەکی دەستنووسی بۆ ناردم، بۆئەوەی لێی بکۆڵمەوە و بۆی بنێرمەوە، کاتێک لێی وردبووینەوە، بۆمان دەرکەوت ئەم دەستنووسە، کە پەڕەیەکە لە دەستنووسێکی تری مەحموود پاشای جاف، وەکو لێی کۆڵراوەتەوە ئەم دەستنووسە بەرگی یەکەم یان سێیەمی هەمان دەستنووس بێت، کە کاک عەبدوڵڵا حەبیبی لە دوو بەرگدا چاپ و بڵاویکردەوە، لەم چاپەدا بنکەی ژین و هۆشمەند جافی نەوەی مەحموود پاشا و دوکتۆر حەسەن جاف هاوکاریی تەواویان کرد.

ئەوەی بنچینەی ئەم بابەتەیە، پەراوێزێکە بە خەتێکی ڕەش و ئیمزایەک، هەروەها شیعرێکی فارسییە بە خەتێکی تازەتر و بە مەرەکەبی سوور نووسراوەتەوە.

ئەو پەراوێزەی بە مەرەکەبی ڕەش نووسراوە، لە سەرەوەی لاپەڕەکەدا نووسراوە: «وفات صاحبەام خانم روز یکشنبە ٢٧ شهر صفر سنە ١٣٤٣. امضاه». لێرەدا ئیمزاکە نازانین کێیە!

ئەو شیعرەیشی کە بە خەتێکی سوور لەگەڵ پەراوێزێکدا نووسراوە، بەم شێوەیەیە: «تاریخ وفات مرحومە خانم حرم مرحوم عثمان پاشا.

**از روز اولینش تا آخرین دم دهر**
**ناورد کس بە خاطر این از گمان جدا بود**
**دریای جود گردد خشک و کرم نماند**
**یعنی وفات خانم این وقعە از خدا بود**
**تاریخ رحلتش را پرسیدم از خرد گفت**
**این‌طور گفتە احمد شهنشهی سخا بود**

حقیقت مانند نداشت، یعنی احمد بیگ محمد بیگ بیگزادە ولدبیگی، ١٣٤٣ روز یکشنبە، بیست و هشتم شهر صفر».

ئەم دوو مێژووەی دانراوە لەم لاپەڕەدا ڕۆژەکە و مانگەکە و ساڵەکەیان یەکێکە، بەڵام مێژووی ڕۆژەکە جیاوازە، بۆ ئەم کارەیش پێویستە بگەڕێینەوە بۆ ڕۆژژمێرەکان و لەو ڕێگەیەوە مێژووەکە ڕاستبکەینەوە.

سەرەتا بۆ ساغکردنەوەی ساڵەکە، کە لە شیعرەکەدا هاتووە، لە کۆتایی بەیتی کۆتاییدا شاعیر دەڵێت: اینطور گفته احمد شهنشهی سخا بود. وشەی «شهنشهی سخا بود» بەپێی ژمارەی ڕیزبەندی پیتەکان دەکاتە ساڵی ١٣٤٣ی کۆچی، ئەم ساڵەیش بەرامبەر بە ساڵی زایینی ١٩٢٤. لە هەردوو پەراوێزەکە و شیعرەکەیشدا ساڵەکان وەکو یەکن و گرفتی تێدا نییە، هەروەها مانگەکەیش هەردووکیان سەفەرن و ڕۆژی هەفتەکەیش هەردووکیان یەکێکن و کێشەی تێدا نییە، وەکو وتمان تەنیا لە مێژووی ڕۆژەکەدا گرفت هەیە، ئەویش یەک ڕۆژە، بۆ ساغکردنەوەی ئەو ڕۆژەیش پێویستە بەپێی ڕۆژژمێر ساغ بکرێتەوە، ئێمە لێرەدا بەپێی دوو ڕۆژژمێری ئەلیکترۆنی هەوڵی ساغکردنەوەکە دەدەین و بەوێنە نیشانی دەدەین.

وەکو وتمان یەکیان نووسیویەتی ڕۆژی یەکشەممەی ٢٧ی سەفەر و ئەوی تریشیان دەڵێت ڕۆژی یەکشەممەی ٢٨ی سەفەر، ئەگەر تەماشای وێنەی یەکەم و دووەم بکەیت، کە مێژووی ٢٧ی سەفەرمان داناوە:

**Hijri = Gregorian Converter**

Copyright © by Adel A. Al-Rumaih, 1996-1998

Hijri Date

27 | 2 | 1343

Saturday, 27 Safar 1343 = 27 September 1924

Gregorian Date

27 | 9 | 1924

Today's Date | Close

وێنەی دووەم لە ڕۆژژمێرێکی تردا:




ئەگەر تەماشای وێنەی ئەم دوو ڕۆژژمێرە بکەیت، ٢٧ی مانگی سەفەر ناکاتە ڕۆژی یەکشەممە، بەڵکو ڕۆژی شەممە دەکات. وێنەی ژمارە سێ و چواریش کە مێژووی ٢٨ی مانگی سەفەرمان داناوە، بەم شێوەیەیە:

Hijri ▭ Gregorian Converter

Copyright © by Adel A. Al-Rumaih, 1996-1998

Hijri Date: 28 | 2 | 1343

Sunday, 28 Safar 1343 = 28 September 1924

Gregorian Date: 28 | 9 | 1924

? Today's Date ✔ Close

وێنەی ژمارە چوار:

۳۶۱۸۰ روز گذشته،
معادل ۱۰۲ سال و ۱ ماه و ۴ روز قمری

یکشنبه ، ۶ مهر [میزان] ۱۳۰۳ — ۱۳۰۳/۷/۶

1924 September 28 , Sund — 1924 - 9 - 28

الأحد ، ۲۸ صفر ۱۳۴۳ — ۱۳۴۳/۲/۲۸

September (سپتامبر) نهمین ماه میلادی
سال ۱۹۲۴ میلادی کبیسه است

وەکو دیارە ڕۆژی یەکشەممە دەکاتە ٢٨ی مانگی سەفەر، کە مانگی دووی کۆچییە، لێرەدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە ئەو پەراوێزە سوورەی بە خەتێکی تازەتر نووسراوە لەو پەراوێزەی، کە بە خەتێکی کۆنتر و ڕوونتریش نووسراوەتەوە ڕاستترە. لە ڕۆژنامەی (ژیانەوە)یشدا نووسراوە: «وەفاتی موئەسەف، ڕۆژی یەکشەنبە ٢٨ی ئەیلوول خان بەهادەر عادیلە خانم لە ئەڵەبجە بە ئەجەل مەوعوود وەفاتی کرد، بەناوی عومووموەوە و زۆر بە ئەسەفەوە بەیانی تەعزییەت لە مەخدوومان مەشاروئیلەیها ئەکەین و تەمەننای ڕەحمەت و غوفران لە حەزرەتی باری تەعالا ئەکەین». (ژیانەوە، ژ٦، ١٩٢٤: ٢) ڕۆژنامەکە لە ١٩٢٤/١٠/٣ هەواڵەکەی بڵاو کردووەتەوە و نووسیویەتی ٢٨ی ئەیلوول عادیلە خانم کۆچی دوایی کردووە، هەر ئەو مێژووە کە ڕۆژنامەکە دایناوە، دەکاتە ڕۆژی یەکشەممەی ٢٨ی مانگی ٩ی ١٩٢٤، هەربۆیە لێرەدا بە دڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین، کۆچی دوایی عادیلە خانم لە ڕۆژی یەکشەمەی ٢٨ی سەفەری ١٣٤٣ی ساڵی کۆچیدا بووە و بەرامبەر بە ٢٨ی مانگی ٩ی ١٩٢٤ی زایینی بووە.


لا اله الا الله محمد رسول الله صلى الله عليه وسلم

وفات صاحبه ام خانم روز یک شنبه ۲۷ شهر صفر

۱۳٤۲

بەڵگەنامەکە

## سەرچاوەکان


١. کەشکۆڵی مەحموودپاشای جاف، بەرگی دووەم لە بنکەی ژینە و بڕیارە ساغ بکرێتەوە و چاپ بکرێت.

٢. ڕۆژنامەی ژیانەوە، ژمارە(٦)، ١٩٢٤/١٠/٣ لە کتێبی: عەبدوڵڵا زەنگەنە: ژیانەوە و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا ١٩٢٤-١٩٢٦، چ١، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٠، ل٢.





حەسەن مەحمود حەمەکەریم

# ئەلە بەستێ

## پاڵەوانی کەرکوك و گەرمیان

### هەڵوێستی مەردانەی ئەلە بەستێ لە ڕووداوی ١٩٢٤دا لە کەرکوك

بەپێی تەسکەرە و نفوس ئەوەیە کە حاجی عەلی بەستێ ناوی تەواوی (عەلی محەمەد حەمەمراد حەمە مارف حەمەساڵح)ە، لە ڕێکەوتی ١٨٨٢/٧/١ لە گوندی (پەنجا عەلی) لە خوارووی شاری کەرکوک لەدایکبووە، دایکی ناوی بەستێ ئەمینە.

ئەلە بەستێ لە تەمەنی حەوت ساڵاندا لە دێی پەنجا عەلی دەچێتە بەر خوێندن، دوای ئەوەی عەلی دەبێتە بیست و یەک ساڵان، بەستێ ساڵی ١٩٠٣ کوڕێکی تریان دەبێ ناوی دەنێن (محەمەد)، ساڵی ١٩٠٦ کچێکیان دەبێ ناوی دەنێن (پیرۆز)، حاجی حەمەموراد باوکی فەقێ عەلی ساڵی ١٩٠٧ بە ڕووداوی لە دەستدەرچوونی فیشەک لە هاوڕێیەکییەوە کۆچی دوایی دەکات.

ئەم سێ منداڵە بارێکی قورس دەخەنە سەر دایکیان، بەڵام خاتوو بەستێ لەسەر منداڵەکانی دادەنیشێت و پەروەردەیان دەکات، بەتایبەت چاوی زۆری لەسەر فەقێ عەلی کوڕە گەورەیەتی کە جێی باوکی بگرێتەوە.

فەقێ عەلی لای مەلای مزگەوت فێری نووسین و خوێندنەوە و هەندێ لە شیعرەکانی حافز و سەعدی شیرازی دەبێت، کتێبی ئەحمەدی و هەندێ لە وانە سەرەتاییەکان تەواودەکات، شارەزای ئایین و ئەدەب و شیعر و شاعیران دەبێت، فەقێیەکی هێندە زیرەک دەبێت هەرزوو فێری زمانەکانی کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی دەبێت، بەدەم فەقێیەتییەوە چەندین دێهات و شار دەگەڕێ و ئاستێکی باش وەردەگرێت و چاوی دەکرێتەوە، جارجار لەگەڵ فەقێکانی هاوڕێی لەبەر نزیکی سەردانی کەرکوک دەکەن، لە مزگەوتەکانی کەرکوک بۆ وەرگرتنی هەندێ وانە دەمێننەوە، لە تەکییەکانیش بەشداری خەتمە و کۆڕی زیکری دەرویشی قادری دەکەن و دەبنە هەوادار و بەرگریکاری شێخان و دەوڵەتی عوسمانی لە دژی ئینگلیز و دواتر کۆمەڵی ئیتحادوتەرەقی، کە عەلی گەورەتر دەبێت، کوڕێکی هێندە بەهیممەتی لێدەردەچێت، بە منەتی دەستپانکردنەوەی سەرفترە و زەکات دایک و خوشک و براکەی بەخێوناکات، بەڵکو لەگەڵ فەقێیەتییەکەیدا لە دێیەکەی خۆیان زەوییەکانی باوکی زیندوو دەکاتەوە و کشتوکاڵ دەکات و بەرهەمەکەی دەبات لە کەرکوک ساقی دەکاتەوە. جارجاریش کە درەنگی پێدەچێت لە تەکییەکانی کەرکوک دەمێنێتەوە، جاریک دایکی پێی وتبوو ئەمجارە لە کەرکوک چەند سەرێک مەڕ و بزن بکڕە با پێوەی خەریک بین و سوود لە شیر و ماست و دۆکەشی ببینین، ئەو ڕۆژە بۆ ئێوارە مانگایەک و چەند سەر مەڕێک دەهێنێتەوە.

دوای ئەوەی فەقێ عەلی فێری خوێندن و نووسین دەبێ و وانە سەرەکییەکانی فەقێیەتی تەواودەکات، دایکی پێیدەڵێت ڕۆڵە ئەم دوو ئیشە بەیەکەوە ناگونجێ، شکور بۆ خوا فێری خوێندەواری بوویت و سەر لە ڕەش و سپی دەردەکەیت، یان فەقێیەتییەکە بکە، بەڵکو ببیتە مەلای دێیەکەی خۆمان، یان بە کشتوکاڵ و مەڕ و ماڵاتەکەتەوە خەریک بە، عەلی دەیزانی کە فەقێیەتی و مەلایەتی ئەوکاتە هەژاریی و نەداری بەدواوەیە و پارەو پولی لێ پەیدا نابێت، دەبێت بە ڕەزیلی بژیت و چاوت لە سەدەقە و سەرفترە و زەکات و دەقنەی فەقێ و چێشتی مجێوری ئەم ماڵە و ماڵ و دەستی خەڵک بێت، عەلیش کوڕی بەستێی دایکییەتی، وا فێرنەکراوە دەستپانبکاتەوە، دایکی سەربەرز و پڕ پیاوەتی پەروەردەی کردووە، ئەو جۆرە ژیانەی پێخۆش نەبوو، بەتایبەت کە هەستی دەکرد ژیان و گوزەرانی دایکی و خوشک و براکەی لە ئەستۆی ئەودایە، لەبەرئەوە واز لە فەقێیەتی دەهێنێت و دەچێتە ناو ژیانی کاسبی و دابینکردنی گوزەرانی خوشک و براو دایکی بێوەژنی کە هەموو ژیان و تەمەنی لەپێناو مناڵەکانی بەختکردووە، عەلی لەسەر داوای دایکی هەرجارێک قازانجی بکردایە دەس و دیاری و شتێکی بۆ فەقێکانی هاوڕێی دەهێنانەوە، عەلی شوانی مەڕوماڵات و ئامادەکردنی شیر و دۆ و ماست و بەرهەمە ئاژەڵییەکان بۆ دایک و براو خوشکە بچوکەکەی جێدەهێڵێت، خۆیشی بە کشتوکاڵ و ساغکردنەوەی بەرهەمە کشتوکاڵیی و ئاژەڵییەکانی خۆیانەوە خەریک دەبێت، هەندێک جاریش بەروبوونی مەڕوماڵات و مریشک و هێلکە و کشتوکاڵ لە خەڵکی دێی پەنجا عەلی دەکڕی و لەگەڵ ئەوەی خۆیان دەیانباتە کەرکوک و ساقیان دەکاتەوە و ئێوارە دەگەڕێتەوە ئاوایی. لەو ڕێگەیەوە دۆخیان زۆرباش دەبێت، پول و پارەیەکی باش پێکەوە دەنێت، خانوویەک لە قەراغ شاری کەرکوک لەسەر ڕێی پەنجا عەلی دەکڕێت، هەندێجار کە فریاناکەوێت بگەڕێتەوە دێ، لە خانووەکەی کەرکوک دەمایەوە، زۆر هەوڵیدا دایکی و براو خوشکی بباتە کەرکوک و لە ژیانی قورسی مەڕوماڵات و خەمی دێ ڕزگاریان بکات، ئەو دەیزانی کە کەس لە دێ پێناگات، شار جێگەی ژیان و گوزەران و ترۆقی و پەلهاوێشتنە، دایکی سەرەتا حەزی دەکرد لەناو خزم و کەسوکاری بمێنێتەوە، بەڵام دوای ئەوەی کە زانی کوڕەکانی گەورە بوون و ڕێی ژیانی خۆیان دۆزیوەتەوە و دەستیان لە ماڵ و سامان و کاسبی گیربووە و حەزیان بە شارە و خانوویان هەیە، دڵی نەشکاندن، عەلی دەوروبەری ساڵی ١٩١٠ هەموو زەوییەکانی دێی پەنجا عەلی

دەفرۆشێت، هەندێ کەلوپەلی لە ئێسترەکە بارکرد و خوشک و براکەی نایە سەری و ئاژەڵەکانی پێش خۆی خست و باریانکردە خانووەکەی قەراغ شاری کەرکوک.

بەوجۆرە ژیان و گوزەرانیان گۆڕاو کەوتنە نێو ژیانی نوێوە، لە خوار خۆیانەوە گەوڕ و پەچەیێکی گەورەی لە لێوار چەمی خاسە بۆ مەڕو ماڵاتەکە دروستکرد، بەیانیانیش دەچووە مەیدانی ئاژەڵان و بە ئاڵوگۆڕی مەڕوماڵاتەوە خەریک دەبوو، زۆر جوان ئاگای لە دایکی و مناڵەکان دەبوو، خوابەرەکەتی خستە ناو ماڵ و سامانییەوە و زۆری پێکەوەناو، لەگەڵ دایکی و خوشک و برای ژیانی خۆشیان دەگوزەراند.

**ڕۆژی ٤ی ئایاری ١٩٢٤ هێزی لیڤی بەریتانی و ئاشوورییەکان لە کەرکوك بڕیاریاندا پەلاماری جووت حەمامی ژنانی کەرکوك بدەن و دەستدرێژی بکەنە سەر ئافرەتانی کورد بەمەبەستی ئەوەی کوردی کەرکوك ئەتك بکەن، ئەلە بەستێ لێیان هاتە دەست و ئافرەتەکانی ڕزگار کرد و شار شڵەژا و ٥٦ کەس لەو ڕووداوەدا کوژرا.**

لەوکاتانەدا بارودۆخی دەوڵەتی عوسمانی و عێراق بەرەو تێکچوون دەچوو، عەلی بەزۆری سەردانی شێخ عەلی و تەکیەی تاڵەبانی دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا دۆستی سەی ئەحمەدی خانەقا و شێخ سەلام بوو، ئەم شێخ و تەکیە و خانەقایانەی کەرکوک لەبەرئەوەی قادری بوون، هەواداری شێخ سەعیدی باوکی شێخ محمود بوون و دژی جەمعیەی ئیتحادوتەرەقی و ئینگلیز کاریان دەکرد، حەمەعەلی خزمەتی دایکی و خوشک و برا بچوکەکەی دەکرد، لە جەنگی یەکەمی جیهانی و کاتی سەفەربەلک کە دەوڵەتی عوسمانی داوای

سەربازی زۆرەملێ و ڕەشبگیری کرد، عەلی کە ئەوساڵ تەمەنی نزیکەی بیست ساڵ دەبێت خۆی لەوەش دەرباز دەکات، عەریزە دەدات و دەبێتە موعین و بەخێوکەری دایکی و لە سەربازی عەفو دەکرێت، ئەوسا وا باوبووە ئەگەر کوڕێک لە منداڵییەوە باوکی بمرێت و دایکی پێیبگەیەنێت، بەناوی دایکییەوە بانگدەکرا، حەمە عەلی لە مناڵییەوە تاقانە بوو، لەناو خەڵکی پەنجا عەلی بە ئەلە بەستێ بەناوی دایکییەوە بانگ دەکرا، عەلی بووەتە (ئەلە)، بەستێ بووەتە (بەسێ)، (ئەلە بەسێ) ناوە ناسراوەکەی عەلی دروستدەکات و بەوە دەناسرێت.

جەنگی یەکەمی جیهانی ناوچەکە دەشێوێنێت، ئینگلیز بەسرە دەگرێت، شێخانی بەرزنجی قادریش بە سەرۆکایەتی شێخ مەحمودی حەفید لەگەڵ شێخان و عەشایەری عەرەبی لە زوبێر و شوعەیبە و سەماوە و ناسریە دژی ئینگلیز بۆ پاڵپشتی دەوڵەتی عوسمانی بەشداری ئەو شەڕانەیان کردووە، ئەم هەواڵانە خەڵکی عێراقی گەرم کرد، شێخانی کەرکوکیش خەڵکیان بۆ شێخ مەحمود کۆدەکردەوە و بەرەو باشووری عێراق دەیاننارد، ئەلە بەسێ و مام و ئامۆزاکانیشی لەو جەنگانەدا لەگەڵ شێخ مەحمودی حەفید دژی ئینگلیز بەشداربوون، ئەلە بەستێ کە تەمەنی لە سیی ساڵ تێپەڕیوە، لەبەر دایک و براو خوشکەکەی ژنی نەهێناوە، بە ژیانی ئەوانەوە خەریکە، لە سوپای شێخ مەحمود بەشداربوو، بەڵام زۆری نەبرد هێزی ئینگلیز کەرکوک و موسڵ و سلێمانی و هەموو باشووری کوردستانی داگیر کرد و شێخ مەحمود هەڵهات بۆ بانی بنۆک لە شاخی سورێن لەسەر سنووری ئێران، ئەلە بەسێ لە هەموو شەڕەکانی شێخ مەحمود لە نزیکییەوە بوو پارێزگاری لێدەکرد، هەرکاتیش لای شێخ مەحمودەوە مۆڵەتی وەردەگرت و دەهاتەوە کەرکوک هەمیشە بڕنەوی بەشانەوە و ئەسپی کەحێلەی ڕەشی لەژێردا بوو، جوانی پێدەکەوت، هەموو خەڵک ناسیویانە و بە پیاوێکی ئازا و نەترس ناوی ڕۆشتبوو، هێزی لیڤی کە پێکهاتبوو لە چەتەکانی هیندی، ئاشووری، ئەرمەنی، مەسیحی، سیخ و گورگی، ڕۆژانە پەلاماری خەڵکی کەرکوکیان دەدا و سەرانەیان دەسەند و خەڵکیان دەگرت وماڵیان دەپشکنی و تاڵان دەکرد، بەتایبەت زیاتر سوکایەتیان بە کوردەکانی کەرکوک دەکرد، ساڵی ١٩٢٤ هێزی لیڤی خۆیان کۆدەکەنەوە و بڕیاردەدەن لە دژی شۆڕشی شێخ مەحمود و شێخە کوردەکانی کەرکوک

سوکایەتی بە کوردی کەرکوک بکەن و پەلاماری جووت حەمامی ژنان بدەن و دەستدرێژی بکەنە سەر ژنە کوردەکانی ناو حەمام، ئەو هەواڵە دەگاتە ئەلە بەستێ، خێرا خۆی کۆدەکاتەوە و قایش و قروش و فیشەکلەغ دەبەستێت و تفەنگ لە شان دەکات و سواری ئەسپەشێ ڕەش دەبێت و بە غار خۆی دەگەیەنێتە جووت حەمام و سەنگەریان لێدەگرێت، کاتێک دەبینێت سوپا هاتن، تەقەیان لێدەکات، - سەعدیەخان کچی ئەلە بەستێ بۆ حەمە بۆری نووسەر دەگێڕێتەوە دەڵێت: باوکم کە ئەوە دەبینێت گورج لێیان دێتە دەست، سێ چەکدارەکەی ناو حەمامەکە دەکوژێت پێش ئەوەی دەستدرێژی بکەنە سەر ژنانی حەمامەکە، باوکم بانگ لە ژنەکان دەکات و دەڵێ خوشکینە خۆتان پۆشتە بکەنەوە، ئەنجا دەگەڕێتەوە بۆ بەردەرکی گەرماوەکە و گولەبارانی ئەوانەی دەرەوەش دەکات و زۆریان لێدەخات و ڕاویاندەنێت، بەوهۆیەشەوە ڕێگە بۆ ژنەکان دەکاتەوە بڕۆنەوە ماڵەوە.

ئەم هەڵوێستە مەردانەیە لەناو کەرکوک و دەوروبەری دەنگدەداتەوە، خەڵکی کەرکوک شانازی دەکەن کە پیاوێکی بەهەڵوێستی وایان هەیە، حەمامەکە جگە ژنە کورد ژنە تورکمانیشی تێدا دەبێت، یەکێک لەو کچە تورکمانانە ناوی (هەیبەت) بووە، هەیبەت ئافرەتێکی جوان و پێکەوتە بوو، ئەو ڕۆژە چووبوویە ئەو حەمامە بۆ خۆشۆردن، کە ئەلە بەستێ ئەو ئافرەتانەی ناو جووت حەمامی لە دەستدرێژیی و سوکایەتی بەکرێگیراوانی ئینگلیز ڕزگار کرد، هەیبەت بە کەسوکاری دەڵێت من شوو بە ئەلە بەستێ دەکەم لەبەر ئەو هەڵوێست و ئازایەتییەی نواندی، کەسوکاری ڕازی دەبن و شووی پێدەکات، ماوەیەکی زۆر ژنی دەبێت، حاجی عەلی لە هەیبەت دوو کچی دەبێت بەناوی نەجیبە و سەعدیە، سەعدیە شویکردووە بە خاڵۆزاکانی خۆی کە تورکمان بوون، دوایی چوونە بەغداد، نەجیبەش شویکردووە بە سەید ئیبراهیم ناوێک.

ئەلەبەستێ پاشتر ژنێکی کوردیش بەناوی فاتمە دەهێنێت، لە فاتمە کوڕێک و دوو کچی دەبێت بەناوەکانی مەحمود و حەسیب و حەپسە، دواتر مەحمودیش لە ڕووداوی ١٩٥٨ی کەرکوک تێوەدەگلێت و دەگیرێت، لە ساڵی ١٩٦٣ لەگەڵ بیست و هەشت کەسی کەرکوکی لە سێدارە دەدرێن.

## ڕووداوی حەمامەکە (جووت حەمام) بۆ ڕوویدا؟

## هەڵوێستی ئەلە بەستێ بەرامبەر ئاشوبی ٢٤ی ئایاری ١٩٢٤

ڕۆژی ٢٤ی ئایاری ١٩٢٤ هێزی لیڤی بەریتانی و ئاشوورییەکان لە کەرکوک بڕیاریاندا پەلاماری جووت حەمامی ژنانی کەرکوک بدەن و دەستدرێژی بکەنە سەر ئافرەتانی کورد بەمەبەستی ئەوەی کوردی کەرکوک ئەتک بکەن، ئەلە بەستێ لێیان هاتە دەست و ئافرەتەکانی ڕزگار کرد و شار شڵەژا و ٥٦ کەس لەو ڕووداوەدا کوژرا، هەریەکە لە نووسەران و گێڕەرەوەکان ئەم ئاشوبەی ئاشووریی و لیڤیەکان دەبەنەوە بۆ شتێک، من قسەی هەموو نووسەران و ئەوەی وتووێژم لەگەڵ کردووە دەهێنم، هەتا ڕاستی ڕووداوەکە بەتەواوی ڕوون ببێتەوە.

کاتێک بەریتانیا عێراقی داگیرکرد، هێزێکی کرێگرتەی دامەزراند بەناوی لیڤی و ئاشووریی و ناوی ترەوە بەمەبەستی شوێنگرتنەوەی هێزی بەریتانیا و کەمکردنەوەی خەرجییە سەربازییەکان و لێدانی ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی ناو عێراق، ئەم هێزە لە نەتەوە جیاوازەکانی ناو عێراق و تەیارییەکان پێکهاتبوو کە لە تورکیاوە هێنرابوون، ئەمانە بەنێوی شوبانە و لوبی و لیڤی ناودەبران، ئینگلیزەکان لە ساڵی ١٩٢٣ هێزێکیان لە تەیارییەکان برد بۆ موسڵ و ناویان لێنان هێزی ئاشووری.

هۆکاری ئەم ئاشوبە کۆمەڵێک ڕووداو بوو، هەندێ دەیبەنەوە بۆ سۆزی ئایینی و فاکتەری نەتەوایەتی و نەگونجانی کەمە نەتەوایەتییەکانی ناو کەرکوک لەگەڵ یەکدا، یان کێشەی نێوان ئاشووریی و عێراقییەکان، لەولاشەوە تورکەکانی کەرکوک حەزیان بە هێزی لیڤی ئاشووری نەدەکرد، چونکە یەکەم دژی دەوڵەتی عوسمانی و تورک بوون، دووەم ئاسورییەکانی کەرکوک بە فیتی ئینگلیز کاری خراپیان بەرامبەر خوێندەواران و ڕۆشنبیرانی تورکی کەرکوک ئەنجامدابوو، هۆکارێکی تر ئەوەبوو لە کەرکوک کەمە نەتەوەیی هەبوو، لە پاڵ نەتەوەی کورددا بەخۆشی و بێکێشە دەژیان، بەڵام کە ئینگلیز هات هەموویانی دا بە شەڕ.

ئاشوورییەکان لە ناوچەی تەیاریە و توخویە و باز و جیلۆوەی ناو خاکی تورکیاوە هاتبوون، دەوڵەتە هاوپەیمانەکان نەیاندەزانی لەکاتی دابەشکردنی ناوچەکە بیاندەنە پاڵ عێراق یان تورکیا، هەوڵیشیاندا دەوڵەتێکی ئاشووریان لە باشووری کوردستان بۆ دروستبکەن، بەڵام سەری نەگرت، ئینگلیز و فەڕەنسا هەوڵیاندا لەو دابەشکردنەدا باشووری کوردستان بدەن بە ئاشوورییەکان، مەسیحییەکانی ئەم

ناوچەیەش بەهاوکاری فەڕەنسا داوای دەوڵەتی خۆیان کرد، ئەویش سەری نەگرت، پێشتر ئەو ئاسوورییە تەیارییانەی تورکیا لە ١٥ ئابی ١٩٢٣ لەگەڵ خەڵکی موسڵ لە بازاڕی دیر مریەم عەزرا فیتنەیان نابوویەوە و کوشتاریان کردبوو، بەڵام ئینگلیز سزای نەدان، سزاکەیان هەر ئەوەبوو ئاسوورییەکانی گواستەوە بۆ کەرکوک، ئەو سزا نەدانە هۆکارێک بوو کە لە کەرکوکیش هەمان ئاشوب دووبارە بکەنەوە.

هۆکاری ئاشوبەکەی کەرکوک دەمەقاڵەیەک بوو لە نێوان دوو سەربازی لیڤی ئاسووریی و دوکاندارێکی تورکمان لە بازاڕی کەرکوک لەسەر نرخی شتومەک، پاشان تەشەنەی کرد و کوشتاری لێبوویەوە، هەندێک هۆیەکە دەبەنەوە بۆئەوەی کە لە چایخانەیەکی شار کێشە و شەڕ لەسەر دۆمینە لە نێوان سەربازێکی لیڤی و دوکاندارێکی تورکمانی ڕوویدا، خەڵکیش یارمەتی تورکمانەکەیاندا و جنێوی زۆر ناشیرن و قورسیان دابوو بەیەک، کە کەس قبوڵی نەدەکرد، لیڤییەکان وتبوویان واو وا بەژنەکانتان دەکەین، هەندێک دەڵێن دوو سەرباز خەریکی کڕینی پێداویستییەکانیان بوون لە قۆرییە لەگەڵ دوکاندارێکی تورکمان دەمەقاڵەیان بوو، سەربازێکی لیڤی بریندار دەبێت، کە بریندارەکە بۆ بارەگا دەگەڕێتەوە، ئاسووری و لیڤییەکان بڕیاریاندا تۆڵە لەو دوکاندارە تورکە بکەنەوە، دوو تیپ لە هێزی لیڤی ئاسووری کە بارەگاکانیان لەناو کەرکوکدا بوو چەکەکانیان هەڵدەگرن و بەسەر ڕێگاکانی شاردا دابەش دەبن، هەرکەسیان بدیایە تەقەیان لێدەکرد، ئەوکاتە بەهۆی نزیکبوونەوەی جەژنی ڕەمەزانەوە شار قەرەباڵغ دەبێ، دزی و تالانیان لە هەندێ دوکان و ماڵ کردبوو، دوو پۆلیس هەوڵیاندا ڕێبگرن خەڵکی بێتاوان نەکوژن، لیڤییەکان ئەو دوو پۆلیسەیان کوشت، موڕادبەگی ڕەحمەتوڵڵا موبارەک بەڕێوەبەری پۆلیسی کەرکوک لەسەر داوای ئەفسەرێکی بەریتانی سەرجەم پۆلیسەکانی ناو شاری گەڕاندەوە بنکەکان و نەیهێشت پارێزگاری لە خەڵکی شار بکەن، هێزەکانی لیڤیش بەربوونە خەڵکی شار و پەلاماری مزگەوت و حەمامی ئەحمەد ئاغایاندا، گەرماوەکە بەیانیان زوو تا کاتژمێر هەشت بۆ پیاوان بوو، لە هەشتەوە بۆ دوانزەش بۆ ژنان، دواتر ئێوارە بۆ پیاوان بووە، لەوکاتەدا تایبەت بوو بە ئافرەتان، لیڤییەکان ویستیان بچنە ناو جووت حەمامی ئەحمەد ئاغاوە بۆ ژنەکان، بەڵام عەلی بەستی مەنمی پارێزگاری لە گەرماوەکە کرد و نەیهێشت بچنە ناوی، کە پۆلیسەکان گەڕانەوە بارەگاکانیان، خەڵکی شار ناچار بوون خۆیان پارێزگاری لە خۆیان بکەن، دایانە پاڵ ئەلە بەستێ و بەرەنگاری هێزی لیڤی ئاسووری بوونەوە، شەڕ و کوشتار هەتا ئێوارەی ئەو

ڕۆژە بەردەوام بوو، لیڤییەکان خراپ شکان و لای ئێوارە پەنایان بردە بەر ماڵە مەسیحییەکان کە هاوئایینی خۆیان بوون، ڕۆژی دواتر تورکمانەکان و کوردەکان هێرشیان کردە سەر ماڵە مەسیحییەکان کە داڵدەی زۆرێک لە سەربازە لیڤییە ئاسوورییەکانیان دابوو، زۆریان لێکوشتن و ماڵەکانیان تاڵان کردن، جەرجیس فەتحوڵڵا کە خۆی نووسەری کوردی مەسیحییە، دەیەوێت پاساو بۆ ئاسوورییە مەسیحییەکان بهێنێتەوە گلەیی دەکات و دەڵێت: ئەوەی سەرچاوە عێراقییەکان لێی بێدەنگن ئەوەیە، چەند لایەنێک لە دانیشتووانی چەکداری شار لە ڕۆژی دواتردا هێرشیان کردە سەر گەڕەکی مەسیحییە کلدانە کۆنەکان و ماڵەکانیان تاڵان کردن و بەدەیەهاشیان لێکوشتن، چەند سەد مەسیحیش بۆ پاراستنی گیانیان پەنایان بردە بەر قەڵای کەرکوک کە بارەگای پشکێنەری بەڕێوەبەرایەتی کەرکوک بە سەرۆکایەتی ئا. تن. مللەر لەوێبوو. لە ئێوارەی ٥ی ئایاری ١٩٢٤ هێزی چەکداری بەریتانی لە عێراق بۆ ئاساییکردنەوەی بارودۆخەکە و پارێزگاری لە ژیانی مەسیحییەکانی شارەکە بە فڕۆکە مەندوبی سامی بەریتانی هێزێکی نوێی لە سوپای ئینسکتینگی پاشایەتی گەیاندە شاری کەرکوک و بەیانیان بڵاوکردەوە و بەڵێنیدا کە سزای ئەو لیڤییانە بدات کە دەستیان لەو تاوانەدا هەبوو، هەروەها قەرەبووی زیانلێکەوتوانیش بکاتەوە، سوپای ئاسوورییان دورخستەوە بۆ شوێنێکی دور.

مەندوبی سامی هنری دوبس دۆخەکەی هێورکردەوە، هۆزە کوردەکانی دەوری کەرکوک هاتن بۆ تۆڵەکردنەوە، لەو کێشەیەدا ٥٦ کەس کوژرا و ١١٠ بریندا بوون، لیڤییەکان زۆر دوژمنی شێخ مەحمود بوون، شێخ مەحمود زۆر بە پەرۆشەوە هەوڵیدا لە تۆڵەی ئەو کارە لیڤییەکان لە شارەکە دەربکات، بەڵام هێزی بەریتانی ڕێی لە چوونە ژوورەوەی کوردەکان بۆ ناو شار گرت و هەوڵی هێورکردنەوەی بارودۆخەکەیدا، کە شەو داهات ئینگلیزەکان توانیان هێزی لیڤیی و مەسیحیی و جولەکەکان بگوازنەوە بۆ دەرەوەی قەڵاکە و لیڤییەکانیشیان گواستەوە بۆ بانی مەقان، مەندوبی سامی فەتاح بەگی لابرد و عەبدولمەجید یەعوقبی دانا، چونکە ئەو کەسایەتییە کوردیە زۆر هەوڵیدا دۆخەکە هێور بکاتەوە، هەروەها ٣٠ هەزار ڕوپیەشی دابوو بە عەبدوڵڵا سافی برای یەعقوبی هەتا بەسەر زەرەرمەنداندا دابەشی بکات، بەڵام ئەو نیوەی دابەشکردبوو وەک بەرپرسانی هەرێم، ئەویتری بردبوو، ئەوەش ناڕەزاییەکی تری لێبوویەوە، لیژنەیەکیان دروستکرد، بەڵام هیچی بۆ نەکرا، یان نەیانکرد، لەو دادگایەش لیڤی تاوانبار نەکرا، حکومەتی عێراقی داوایکرد هێزی لیڤی بنێرێن بۆ هیندستان و لەجیاتی

ئەو گرنگی بە سوپای عێراقی بدرێت، مەلیک فەیسەڵ ئەوەی پێیخۆش بوو، لە ٩ی ئایار ١٩٢٤ مەلیک کۆبوونەوەی بە ئەنجومەنی وەزیران کرد، بڕیاردرا ٣٠ هەزار ڕووپیە بۆ زەرەرمەندان دابین بکرێت، بەهێزکردنی هێزی ناوخۆ لەجێگەی لیڤی، لیوای کەرکوک وەک لیواکانی تری عێراق بخرێتە سەر دەسەڵاتی عێراق، ڕۆژنامەکان ئەوەیان پێخۆشبوو باسیان کرد، سوپاسی جەعفەر عەسکەری سەرەک وەزیرانیان کرد، لە ١٥ی ئایار ١٩٢٤دا بڕیاری لیژنەیەک درا بۆ کیشەکە، لیژنەکە داوای سزادانی ئەنجامدەرانی کرد، نوێنەرانی کەرکوکیان بینی، لیڤی تاوانبار کرا، حەوت سەربازی لیڤی و دوو لە مەسیحییەکانی کەرکوک دەستگیرکران، بەڵام حوکمێکی سانایان بەسەردادان، هەشت تاوانبارەکە حوکمی هەتاهەتایی و نۆیەمیش حوکمی پێنج ساڵ زیندان، ئاسوورییەکان هیچ گرنگیان نەدا بەو حوکمەی درا بەسەریاندا، حکومەتی ئینگلیزیش داوای لە حکومەتی عێراق کرد لێبووردنی گشتی دەربکات، پاش دوو ساڵ بە زۆری بەریتانیا حکومەتی عێراق لە ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٢٦دا لێخۆشبوونی بۆ دەرکردن و چوونەوە سەر کاری خۆیان.

مێژووناس الحسین و فریاد شوانی و حەمەبۆر و سمکۆ خاوەن ئینسکلۆپیدیا و کتێبی نێرگسەجاڕ و حەسەن جاف و جەمیل ئاغای نەوتچی و سەعدییە کچی ئەلە بەستێ و شێخ محەمەد کچەزای ئەلە بەستێ و کاک عەباس برازای ئەلە بەستێ و کاک ئیلهام کوڕەزای ئەلە بەستێ و لەتیف فاتیح فەرەج نووسەر لە کتێبەکەیدا و پشکۆ حەمەتاهیر ئاغجەلەری لە کتێبەکەیدا و زۆری تر باسی ڕووداوی جووت حەمامی کەرکوک و هەڵوێستی مەردانەی  ئەلە بەستێیان کردووە، بەڵام هەندێ جیاوازی لە گێڕانەوەکاندا هەیە:

١. حەمەبۆر دەڵێت: من لە دەمی سەعدییە خان کچی حاجی علی بەستێ و جەمیل ئاغای نەوتچیم وەرگرتووە، هەموویان هەڵوێستێکی مەردانەی ئەلەبەستێ دەگێڕنەوە، سەعدییەخان کچی ئەلەبەستێ دەڵێت: (ڕۆژێک ـ باوکم ـ ئەلەبەستێ، لە چایخانەی ئەحمەد ئاغا لە کەرکوک بەرامبەر گۆڕەپان و (گەرماو) بە چەکەوە دانیشتبوو، چاوەڕوانی هاوەڵێکی دەکرد کە ناوی دەروێش فەتاح بوو، ئەسپەکەشی لەو نزیکانە بەستبوویەوە، خۆی و ئەو هاوەڵەی بۆ چوونە سەرشایی گوندێک بانگکرابوون، لەکاتی چاوەڕوانیدا باوکم دەبینێت دەستەیەک چەکداری ئەرمەنی هێزی لیڤی گەمارۆی گەرماوی ژنانیان داو سیانیان چووبوونە ژورەوە، ـ سەعدییەخان

دەڵێت: باوکم کە ئەوە دەبینێت خێرا لێیان دێتە دەست، بەدەم تەقە لێکردنەوە خۆی دەکات بە گەرماوەکەدا و هەر سێ چەکدارەکەی ناو حەمامەکە دەکوژێت، پێش ئەوەی دەستدرێژی بکەنە سەر ژنانی حەمامەکە، خێرا سەروپێچ و مشکییەکەی دەدا بەسەروچاویدا و بانگ لە ژنەکان دەکات، دەڵێت: خوشکینە خۆتان مەشڵەژێنن، خۆتان پۆشتە بکەنەوە و ئەوەی لە تفەنگ دەزانێت چەکی ئەم سێ کوژراوە بگرێتە دەست و ئامادەبن هەتا خۆم بانگتان دەکەم بۆ چوونەوە بۆ ماڵەوە، مەترسن تا گیانم تیابێت وەک براتان بەرگریتان لێدەکەم، ئەنجا دەگەڕێتەوە بۆ بەردەرکی گەرماوەکە و گولەبارانی ئەوانەی دەرەوەش دەکات و دوریاندەخاتەوە، پێنج لەوانیش دەکوژێت، خۆی دەگەیەنێتە سەربانی گەرماوەکە و زۆریان لێ بریندار دەکات و ڕاویاندەنێت و ڕێگە بۆ ژنەکان دەکاتەوە بڕۆنەوە ماڵەوە).

٢. سەرچاوەی دووەم جەمیل ئاغای نەوتچی کە ساڵی ٣٠ و ٤٠ ەکانی سەدەی پێشوو ئەمینداری خەزێنەی سلێمانی بوو، جەمیل ئاغا ژنەکەی مردبوو نەیدەویست ژن بهێنێت نەوەک مناڵەکانی بێزار بن، جەمیلەخانی خوشکی لای بوو یارمەتی دەدا، جەمیل ئاغا دیدەنی ئەکردین، ساڵی ١٩٦١ داستانی ئەو حەمامەی گێڕایەوە وتی: لە ڕۆژی پەلاماردانی گەرماوەکەدا لەگەڵ جەمیلەی خوشکمدا لە ماڵی حسەین ئاغای نەوتچی کاکم بووین، کاکم بە قەرە حسەین واتە حسەینە ڕەش بەناوبانگ بوو، سەرۆکی نەوتچییەکانی کەرکوک بوو، گووتی: کە ڕووداوی گەرماوەکەمان بیست، چەند پیاوێکی لێهاتووی پڕ چەکمان بەخێرایی نارده فریای ئەلەبەستێ، چونکە هەستی کوردایەتیمان وابوو، دەستدرێژکردنە سەر ئافرەتی کوردمان پێ قبوڵنەدەکرا، تێگەیشتین کە ئەو کارە بۆ سوکایەتی و دژ بە کورد بوو، دوایی زانیمان کە چەکدارەکانمان گەیشتبوونە نزیک حەمامەکە دیبوویان گەمارۆی دوژمنەکان لە درێژەیدایە، ئازایانە دڕیان بەو هێرشبەرانە دابوو، بە هاوکاری ئەلەبەستێ پەلاماردەرەکانیان بەیەکجاری بەزاندبوو، هەموویان هەڵهاتبوون، بریندارەکانیشیان لەگەڵ خۆیان دەربازکردبوو، ئەوکات بانگیان لە ئافرەتەکان کردبوو کە لە گەرماوەکە دەرچن، پیاوەکانمان ئەلەبەستێیان هێنایە دیوەخانی کاکم، هەر کە ئەلەبەستێ گەیشت، جەمیلەی خوشکم چوو شانی ماچکرد و کیسەیەکی ٥٠ لیرەیی ئاڵتونی دایە، هەرچەند نەشی دەویست، بەڵام خوشکم بەزۆر بەسەریدا سەپاند، ئێمەش لە شوێنی ئەسپە کوژراوەکەی ئەلەبەستێ، ماینێکی کوێتی ڕەسەن و تفەنگێکمان بە سێ فیشەکدانەوە پێشکەش کرد، پیاویشمان نارده

پاسەوانی ماڵەکەی، ئەلەبەستیمان لە دیوەخاندا هێشتەوە هەتا دڵنیابووین کە لە دەزگا میرییەکانەوە هیچی لەسەر نیە، ئەوسایە گێڕامانەوە ماڵەکەی لە کەرکوک.

٣. حەسەن جاف لە کتێبی (عەلەبەستێ) ئەم باسە جۆرێتر دەگێڕێتەوە و دەڵێت: هەواڵیان بۆ عەلە بەسێ هێنا کە نۆکەرەکانی ئینگلیز و سوپای لیڤی و چەند چەکدارێکی ئەرمەن دەیانەوێت پەلاماری (جووت حەمام)ی ژنان بدەن و ئابڕوومان بتکێنن، عەلە بەستێ بڕنەوەکەی کردە شان و دوو ڕیز فیشەکی بەسەر پشتێنەکەی تێکەڵ کرد، محەی نازە جەباریش بە تفەنگەکەیەوە هات بە دەنگییانەوە، بەڵام دەروێش فەتاح ڕیش سپیەک بوو، بێ تفەنگ بوو، دوایان کەوت، عەلە بەستێ وتی ئێوە بچن لەولایە پاسەوان بن نەوەک لە چەمی خاسێوە بێن بۆم، ئەنجا عەلە بەستێ خۆی کرد بە حەمامەکەدا، بە ژنانی وت خۆتان پۆشتە بکەنەوە و بڕۆنەوە ماڵەوە تا نەقەوماوە، ژنان بە گریان و هاوار هاتنە دەرەوە، هەندێ لە ژنەکان لە حەیبەتان خەریک بوو بەڕووتی و بە پێخاوسی بڕۆن، عەبایان لە خۆوە پێچاو لفکە و سابوون و قاپ و هەندێ شتیان بەجێهێشت و ڕایانکردەوە ماڵەکانیان، ئەلەبەستێ وتی دەبێ ئەوە لەو کافرانە تێبگەیەنین کە شەرەفی کوردی مسوڵمان وا هەرزان نییە، بەخوا دەیانکەم بە پەندی زەمانە، محە هاواری کرد هاتن، عەلی خۆی دابەست، هەر کە نێزیکبوونەوە تەقەیان لێکردن، شەش حەوتێکیان لێخستن، ئەوانی تر هەریەکە بەلایەکدا هەڵهاتن، هەبوو تفەنگەکەشی فڕێ دەدا، عەلی هاواری لە محەو فەتاحی کرد بێنە خوارەوە با ڕاکەین، ئێستە دێنەوە، سوپای ئینگلیز دوو مانگ بەدوای عەلە بەستێ و محەو فەتاحدا دەگەڕان نەیاندۆزینەوە، ئەلە بەسێ لەو سەردەمەدا وەک پاڵەوانێکی ئەفسانەیی ناوی دەرکردبوو باسی دەکرا.

٤. لە ئینسایکلۆپیدیای کەرکوکدا هاتووە کە (عەلی بەستێ یەکێک بووە لە پیاوە ناودارەکانی کەرکوک، ڕۆڵێکی گەورەی بینی لە ڕووداوەکەی هێزی لیڤی بۆ سەر گەرماوی ژنانی کورد لە کەرکوک، لە ساڵی ١٩٢٤ ـ ١٩٢٥، ڕۆڵێکی سەرەکی هەبووە لەگەڵ کۆمەڵێک خەڵکی تردا).

٥. فریاد شوانیش ئاوا دەیگێڕێتەوە: کاتێک ئینگلیزەکان لە شاری کەرکوک پەلاماری کوردەکانیاندا، شەڕێک قەوما لە مابەینی سەربازانی ئینگلیز، کە هێرشیان کردە سەر ئەو حەمامانەی کە ژنە کوردەکان خۆیان تیا دەشۆری، ئەو سەربازانە لە سیخ و گورگ و کاجینش پێکهاتبوون، حاجی عەلی بەسێ یەکەم کەس بوو

دەستیدایە تفەنگ و بەڕووی ئینگلیزەکاندا تەقییەوە، گەورەترین شەڕ ڕوویدا کە زیاتر لە ٥٠٠ لە سەربازەکانی ئینگلیز لەو شەڕەدا کوژران، دەرسێکی وایاندا بە داگیرکەر هەتا هەتایە لەبیری نەچێ.

٦. لەتیف فاتیح فەرەج، لە کتێبی: کورد و کەرکوک، بەرگی یەکەم، ل٣٣ دەڵێت: پۆلیس دەیەوێت ڕێگریان لێبکات ـ لە لیڤییەکان ـ بەڵام دوو پۆلیس دەکوژرێن، مرادبەگی مودیری پۆلیسیش بە بڕیاری بەریتانیا کپ دەبێت، خەڵکەکە ناچار خۆیان پارێزگاری لە خۆیان دەکەن، لیڤییەکان پەلاماری مزگەوت و حەمامی ژنان دەدەن و خەڵکی وەک عەلی بەستێ و کوردی تر ڕووبەڕوویان دەبنەوە).

٧. شێخ محەمەدی کچەزای ئەلە بەستێ دەڵێت: لیوای تاشناق کە ئینگلیز دروستیکردبوو، ئەوکاتە زۆر ڕقیان لە کورد و ئەخلاقی کوردایەتی بوو، ویستیان شەرەفی کورد بشکێنن، حاجی عەلی زۆر پەیوەست بوو بە ئیسلامەوە، ئەو لیوایە دایان بەسەر حەمامی ژناندا (جووت حەمام)، لەم دواییە حەمامەکە ناونرا حەمام شەباب لە ناوچەی حەسیرەکە، کە سەردەکەوی بۆ لای خان خورما بە دەستی ڕاستدا، لەوێ حەمامێکی گەورە هەبوو، جاران ژنانی کورد و ژنە تورکمانیشی بۆ دەچوو، پشتی بەقەڵاوە بوو بەدیوی ئەمدیودا، حاجی عەلی باپیرم لێیانیداو ڕاوینان، نەیهێشت ئەو کارە قێزەونە بەسەر ژنە کوردانی کەرکوکدا بێنن.

٨. ئیلهام کوڕەزای ئەلە بەستێ لەبارەی باپیری و حەمامەکەوە وتی: (ئەرمەنییەکان هێرشیان کرد بۆ حەمامی ژنان فەسادیان بکەن، عەلی بەستێ نەیهێشت و ڕێی لێگرتن، ئەو مێژووەمان هەیە لە کەرکوک سەرمان بەرزە لای کورد لای عەرەب و لای تورکمان، ئەو پاراستنی، هەتا مەلا بانگدان شەڕی کرد لەگەڵ ئەرمەنییەکان، نەیهێشت شەرەفی کورد لە کەرکوک بڕوات).

٩. عەباسی برازای ئەلە بەستێش ئاوای بۆ گێڕامەوە: جاران ئینگلیز چەکداری غەیرە نیزامی هەبوو وەک جاش، هێرش ئەکەن بۆ جووت حەمام، ژنەکان فەساد بکەن، ئەوسا عەلە بەستێ حاجی نەبوو گەنج بوو، ڕائەپەڕێت و بڕنەو بەدەستەوە دەگرێت و پێش ئەوان ئەگاتە حەمام و بە ژنەکان ئەڵێت: جلی خۆتان لەبەر بکەن و بڕۆنەوە، ئەمیش بۆ هێزی لیڤی ئینگلیزی دادەنیشێ لێیان ئەدا، ئەو هێزە ڕائەکەن بۆ ماڵەکان خۆیان ئەشارنەوە، پاشان هەتا مەتار ناوەستن، یەکێک لەگەڵ ئەلە بەستێ ئەڕوات ناوی حەسەن یان حوسەینە، چیمەنییە، یارمەتی ئەدا.

## سەرچاوەکان


١ـ ئەحمەد خواجە: چیم دی، ب١، چاپخانەی ڕاپەڕین، سلێمانی، ١٩٧٠.

٢ـ سەیفەدین مەنمی: نێرگسەجاڕ، کورتەیەک لە ژیاننامەی ڕیش سپی و پیاوماقوڵانی عەشیرەتی مەنمی، ب١، ژیاننامەی حاجی عەلی بەستێ، چاپخانەی ناوەندی سارا بۆ چاپ و بڵاوکراوەکان، سلێمانی، ٢٠٢٠.

٣ ـ خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا، جەلال تەقی ئامادەی کردووە، بغداد، ١٩٧٠.

٤. یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید، کەمال نوری مەعرووف ساغیکردووەتەوە، چ١، ١٩٩٥، سلێمانی.

٥. کەرکوک بۆ مێژوو دەدوێت، ئامادەکردنی عەدنان کاکەڕەش و دەستەیەک هاوکار بوون، مەکتەبی بیروهۆشیاری، ژ(٢٢١)، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی، ٢٠٠٦.

٦. گۆران فەتحی: شاری کەرکوک بەشێک لە مێژووی مزگەوت و تەکیە و خانەقا و زانا و پیاوە ئایینی و ناودارەکانی، ئینیستیتۆتی کەلەپووری کورد، چاپخانەی کەمال، سلێمانی، ٢٠١٢.

٧. مەلاجەمیل ڕۆژبەیانی: کەرکوک ناوی مێژوویی کۆنی، دانیشتووانی، دەسەڵاتەکانی، ئا: محەمەد ئەمین ڕۆژبەیانی، چاپخانەی ئەراپخا، کەرکوک، ٢٠٠٦.

٨. سمکۆ بەهرۆز (ئەژی): ئینسایکلۆپیدیای کەرکوک، ب٤، دەزگای ڕۆشنبیری جەمال عیرفان، ٢٠٢٣.

٩. کەمال نوری مەعروف: مێژووی شۆڕشەکانی شێخ محمود لە بەڵگەنامە نهێنییەکاندا، ب١، چاپخانەی یاد سلێمانی، ٢٠١٦.

١٠ حاجی عەلی بەسێی قارەمان، لاپەڕەیەکی پرشنگدار لە مێژووی خەباتماندا، حەمەبۆر، ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ساڵی حەوتەم، ژ(١٧١٩)، چوارشەممە، ١٩٩٨/١٠/١٤، ل٦.

١١. فریاد شوانی: حاجی عەلی بەسێ تێکۆشەری هەڵکەوتووی گەرمیان و پێشمەرگەی قارەمانی مەلیک محمود، ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە ١٧٠٢، ١٩٩٨/٩/٢١.
١٢. عەلائەدین سوجادی: شۆڕشەکانی کورد و کۆماری عێراق، چاپخانەی مەعاریف، بەغداد، ١٩٥٩.
١٣. لەتیف فاتیح فەرەج: کورد و کەرکوک، ب١، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی ، ٢٠٠٢.
١٤. پشکۆ حەمە تاهیر عەبدولڕەحمان ئاغجەلەری: شاری کەرکوک ١٩١٧ ـ ١٩٢٦، مەکتەبی بیرو هۆشیاری، ی ن ک، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، سلێمانی، ٢٠٠٧.
١٥. ناوچەی کەرکوک و هەوڵی گۆڕینی باری نەتەوەی ئەم ناوچەیە، د.نووری تاڵەبانی، و.محەمەد مەلا کەریم، دەزگای ئاراس، هەولێر ٢٠٠٤.
١٦. هەمەوەند، بەشێک لە مێژووی ڕزگاریخوازی گەلی کورد، کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند، دارا ئەحمەد کەریم بەگ، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریان، هەولێر، ٢٠٠١.
١٧. م.ر.هاوار: شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتەکەی لە خوارووی کوردستان، ب١، جاف پیرس، لەندەن، ١٩٩٠.
١٨. ڕەفیق حلمی: یاداشت، ب١ و ٢، چاپخانەی ڕۆشنبیری لاوان، ١٩٨٨.
١٩. یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید، چ١، ١٩٩٥.
٢٠. ڕەفیق ساڵح و کەمال فوئاد: سێ ڕۆژنامەی سەردەمی شێخی نەمر، ١٩٢٢ ـ ١٩٢٣، چاپخانەی بەدرخان، سلێمانی، ٢٠٠١.
٢١. ئومێد محەمەد ئەمین: شێخ محمودی حەفید ١٩٢٢ ـ ١٩٢٥، سلێمانی، پرۆژەی تیشک، چاپخانەی چوارچرا ٢٠٠..
٢٢. گۆڤاری نەوشەفەق، ژ(٢٥)، عومەر عەلی شەریف، کورد و جەنگی شوعەیبە، ١٢ بۆ ١٤ /١٩١٥/٤، نیسانی ٢٠٠٥.
٢٣. کوردستانی نوێ، ژ(٢٣٥٦)، لە ٢٠٠١/١١/١٨، صدیق ساڵح، یەکەمین حکومەتی کوردستانی جنوبی.






**د.دیلان سەلام حەمەفرەج**
دکتۆرا لە ئەدەبی کوردی

# خورافە ی سیاسیی لە ڕۆمانی (دەریاس و لاشەکان)دا و ئاسایشی کۆمەڵایەتی



ڕۆمان ژانرێکی هونەرییە، بریتییە لە چیرۆکێکی واقیعی یان خەیاڵی درێژ، گێڕانەوەی چیرۆکێک یان چەند چیرۆکێکە، کە چێژ بە خوێنەر دەبەخشێت، دەکرێت ئەم چیرۆکانە لە واقیعی کۆمەڵی کوردییەوە وەرگیرابن، یان دروستکراوی خەیاڵی نووسەران بن، نووسەریش بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە و پێڕەوی کولتوور و دابونەریتێکی دیاریکراوی ناو کۆمەڵ دەکات؛ بۆیە ئەم کولتوورە لە تەواوی دونیابینی و بەرهەمە ئەدەبییەکانی نووسەراندا ڕەنگدەداتەوە، ئەدەبی کوردی لە سەرەتاوە کاریگەریی ژینگەی ناوچەیی خۆی بەسەرەوەبووە، کاریگەرییەکەش بەڕادەیەک بووە، کە ئەدەبەکە بکات بە ئەدەبێکی ڕەسەن و پاک و لە بەرامبەر مێژووی ڕۆژگاردا بیهێڵێتەوە، دیارە خورافە وەک بەشێک لە کولتووری هەموو نەتەوە و میللەتێک سەیردەکرێت و پێکهێنەرێکی سەرەکی کولتوورە، ناکرێت هەمیشە بوترێت خورافە شتێکی خراپە، چونکە وەک پێویستییەکی لێهاتووە بۆ خەڵکە سادە و ئاساییەکەی کۆمەڵ، بۆئەوەی وەڵامی ئەو پرسیارە زۆرەیان بداتەوە سەبارەت بە بوون و ژیان و کۆمەڵ هەیانە. خورافەش ئەو باوەڕ و بیرکردنەوانەن، کە تەنیا خەیاڵین و لەگەڵ لۆژیک و زانین یەکناگرنەوە، زیاتر پەیوەندییان بە فۆلکلۆری گەلانی جیهانەوە هەیە و هەندێکجار نەوە لە دوای نەوە دەمێننەوە، خورافە خەیاڵێکی ئاڵۆزی ناڕاستی نا ئەقڵانییە و دەکرێت ئایینی، یان ڕۆشنبیریی، یان کۆمەڵایەتی بن، یان لەوانەیە کەسی بن و تایبەت بن بە کەسێک بە تەنیا. وەک ئەوەی، کە خەڵکی باوەڕی وایە چاوەزار چاوی پیس دووردەخاتەوە و ناڵی ئاژەڵ خەیر و چاکە دەهێنێت، یان بە بینینی قەلەڕەش دوعا دەخوێنن و وادەزانن کێشەیان بۆ دروستدەکات ..(١)

ئەمانە و چەندین خورافەی دیکەی بەربڵاو لە کولتووری کوردیدا، کە هەمووشی هۆکاری بۆ داتاشراوە بەشێوەیەک خەڵک بڕوای پێ بکەن، بۆ نموونە ترسان لە ژمارە سیانزە و دانانی بە ژمارەی بێبەختی، زۆربەی کاتیش مرۆڤەکان بۆ خۆیان خورافە دروستدەکەن، بۆ نموونە کەسێک کاغەزێکی بەخت دەکڕێت و بەپێی ژمارەکەی خەڵاتێکی گەورەی بۆدەردەچێت، بەوەش وادەزانێت ئەوە ژمارەی بەختی ئەوە، بەهۆی ئەوەشەوە کاتێک هەمان کەس ژمارەیەکی دیکەی بۆ دەردەچێت، تووشی بێتاقەتی دەبێت و پێیوایە بەختی نییە. یان لەوانەیە لە ڕۆژێکی هەفتە یان لەکاتی بینینی کەسێک، یان لەکاتی ئەنجامدانی کارێک، شتێکی چەند جارێک بۆ دووبارەبێتەوە بەشێوەی ڕێکەوت، بەوپێیەش وادەزانێت هەرکاتێک

ئەو کارە بکات ڕوودەوەکە ڕوودەدات، ئەمە بە جۆرێک لە جۆرەکان لە مێشک و بیرکردنەوەی تاکی ئێمەدا جێگیربووە و وەک بەشێک لە کولتووری لێهاتووە، مرۆڤەکان بێ ئاگایانە کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی ئەم بیرکردنەوانە و خۆیان لەم ڕووداوانە بە دووردەگرن، شتێک هەیە کە زۆر نزیکە لە خورافەوە و هەندێکجار تێکەڵی یەکتر دەبن، کە ئەویش ئەفسانەیە، ئەفسانە بیرکردنەوە سەرەتاییەکانی مرۆڤی سەرەتاییە، دەربارەی مرۆڤ و بوون و مردن و ژیان، بەڵام بیرکردنەوە خورافییەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شتانەی، کە مرۆڤ هۆکاری دروستبوونەکەی نەزانیون، بۆ ئاسوودەیی دەروونی خۆی دایڕشتوون، ئەفسانە تاڕادەیەک ڕەگێکی واقیعی تێدایە و دەکرێت لە داهاتوودا ببێتە واقیع، بەڵام خورافە هەرگیز نابێتە ڕاستی، چونکە لەسەر بنەمای ژیری و ئەقڵ دروستنەبووە و بەسراوەتەوە بە سایکۆلۆژیای مرۆڤەوە و هەرگیز کۆتایی پێنایەت، بۆ نموونە لەم سەردەمی زانست و زانیاری و تەکنەلۆجیایەدا چەندین گرفتی سیاسیی و کۆمەڵایەتی و تەندرووستی بوونیان هەیە، کە مرۆڤ بۆ چارەسەرکردنیان پەنا دەباتە بەر خورافە، بۆ نموونە پەتای کۆرۆنا زانستی پزیشکی نوێ نەیدەتوانی چارەسەرێک بۆ ئەم ڤایرۆسە بدۆزێتەوە؛ بۆیە مرۆڤەکان هەوڵیاندەدا لە ڕێگەی چەندین بابەتی خورافییەوە ئەم دەردە چارەسەربکەن، کە تەنانەت تەکنەلۆجیا ڕۆڵی گرنگی دەگێڕا لە بڵاوکردنەوەی ئەم خورافانەدا، هەندێکجاریش خورافەکان بۆ مەبەستی سیاسی دروستکراون، بۆ نموونە ئەستێرەناسی، بورجەکان، کە ڕاستەوخۆ لەلایەن میدیاکانەوە بڵاودەکرێنەوە.

کولتوور لە چەندین توخمی جیاواز و لێکدراو پێکهاتووە، هەر توخمێکیش لەگەڵ توخمی دیکە پێکەوە گرێدراون، پێکهاتەکانی ناو کولتوور ماددیی و مەعنەوین، میتۆلۆژیا، سیستمی زمان، هونەر، ئایین، سیحر و بیروباوەڕ، دابونەریت و پەیوەندییەکان لەو توخم و پێکهێنەرە کولتوورییانەن.

میتۆلۆژیا: گەورەترین و بەهێزترین توخمی کولتوور میتۆلۆژیایە، کە هەرچەندە لە ژیانی ڕۆژانەدا بەزەقی دیار نییە، بەڵام هێزێکی سەرەکییە لە زۆربەی کۆمەڵەکان کەوا سیستەم و دابونەریتەکان کارادەکات، ئەوەتا باڵاکردنی بەها و بیروباوەڕ لە خورافات و ئەفسانەکانی بەرایی بێجگە لەوەی فاکتەرێکە بۆ گواستنەوەی ئەو بەها و بیروباوەڕانە بۆ تازە پێگەیشتووانی کۆمەڵ، ئەوا لەهەمانکاتدا مەبەستێکی

نادیار لە ناوەڕۆکیدا بەدیدەکرێت، کە ناڕاستەوخۆ ئاڕاستەی ئەقڵی مرۆڤەکان دەکرێت، بەمەش لە نەخشەی زەینییان تۆمار دەبێت، ئەو مانا نادیارەش لە سادەترین شێوەیدا دەربڕینی بەهاو چەمکی خێر و شەڕە، هەروەها چیرۆکە زارەکییەکانیش، کە گێڕانەوەی ئەفسانەیە زانیاریی بە منداڵ دەدەن لەبارەی شێوەی ڕووبەڕووبوونەوەکانی مرۆڤی سەرەتایی لەگەڵ سروشت و گیانەوەرە دڕندەکاندا.. (٢)

**ئەفسانە تاڕادەیەک ڕەگێکی واقیعی تێدایە و دەکرێت لە داهاتوودا ببێتە واقیع، بەڵام خورافە هەرگیز نابێتە ڕاستی، چونکە لەسەر بنەمای ژیری و ئەقڵ دروستنەبووە و بەستراوەتەوە بە سایکۆلۆژیای مرۆڤەوە**

بەم پێیە ئەفسانە و خورافە بەشێکی گرنگ و پێویستە لە کولتووری هەر نەتەوەیەکدا و هەرگیز لە یەکتری دانابڕێن، خورافە یەکێکە لە بەرهەمەکانی خەیاڵ و تێڕوانینەکانی مرۆڤ بۆ دیاردە و ڕووداوەکان، هەندێکجار هێندە خەیاڵی مرۆڤ پڕدەکات، کە کاریگەریی تەواو لەسەر هەڵسوکەوت و بیرکردنەوەی دادەنێت، پاشان تەشەنە دەکات و زۆرینەی کۆمەڵگە دەگرێتەوە...(٣). لێرەوە ئاوڕ لە ڕەنگدانەوەی هەردوو چەمکی کولتوور و خورافەی سیاسیی لە ڕۆمانی (دەریاس و لاشەکان)ی – بەختیار عەلی دا دەدەینەوە. «دەریاس و لاشەکان» ڕۆمانێکی کورت و لە هەمانکاتدا شاکارێکی تری «بەختیار عەلییە»، لەم ڕۆمانەدا کەڵکەڵەی شۆڕش و جوانییەکانی، شۆڕش و تارمایی و وەهمەکانی، هەموو شار و وڵات دەخرۆشێنێت، دیارە ڕۆماننووس لەم ڕۆمانەدا یەکێک لە نەخۆشییە دیارە بەرچاوەکانی ئەمرۆی گەلانی جیهان وێنا دەکات، کە ئەویش نەخۆشی جوڵانەوە گۆڕانخوازەکان و شۆڕشە وەهمییەکانی ناوچەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستە، کە شۆڕش و گۆڕانکاری بووە بە وەهم و خەیاڵ و ئەم ڕۆمانە پڕە لە خورافەی

سیاسی و سەرکردەی خورافی و شۆڕشگێڕی خورافی، کە تەنها ڕیکلام بۆ گۆڕانکاریی و نوێخوازی دەکەن و هەمیشەش خۆیان دووبارەدەکەنەوە و ناتوانن لە ڕەگەوە بیر و بۆچوونە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی خۆیان بگۆڕن.

نووسەر لە ڕۆمانی «دەریاس و لاشەکان»دا ، بەشێک لە مێژووی پڕ تراژیدی خۆرهەڵات و کوردمان بۆ دەخاتەڕوو، بەشێوەیەکی ئەدەبی و خەیاڵی دەستدەبات بۆ دەستنیشانکردنی نەخۆشییە سیاسییەکەی گەلانی خۆرهەڵات، کە مێژووی ئێمەش بەشێکی دانەبڕاوە لێی، دەستنیشانکردن و دیاریکردنی کێشە و گرفتە مێژووییەکان ئەرک و بەرپرسیارییەتییەکی گرنگی نووسەر و داهێنەرەکانی ئەم ناو چەیەیە. ڕەنگە کتێبەکانی بەختیار بەگشتی و ڕۆمانەکانی بەتایبەتی باشترین ئەو کتێبانە بن، کە دەستیانبردووە بۆ ڕەگوڕیشەی نەخۆشییە سیاسی و مێژووییەکانی ئەم ناوچەیە. ئەگەر سەرنجبدەین لە سەرەتای ڕۆمانی (دەریاس و لاشەکان)، لە جێگایەکدا تەرمی (سەردار قەمەرخانی) دەهێنرێتەوە و دووبارە دەنێژرێتەوە، لێرەوە چیرۆکی نەخۆشییە سیاسییەکە و ڕەگو ڕیشەکەی دەستپێدەکات، ئەمەش لە تێڕوانینەکانی –ئەلیاس–ەوە تێدەگەین، کە بەمشێوەیە دەستپێدەکات: لە مەراسیمی ناشتنەکەی سەردار قەمەرخانیدا ئەلیاسمان نەبینی، کە ئەودەم گەنجێکی هێمن بوو، تازە دەلاکخانەیەکی بچووکی لە نزیک مزگەوتی شینەوە کردبووەوە، وەک خۆی دەیگوت ئەم سیاسییە ڕزیوەی بۆ گرنگ نییە، کە دوای شازدە ساڵ مردن ئێستا لە دارجگەرەیەکی ڕزیو دەچێت، نەوەک لە قارەمانێکی شەڕە بێ سوودەکانی چل ساڵ لەمەوبەر، کە پێمانگوت ئەمڕۆ مەیتی قەمەرخان دەهێننەوە، بە دەنگێکی جدی گوتی دەبوایە لاشەکەی لە شوێنی خۆی نەجوڵێنن، باش نییە مردوو زۆر ئەمدیو ئەودیو بکەیت، ئەو هەر لەو زەمانەوە گاڵتەی بە قەمەرخانی دەهات و بەردەوام بۆ کەسێکی دی دەگەڕا، وەک سەرۆک و ڕابەری خۆی لێیبڕوانێت.(٤)

ئەگەر سەرنجی کاردانەوەی –ئەلیاس– بدەین لەبارەی قەمەرخانیی و ڕۆڵە سیاسییەکەیەوە دەبینین وەک مرۆڤێکی نوێخواز، ڕەخنە لە مێژووی سیاسی ڕۆژهەڵات دەگرێت، بە سیاسەتێکی ڕزیو پێناسەی دەکات و ڕەتیدەکاتەوە، لەکاتێکدا قەمەرخانی سیمبوولی قارەمانی و شۆڕشگێڕی سیاسی ئێمەیە کراوە بە سەرکردەیەکی ئەفسانەیی مێژوویی ئەم ناوچەیە، وێنای کەسایەتییەکی خورافی

بۆ کراوە، لەبری تێگەیشتنێکی بابەتییانە بۆ ڕۆڵ و کەسایەتییەکەی، وەک جەنەراڵ و سەرکردەیەکی ئەفسانەیی باسیکراوە، قەمەرخانی لەچوارچێوە و واقیعە کۆمەڵایەتییەکەی خۆی دەرکراوە و کەسایەتییەکی جیاوازی دوور لە واقیع بۆ دروستکراوە، کە ئەمە ڕەگوڕیشەی ئەم دەردە سیاسییەی کۆمەڵەکانی ڕۆژهەڵاتە، بەڵام ئەلیاس وەکو ڕۆشنبیرێکی ئەم کۆمەڵە وادەردەکەوێت، کە بەتەواوەتی دیوە ڕزیوەکەی ئەم پاڵەوانەی بینیوە و ئاشنای بووە؛ بۆیە پێیوایە مێژووی ئێمە بە گۆڕانکاریی جەوهەریدا تێپەڕ نابێت، زیاتر بریتییە لە دەستاودەستکردنی زۆرە ملێیانە، بە دەستکاریکردنێکی سەرەتایی و ڕەنگگۆڕینەوە، دیارە – ئەلیاس- بە دوای دۆزینەوەی سەرکردە و ڕابەرێکی دیکەدا دەگەڕێت، دەیەوێت گەورەیەکی دیکە بۆ خۆی بخولقێنێت، دیارە مەبەستی نییە دونیایەکی جیاواز بۆ خۆی دروستبکات، بە دوای ڕوانین و دونیابینییەکی تازەدا ناگەڕێت، ئەو کێشەی لەگەڵ گەورەیەکی سیاسیدا هەیە و ڕەتیدەکاتەوە، لایەنگری بۆ گەورەیەکی سیاسی دیکە لەسەرڕیایەتی.

دەتوانین بڵێین ئەمە کێشەی زۆرێک لە گەلەکانی ڕۆژهەڵاتە، کە مرۆڤێک دەکەن بە گەورەی خۆیان و شوێن بیروباوەڕەکانی دەکەون بەبێ ئەوەی بە دوای بیر و تێڕوانینی نوێدا بگەڕێن هەموویان هەڵگری هەمان دونیابینین، دەتوانین بڵێین مێژووی ئێمە کارخانەی بەرهەمهێنانی مرۆڤی گەورە و سیاسییە بەناونیشانی جیاوازەوە، بەڵام هەڵگری هەمان بیروباوەڕ و دونیابینین، لە دەستپێکی ئەم ڕۆمانەدا باس لە پەیوەندییە جیاوازەکانی مرۆڤ دەکرێت بە سەرۆک و مردوو، باس لەو پەیوەندییە دەکرێت، کە لە نێوان مرۆڤە سیاسییەکانی ئەم دەڤەرە و شوێنە بەرزەکاندا هەیە، لەم ڕۆمانەدا تێگەیشتنێکی تەواو خورافی بۆ سەرۆک و سەرکردە سیاسییەکان دروستکراوە، بە جۆرێک لەچوارچێوە مرۆییەکە دەرچووە، بوونێکی نەمریی پێبەخشراوە، بە جۆرێک سەرۆکەکان ئەگەر بە جەستەش نەمێنن ڕێباز و بیروباوەڕەکانیان هەر دەمێنێتەوە و مرۆڤ دەبێت بیانپارێزێت و بۆ ژیانی خۆی پێڕەویان بکات، واتە سەرۆکەکان بە مردن کۆتاییان نایەت، بەڵکو ڕێبازەکەیان بەردەوامە. «بەختیار علی» لەو نووسەرانەیە، کە کێشەی گەورەی لەگەڵ پیرۆزکردندا هەیە، لەم ڕۆمانەدا پیرۆزکردن لە ئایینەوە بۆ سیاسەت گواستراوەتەوە، ئەمجارە لەبری پیاوی ئایینی سیاسییەکان بە پیرۆزکراون و نووسەر بە یەکێک لە دەردە کوشندەکانی سیاسەتی کۆمەڵی کوردی دەزانێت،

که ئەم پیرۆزییانە ڕێگە بە گۆڕانکاری نادەن، وەک دەڵێت: لە ترسی کاری خراپەکارانە سیاجێکی بەرزمان بۆ گۆڕستانەکە دروستکرد و پاسەوانی زۆرمان بۆ دانا، هێندە زۆر ڕۆژێک ویستمان گۆڕستانەکە تێکبدەین و خۆمان لەم هەموو سەرۆکە بێکەڵکە ڕزگاربکەین، بوو بە بەڵا بۆمان.(٥)

ئێمە لەکۆمەڵێکداین سەرۆکەکان بە مردووییش پارێزگاری لە گۆڕەکانیان دەکرێت. چەندێک خراپەشیان هەبێت هەموویان پشتگیر و پشتیوانی خۆیان هەیە، سەرەتای چیرۆکی «ئەلیاس « و «دەریاس» چیرۆکێکی خێزانی و کۆمەڵایەتییە، چاوەڕوانی هاتنەوەی باوک لە سەرەتاوە چاوەڕوانی سەرتاسەری کۆمەڵە بۆ هاتنی باوکێکی فریادڕەس و ڕزگارکەر، بەپێی ئەو ڕۆڵ و سەرکردایەتییەی کە باوک لە خێزاندا هەیەتی و وەک فریادڕەس سەیردەکرێت، هەروەک ئەو چاوەڕوانییەی، کە ستارەخانی دایکی دەریاس و ئەلیاسیش هەیەتی بۆ گەڕانەوەی سێبەری باوک، بەڵام دەریاس خودی باوک و گەڕانەوەشی وەکو وەهم و خورافەیەک دەبینێت و هەر ئەوەش وایلێدەکات بچێت لە خۆرئاوا مێژووی وەهم بخوێنێت و وەڵامی پرسیارەکانی خۆی سەبارەت بە خورافە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان بدۆزێتەوە. دەبێتە گەنجێکی یاخی لە تەواوی ئەو وەهم و خورافانەی دایک و براکەی و تەواوی کۆمەڵ بەدەستییەوە دەناڵێنن، لە ڕوانینی دەریاسدا جۆرێک لە نێوان دژی هەیە، بەتایبەت لە جێیەکدا تێگەیشتنی دەریاس بۆ شۆڕش و ئەنجامدانی گۆڕانکاری نیشاندەدرێت: دەریاس هەموو وڵاتەکەی وادەهاتە پێش چاو، وەک جێگایەک، کە ناتوانرێت شتێکی گرنگی تێدا بگۆڕدرێت، شتەکان وادانرابوون و دروستکرابوون، یان دەبوو بڕوخێنرێن، یان دەستیان لێنەدرێت. لە دوای دوو مانگ ژیان لە شارەکەدا تەواو گەیشتە ئەو بڕوایەی، کە لەو کەسانە نییە بتوانێت هیوای گەورە دروستبکات، بەڵکو دەتوانێت وەک هەموو خەڵک لەگەڵ بێئومێدییەکەی خۆیدا ڕابێت و ئاسودەبژی.(٦).

– دەریاس پێیوایە دونیا و جیهانی لەمشێوەیە یان دەبێت بڕوخێنرێت یان دەستکاریکردنی مەحاڵە، دەریاس شۆڕش وەک خورافەیەک سەیردەکات، کە لە کۆمەڵی ئێمەدا هەرگیز دروستنابێت، چونکە شۆڕشێک، کە لەسەر بناغەی گۆڕانکاری و دونیابینی جیاواز دروستببێت لەم وڵاتەدا مەحاڵە، لەبەرئەوەی شۆڕشگێڕەکان هەڵگری هەمان بیرەکانی پێشترن و لە ڕووخساری نوێدا خۆیان

نمایشدەکەنەوە، یەکێک لە بنچینەکانی نائومێدکردنی مرۆڤ، بەخشینی هێز و دەسەڵاتی خودایە بە شۆڕش و لەنێویشیدا بە سەرۆک، هەربۆیە دەریاس لە سەیرکردنی بیرکردنەوەی مرۆڤەکانی سەردەمەکەی خۆیەوە هەست بەو دەسەڵاتە دەکات کە خورافە کێشاویەتی بەسەر بیرکردنەوەی مرۆڤەکاندا؛ هەربۆیە دەڵێت: شۆڕش دەرگا لەسەر سەردەمێکی تازەی خورافات دەکاتەوە.(٧)

دەتوانین بڵێین بنەڕەتی دروستبوونی زۆربەی شۆڕشەکان وەهم و خورافاتە، ئەگەر خەیاڵی دروستکردنی ژیانێکی باشتر و شایستەتر نەبوایە شۆڕشەکان دروستنەدەبوون، ئەگەر دروستکردنی خورافە لە مێشکی خەڵکیدا نەبوایە دەموچاو و ناواخنی گشت شۆڕشەکان دەردەکەوتن، ئەمەش هێزی لەدایکبوونیانی لێدەسەندنەوە؛ بۆیە ئەوەی هەیە مرۆڤەکان تێکەڵی دەبن، ئەوە حەقیقەتی شۆڕش نییە، بەڵکو وەهمی شۆڕشە، یەکێک لەو گفتوگۆ جوانانەی لەم ڕۆمانەدا دەبینرێت گفتوگۆی «مامۆستا مەردان»ە، لەگەڵ «دەریاس»دا، کە بەهانای دەریاسەوە هات لە ناشتنی تەرمی دایکیدا دەڵێت: ئیتر مێژووی شارەکە ئەمەیە، ئەمەیە کە تۆ لەم جێگایەدا دەیبینیت. ئینسانەکان بۆ یەکێک دەگەڕێن ببن بە عەبدی، جیاوازی نێوان عەبدی ئەم زەمانە و عەبدی زەمانی کۆن ئەوەیە، ئەمانە بە ئیمانێکی توندەوە دەبن بە عەبد، بەهانە دەتاشن، بەڵگە دەهێننەوە، دەیخەنە سەری و لێی دەردەکەن، تا بیسەلمێنن کارێکی باشیانکردووە. شانازی بەوەوە دەکەن وەک کلک دوای ئاغا و دوای بەگ و دوای ئەو سیاسی بکەون، دوایی دەبن بە جەنگاوەر چەک هەڵدەگرن، دەکوژن و وێرانەیی دەنێنەوە، دواجاریش دەبن بە مەیتێکی بێسوود و ڕزیو لە شوێنێکی وادا.(٨)

کۆمەڵی ئێمە بەدەست ئەم دەردەوە دەناڵێنێت بەندایەتی هۆشمەندانە ئەم کۆمەڵەی تەنیوە، زۆرێک لە هێزە سیاسییەکان، کە خۆیان بە هەڵگری بیروڕای جیاواز لە قەڵەم دەدەن لە بنەڕەتدا لە یەک بەرنامە و بیروباوەڕەوە دروستبوون و دواجاریش دەچنەوە سەر هەمان ڕێچکەی خۆیان، هەمیشە هەردوو هەستی ڕقی زۆر و خۆشەویستی زۆر بۆ ڕێبازێک بیروباوەڕێک ئەم دونیایە بەڕێوەدەبات، مرۆڤەکانی ئێرە یان ئیمام و سیاسی و سەرۆکەکانیان زۆر خۆشدەوێت یان زۆر ڕقیان لێیەتی؛ بۆیە هەمیشە جەنگ لەسەر بناغەی ئەم هەستانە دروستدەبێت و مرۆڤ قوربانی یەکەمی ئەم جەنگانەیە، کاتێک باس لە شۆڕش و گۆڕانکاریی

دەکرێت دەبێت بزانین هەمەلایەنەیە و تەواوی لایەنەکانی ژیانی مرۆڤ دەگرێتەوە، تەنها خۆی لە سیاسەتدا نابینێتەوە، بەڵکو دەستکاری تەواوی کۆمەڵ و کولتوور و باری دەروونی تاکەکان و بیروباوەڕ و تەواوی لایەنەکانی دیکەی ژیانی مرۆڤ دەکات. هەربۆیە شۆڕشی ڕاستەقینە پێویستی بە دەستکاریکردنی هەموو ئەو لایەنانە هەیە، بەڵام لە خۆرهەڵاتدا شۆڕشەکان بەگشتی لە ڕواڵەتی نوێ و بەرنامەی کۆندا خۆیان نمایشدەکەن: لەم شارەدا تەنیا ئەو کەسە دەتوانێت خەڵک بۆ شۆڕش بجولێنێت، کە پێیان دەڵێت، بێئەوەی هیچ لە دینتان بگۆڕن، بێئەوەی هیچ لە خۆتان ئەخلاقتان بگۆڕن دونیاتان بۆ دەگۆڕم.(٩)

دەتوانین بڵێین ڕۆمانەکە ستایشێکی قووڵی «غوربەت»ی تێدایە، لە قووڵاییدا ململانێیە لە نێوان غوربەت و توانەوەدا، «دەریاس» ئەو ڕۆحە غەریبەیە، کە لە هەموو ئەوانە باشتر کۆمەڵگەی خۆی دەبینێت، کە لە نێوان ململانێکاندا نوقمبوون، واتە ئەو مرۆڤانەی، کە لەناو واقیعیی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەدا ژیاون خۆیان هەستییان بە کێشە و گرفتە کۆمەڵایەتیی و سیاسییەکان نەکردووە، بەڵکو کەسێک کە لە کۆمەڵگەیەکی تردا دەژی و دێتە کۆمەڵگەکەی ئێمەوە هەست بە گرفتەکان و نقوومبوونی ئێمە لەناو کێشەکاندا دەکات؛ بۆیە دەریاس هەرگیز دوای خورافە سیاسییەکانی کۆمەڵگەکەی ناکەوێت، دەزانێت بۆئەوەی شۆڕش بکەیت دەبێت دەستکاریی تەواوی پێکهاتەکانی ژیانی کۆمەڵگەکەت و بیرکردنەوەی تاکەکانی بکەیت بەرەو باشە و گۆڕانکاریی تاکو شۆڕشەکە ئاشتی و ئاسایشی کۆمەڵایەتی بەرهەمبهێنێت.

ئەمە ناوەڕۆکی ئەو گرفتەیە کۆمەڵەکانی ئێمە بەدەستییەوە دەناڵن، کە هەمیشە مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە و گۆڕانکارییەکان لە سنووری ڕواڵەتی تێناپەڕن، دیارە ئەم ڕۆمانە قسە و گفتوگۆی زۆر هەڵدەگرێت، بەڵام ئێمە لێرەدا تەنها دەتوانین بەکورتی قسەی لەسەر بکەین، کە یەکێکە لەو ڕۆمانانەی لە کوردستاندا کار لەسەر خورافەی سیاسی دەکات.

## ئەنجام

بناغەی دروستبوونی هەموو شۆڕشەکان وەهم و خەیاڵاتە، ئەگەر خەیاڵی دروستکردنی ژیانێکی جوانتر و شایستە تر و کۆمەڵگەیەکی ئارامتر و پێکەوەژیانی کۆمەڵایەتی لە مێشکی شۆڕشگێڕاندا دروستنەبووایە هەرگیز شۆڕشەکان دروستنەبوون.

گواستنەوەی بە پیرۆزکردن لە ئایینەوە بۆ سیاسەت، چونکە سەرکردە سیاسییەکانی کورد دوای مردنیشیان گۆڕەکانییان زیارەت دەکرێت و خەڵک بەترسەوە ناویان دەهێنن، لەکاتێکدا نەیانتوانیوە گۆڕانکارییەک لە ژیانی کۆمەڵانی خەڵکدا دروستبکەن.

## پەراوێز و سەرچاوەکان


١-محەمەد ڕزگار: خورافیات (دەرەمۆک) ، ٢٠٢١/٩/٢٨، زانیاری zaniary. Com.

٢-- ئارام ئیبراهیم حسەین دزەیی، خوێندنەوەیەکی کۆمەڵناسییانە بۆ کولتوور، ژمارە(٩) ی گۆڤاری زانکۆی ڕاپەڕین، ٢٠٢٢ ، ل٦٩٨.

٣-OA Barznji, DS Hamafaraj , Reflection of culture in the stories of Sherzad Hassan, Halabja University Journal, ٢٠٢٢, ل٧٩

٤- بەختیارعلی، ڕۆمانی دەریاس ولاشەکان، سلێمانی، چ٢، چاپخانەی کارۆ، ٢٠١٩ ، ل٦.

٥-سەرچاوەی پێشوو، ل٧.

٦-سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣.

٧-سەرچاوەی پێشوو، ل٥٨.

٨-سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٢.

٩-سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢٣.



سەڵاح سالار

# ڕۆمانی ئۆتاوا ( ٢٠٤١ )

## دیرۆکی گەلێکی ستەمدیدە و چیرۆکی شارێکی قوربانیدەر




ئۆتاوا ٢٠٤١، ڕۆمانێکی نوێی د.یادگار لەتیف شارەزوورییە، کە ساڵی ٢٠٢٣ بە قەبارەیەکی مامناوەند و لە دووتوێی ٢٢٣ لاپەڕەدا لەلایەن سەنتەری زەهاوییەوە چاپ و بڵاوکرایەوە.

نووسەر لە کورتە ناساندنێکیدا سەبارە بە ڕۆمانەکەی دەڵێت: (ئەم ڕۆمانە لە دوو ئاستدا زەمەن تێدەپەڕێنێت، لە ئاستی یەکەمدا ڕابردوو دەهێنێتەوە گۆ بە شوێن و کارەکتەرەکانییەوە، کە کۆچی پێچەوانە بەرەو نیشتمان دەکەنەوە. لە ئاستی دووەمدا، بە ئامرازێکی سەرسووڕهێنەر گەشت دەکات بۆ داهاتوو، گۆشەیەکی ئەو زەمەنەنەهاتووە بە ڕووداو و شوێنە جیاوازەکانییەوە بەسەر دەکاتەوە. لەم نێوەندەدا ئێستای ژیاو زەمەن بەخۆی و شوێن و کارەکتەر و ڕووداوە زۆرەکانییەوە هەندێک جار بە ڕوونی و هەندێک جار بە لێڵی بەپێی ڕوانگە هونەرییەکانی ڕۆمانەکە دەردەکەوێت، تیایدا نیشتمان توانای لەخۆگرتنی ڕۆڵەکانی نامێنێت، هەندێکیان بڕیار دەدەن کۆچ بکەن، کۆچی بێگەڕانەوە).

نووسەر لەم ناساندنەدا ئەوەمان دەخاتە بەرچاو، کە ڕۆمانەکەت خوێندەوە و هەستت بە دوو زەمەنی جیاواز کرد، بەتایبەت زەمەنێک، کە هێشتا نەهاتووە، ئەوە تەکنیکی ڕۆمانەکەیە.

ڕێبین ئەو پاڵەوانەیە، کە لەگەڵ خۆیدا پەلمان دەگرێت و لە سەرەتای ژیانییەوە لە شارەکەی خۆی، کە ناوی نابات و تەنیا بە ئاماژەی شاخەکە و نزیکیی لە خورماڵ و سنووری ئێرانەوە تێماندەگەیەنێت شاری سەیدسادقە. ئەڵبەت من لەم دەرفەتە کەمەدا ناتوانم خوێندنەوە و یەکی تەواوی ئەو کتێبە بکەم، دەرفەتم نییە و کاتێکی باشی دەوێت و بۆ کەسێکیش باشە شارەزایی تەواوی لە ڕۆمان و چیرۆکدا هەبێت، تا ورد لە بابەتی تەکنیک و شوێن و کات و زمان و تەواوی پێکهاتەکانی ڕۆمان بدوێت، بەڵام ئەوە دەڵێم د.یادگار شارەزووری بۆخۆی شارەزای بوارەکەیە و سوارچاکی ئەو مەیدانەشە.

ئەم ڕۆمانە بەشێکی بریتییە لە سەربوردێکی خێرای سەیدسادق بەر لە ڕاپەڕین، ڕێبین و ناری هاوڕێی دوو ناوی خوازراون، ناری لەگەڵ ڕێبینی هاوڕێیدا بەردەوامیی بە ژیان نادات و ناگاتە کۆتایی ڕۆمانەکە، ڕێبین باسی سەردەمی بەعس دەکات، کە بەشێکی شار پڕ دەبوو لە پێشمەرگە و لە بڵندگۆی مزگەوتەوە جاڕی ڕاپەڕین دەدرا، کە ئەمانە حەقیقەتن لە سەیدسادق هەبووە. ڕۆڵی شارەزوور و سەیدسادق و ناوچەکە لە خەبات و تێکۆشان و ڕقی بەعس لەو شارە لە ڕۆمانەکەدا ڕەنگیداوەتەوە و جوان هێناویەتی، تا لە کۆتایی بەشی (٢) گرێ لەو بابەتە دەدات و دەڵێت: لە ١٩٨٨/٣/١٦ پیلانەکەی بەعس جێبەجێ کرا و سەیدسادق خاپوور کرا.

**بەشی سێیەم**

بەشی (٣) لە ٢ی کانوونی دووەمی ٢٠١٤ـەوە دەستپێدەکات، واتا ڕۆژی خۆپیشاندانە جەماوەرییەکەی ٢٠١٤ی شاری سەیدسادق و شەهیدکردنی کاکە بڕیار.

لەم بەشەدا ناوی خوازراوی (کەیوان)ی داوە بە بڕیار و لەبری ناوی کاک حەسەنی باوکی شەهید بڕیاریش ناوی خوازراوی (سەلاحەدین) بەکاردەهێنێت، بەلام زۆر جوان خەیاڵ و واقیعی ئاوێتە کردووە و وتەکانی شەهید بڕیار لەبارەی خەم و خولیای بۆ شارەکەی دەخاتە ناو دێڕەکانی ڕۆمانەکە و لەسەر زاری (ڕێبین)ـەوە دەری دەبڕێت، زۆر جوان دەمانباتەوە بۆ بەردەرکی ماڵی کاک حەسەن و دەڵێت: (ماڵی کەیوان لەوپەڕی گەڕەکی حەسار بوو)، کە بێگومان ماڵی شەهید بڕیار لەوپەڕی حەسارە، کە یەکێکە لە گەڕەکە دێرینەکانی سەیدسادق و سەرچاوەی ئاوی حەساریش بەرانبەری ماڵی ئەوانە. تەنانەت لە جلوبەرگەکەشدا فۆتۆگرافەرانە وێنەی بڕیارمان پیشان دەدات و دەڵێت: (کەیوان هەناسەیەی قووڵی هەڵکێشا، قۆڵی کراسە سەوزە نیمچە فشە درێژەکەی هەڵکێشا..). بێگومان شەهید بڕیار ڕۆژی خۆپیشاندانەکە قەمسەڵەیەکی سەوزی لەبەردا بوو، بەو بەرگە سەوزەشەوە شەهید کرا، باسی ئەوەش دەکات کەیوان دەیوست هێمنانە خۆپیشاندانەکە بکرێت و دووربێت لە توندوتیژی.

نووسەر جوانتر کەیوانمان پێدەناسێنێت و دەڵێت: دروشمەکانی بریتیبوو لە کوا هەلی کار؟ کوا زانکۆ و پەیمانگاکەمان؟ ... هتد، کە دروشمی لافیتەکەی دەستی شەهید بڕیاربوو.

**بەشی چوارم**

لە بەشی (٤)دا نوسەر لەناو خۆپۆیشاندانەکەی سەیدسادق دەمانباتەوە بۆ یادەوەریی ڕێبین لە سالانی دێرنی سەیدسادق، بە فلاشباک دەمانخاتەوە یادی مامۆستا عەبدوڵلای کوڕی مام عەولی خاوەنی چێشتخانە کۆنەکەی سەیدسادق، ئەڵبەت حاجی عەول ناوێکی تەواو و واقیعییە و پیاوێکبوو، کە شاری سەیدسادق دروستکرا ماڵی هێنایە ئەو شارە و چێشتخانەی کردەوە و تا کۆچی دوایی کرد لەوێ ژیا، بەلام کوڕی هەر نەبوو، نووسەر هاتووە کوڕێکی خوێندەواری ئاستبەرزی بۆ دروستکردووە، کە ناوی عەبدولایە و مامۆستای زانکۆ بووە و ماوەیەکیش خۆبەخشانە مامۆستای ناوەندییەکەی سەیدسادق بووە، ئەم تیکەڵکردنە

شارەزایی و توانای بەرزی نووسەرە لە ڕۆمانەکەیدا، تەنانەت نووسەر دەست لە مامۆستا عەبدوڵلا، یاخود د.عەبدوڵلا بەرنادات و ئەویش دەکاتە پاڵەوانێکی تری ڕۆمانەکەی، کە پاش شەهیدکردنی لەلایەن بەعسیشەوە ڕۆڵی لەم ڕۆمانەدا کۆتایی نایەت و هەتا دوابەشەکانی ڕۆمانەکە لەگەڵیدا دەژین.

**بەشی پێنجەم**

لە بەشی (٥)دا ڕۆمانەکە دەگەڕێتەوە بۆ خۆپیشاندانەکەی ٢٠١٤ی سەیدسادق، کات پاش عەسر تا ئێوارە خۆی دەنوێنێت و بەوردی کامێرای نووسەر وێنەی ئاپۆڕای جەماوەر و ڕۆڵی کەیوان دەگوازێتەوە، تا ئەوکاتەی هێزە ئەمنییەکان بە ناڕەوا دەستڕێژ لە خۆپیشاندەرانی مەدەنیی دەکەن و کەیوان (بڕیار) شەهید دەکەن. لەو بەشە غەمگینەدا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی شۆڕش، چۆن باوکی کەیوان لە گوندەکەی خۆیان بە تراکتۆرەکەی خزمەتی پێشمەرگەی دەکرد، چۆن دەهات لە سەیدسادق لای وەستا مستەفای خەیات قاتی ڕانکوچۆغە بدورێت و بیبات بۆ پێشمەرگە، ئەوەش وەفای شۆڕشگێڕەکان ئەمڕۆ بە ناڕەوا کوڕەکەیان شەهید و جوانەمەرگ کرد.

**بەشی شەشەم**

لە بەشی (٦)دا دیمەنە خەمبارەکەی سەردەمی کیمیابارانی هەڵەبجە و خاپوورکردنی سەیدسادق دێتە پێشەوە. ڕێبینی پاڵەوانی ڕۆمانەکە لەگەڵ خۆی دەمانباتەوە بۆ قۆناغی وێرانکرانی سەیدسادق، چۆن شارە جوان و خۆشەویستەکەی خاپوور دەکرێت و هەتا ئەوساتەی بار دەکەن بۆ ئۆردووگاکانی باریکە و نەسر، شۆفڵەکانی بەعس چۆن خانووەکانی شار دەڕووخێنن، دوژمانی بەعس، کە زۆر ڕقیان لە سەیدسادقە هەلیان بۆ هەڵکەوتووە و بە ماددەی (TNT) خانووەکان دەتەقێننەوە، بەدیارچاوییەوە شارەکەی باوان بەجارێ خاپوور کرا.

وێنە هونەرییەکانی ئەم بەشە وەستایانە گیراون، وەک دەڵێت: (شۆفڵی دەمکورت و مل درێژ چۆن بەربووەتە شار، تەلی کارەبا و محاویلەکان دەشکێنێت و دێنێتە خوار، هەموو دوکانەکانی تێکداوە، تا گەیشتمە دوکانی خۆمان، وا هاتە پێش چاوم، کە بەناو دۆزەخدا ڕێ دەکەم)، دواتر ئەو دیمەنەمان بۆ دەگێڕێتەوە، کە بەعس نەک ماڵ و دوکان و مزگەوت، بەڵکو واز لە دار و درەختیش ناهێنێت و هەمووی وێران دەکات، دەڵێت: (دەبینم شۆفڵێک باوەشی کردووە بە قەدی دارتووە گەورە

نازدارەکەی بەر دووکانەکەمان، پاش چەند نەرەنەرێک لە بن دەری هێنا و فڕێیدا).

ئینجا ڕێبین دەکەوێتە ناو دەریای خەیاڵی یادگارییەکانی ڕابردوو لە حەوشە و سەربان و خەوی سەر قەرەوێڵەی ناو چیمەن و دارتووەکانی ماڵەوە و دووکانەکەیان، تا زیاتر دەڕوات و دەڵێت: (ئازاری لەناوچوونی ڕێگەکانی شار و کووچە و کۆڵانەکان و مزگەوتەکان بەتایبەت مزگەوتی گەورە و مزگەوتی شێخ تایەر، ئەی چی بکەم لەو هەموو یاری و پێکەوەبوون و کاتە خۆشانەی لە حەوشەی حاجی و سەر شاخەکەی ئەمبەر و ئەوبەر و کانیاوی خوداداد و گۆڕەپانی یانەی تیشک و جووتیاران و حەمامەکەی قالە و قوتابخانەی بەرهەم و دواناوەندی سەیدسادق و جادەی پێنجوێن و کانیاوەکانی حەسار و باخەکەی لای ئاشەکەی ماجید بەگ لەگەڵ هاوڕێیان بەسەرمان دەبرد).

بەوەندە کوڵی دڵی ڕێبین دانامرکێتەوە، دیسانەوە فلاشباک دەخاتەوە کار و دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی جوانییەکانی شارە نازدارەکەی سەیدسادق و دەڵێت: (خەمی لەدەستچوونی بینینی ئاسمانی شینی شارم بوو، دڵتەنگی جارێکی تر نەبیستنەوەی گرمەگرمی هەورەکانی بووم، بیرم لە بێنازیی خاکە بەپیتەکەی دەکردەوە، دڵم لای دەشتە جوانەکەی شارەزوور بوو، لە بەهاراندا کاتێک خۆی دەڕازێنێتەوە و نمایشی جوانییە سەرسووڕهێنەرەکەی دەکات، ئیتر کەسی دەستناکەوێت گۆرانی بۆ بڵێت، دەستلەملانی بێت، جارێکی تر گوێی لە هۆرەی (ئەحە شاشە) نابێت، وەلی دێوانەی لێ نەماوە شیعر بۆ شەیدابوونەکەی بنووسێت، تازە شەم مرد، شەم مرد).

**بەشی نۆیەم**

لە بەشی (٩)دا زیاتر گێڕانەوەی مامۆستا عەبدوڵڵایە، کە کوڕی شارەکە و مامۆستای ڕێبین بووە لە ناوەندیی سەیدسادق، لەسەر زاری دایکی عەبدوڵڵا، کە بەعس بێسەروشوێنی کردووە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: (ئەو خۆشەویستییەکی زۆری بۆ سەیدسادق هەبوو، تا دەگاتە باسی دووکانەکانی خۆیان و باسی دووکانەکانی (سابیری قەساب و کەبابخانەکەی عەلی کەبابچی و کوڕەکانی)، ئەو دوو کەسەی ناویان هاتووە کاسبکاری دیاری شارەکە بوون و ناوەکانیش حەقیقییە.

**بەشی سیازدەیەم**

لە بەشی (١٣)دا ڕۆمانەکە دەچێتە سەر دەقی ئەو دەفتەرە دەستنووسەی کە د.

عەبدوڵڵا بیرەوەرییەکانی خۆی تێدا نووسیوە و لای هاوڕێیەکی بووە لە زانکۆی بەغدا، مامۆستا عەبدوڵڵا دەڵێت: (لە ١٨ی تەمووزی ١٩٦٨ لە لەندەنەوە گەڕامەوە بۆ دیمەشق و لەوێوە بۆ بەغدا و پاشان بۆ دوو هەفتە گەڕامەوە سلێمانی ... پاشتر بڕیامدا سەردانێکی شارەزوور بکەم، بەیانییەکی زوو خۆم گەیاندە سەیدسادق لە چێشتخانەکەی باوکم نانی بەیانیم خوارد و برادەرانی منداڵیم ئاگادارکردەوە، کە خۆیان حازر بکەن بۆ پیاسەیەکی ناوچەکە. سەرەتا چووینە خواداو کەمێک لەوێ ماینەوە و تێر ئاوی سازگارمان خواردەوە، ئینجا پەڕینەوە بۆ گوندی حاجی نامیق _ سەیدسادقی ئەولا ـ لەوێشەوە بەناو خاکە چێنراوەکاندا بەدەم قسەی خۆش و ناوبەناو وچانەوە ڕۆیشتین بۆ ناوگردان، لەوێش بە تراکتۆرێکی ماڵی سەلاحەدینی حاجی ئەورەحمانی برادەرمان چووین بۆ بێرەشکە و شاتووان، بەدەستە چەپدا بەرەو مەستەکانی حاجی ئەحمەد بەڕێکەوتین و پاشان خۆمان گەیاندە دۆلاش، بۆ ئێوارەکەی گەڕاینەوە ناوگردان و بە جیبێک هاتینە گردەنازێ و ئینجا بەرەو شار گەڕاینەوە، بۆ ڕۆژی دوایی بڕیاماندا بچین بۆ گوندەکانی بناری شارەزوور، لە گامێشتەپەوە چووین بەرەو گوندی مەلاوەیسە و ڕیشێن، تا درەنگانێکی شەو لە کانیاوە جوانەکەی ڕیشێن ماینەوە).

ئەو شوێنانەی ناویان هاتووە گوند و شوێنی دیاری دەوروبەری سەیدسادقن، (خواداو، یان خوداداد، گۆمێکی گەورەبوو لە ڕۆژهەڵاتی سەیدسادق، لەبەردەم ئاوایی حاجی قادری مارف، چەند ساڵێکە وشکی کردووە.

**بەشی شازدەیەم**

لە بەشی (١٦)دا گەیشتووەتە ڕۆژی ١ی کانوونی دووەمی ٢٠٤١، لەم بەشەدا پاڵەوانی ڕۆمانەکە (ڕێبین) لە شاری ئۆتاوای ئەمریکایە و پیربووە، ئیمەیڵی زۆری بۆ هاتووە، نامەیەکیان سەرنجی ڕادەکێشێت، کە بەناوی غەریبستانەوە بۆی چووە، دواتر پاش وەڵام و قسەکردن بە تەلەفۆن، پێی دەڵێت من سەلاحەدینم لە ناوگردانەوە دەهاتم بۆ قوتابخانە و لە یەکی ناوەندی لە پێشی پێشەوە دادەنیشتم. ئیتر ڕێبەر بۆی دەرکەوت ئەم کەسە (مامۆستا سەلاحەدین)ی باوکی کەیوانە، واتە مەبەستی کاک حەسەنی باوکی شەهید بڕیارە.

نووسەر لێرەدا دوو مێژووی بەکارهێناوە، کە زۆر وەستایانە ڕێکی خستووە، ١ی کانوونی دووەمی ٢٠٤١، ئەم ژمارانە بە کەمێ دەستکارییەوە نزیک دەبنەوە لە

٢٠١٤\١\١٢، کە کەیوان (بڕیار)ی تێدا شەهید کرا. لەم بەشەداماڵی باوکی کەیوان بەهۆی بێئۆقرەیی و خەمباریی و بێزارییان لە دۆخی کوردستان کۆچیان کردووە بۆ سلێمانی و لەوێش خەم بەرۆکی بەرنەداون، بەناچاریی و دڵی شکاوەوە وڵاتیان بەجێهێشتووە بەرەو هەندەران و لە نەمسا گیرساونەتەوە.

مامۆستا سەلاحەدین دەڵێت: (بڕیامدابوو هەرگیز نەگەڕێمەوە بۆ کوردستان، بەڵام پێناچێت لە نەشکاندنی بەڵێنەکەم سەرکەوتووبم ... کەیوان سێ شەو لەسەریەک هاتە خەونم، شەوی یەکەم و دووەم وتی پێویستە بگەڕێیتەوە، شەوی سێیەم هاتەوە خەونم وتی: باوکە کەی تۆ وابوویت داواکاریی من پشتگوێ بخەیت؟ باوکەگیان چاوەڕێتم ...). لێرەدا گفتوگۆی خەونەکەی کەیوان و باوکی بەجێدەهێڵم بۆ خوێنەران و تەنیا ئەو چەند دێڕەم بۆ ئێرە گواستووەتەوە.

**بەشی حەڤدەیەم**

لە بەشی (١٧) و کۆتایی ڕۆمانەکەدا نووسەر پەنجە و دیدەی ڕێبینی پاڵەوان دەکاتە فلاشباک و دەگەڕێتەوە بۆ هەندێ یادەوەریی ڕابردووی عێراق و کوردستان، کە بەنیسبەت ئەو کاتەی ڕۆمانەکەوە، کە ١٥ی شوباتی ٢٠٤١ە، زەمەنێکی زۆر تێپەڕیوە بەسەر ئێستای واقیعی ئەم سەردەمەی، کە من و تۆی تێدا دەژین و هێدی هێدی گرێی کۆتایی دەدات لە پریاسکەی چیرۆکەکەی و چاوی ڕێبین دادەخات و زمانی دەبەستێت و سەری قەڵەمەکەی دەکاتەوە بەسەر نووکی پێنووسەکەیدا و قەڵەمەکەی لەسەر مێزی نووسین دادەنێت، من و تۆش دووتوێی کتێبەکە دادەخەین و بڕیار دەدەین شەوێکی دیکەش دووبارە تەقە لە دەرگای یەکەمی ئەم قەڵای ڕۆمانە بدەین و دیسانەوە لە دەروازەی شاری ئازیزی سەیدسادقەوە بڕۆینەوە ناو قەڵای ڕۆمانەکە و دووبارە لەگەڵ ڕێبین و مامۆستا عەبدوڵڵادا پیاسەیەکی تر بە کۆنەڵاکانی دێڕەکانیدا بکەینەوە.

مامۆستا عەبدوڵڵا لە بەشەکانی دیکە هەندێ جار بە دکتۆر عەبدوڵڵا ناوی هاتووە، چونکە پێشتر مامۆستا بووە و پاشان بووەتە دکتۆر، بۆیە لە بەشەکانی سەرەتا بە مامۆستا ناوی دێنێت و دواییش بە دکتۆر عەبدوڵڵا باسی دەکاتەوە، دەبێت خوێنەر ئەوە بزانێت کە هەردووکیان یەک کەسن.

## هەڵەی زانیاریی و مێژوویی

هەندێ هەڵە لەم ڕۆمانەدا هەیە بەباشم زانی ئەوانەش ڕاست بکەمەوە، هەرچەندە نووسەر خۆی شارەزوورییە و کەسایەتییەکی زانستییە، بەڵام تەنیا خودا هەڵە ناکات.

لە بەشی شەشەمدا کاتێک باس لە سەردەمی کیمیاییبارانی هەڵەبجە و خاپوورکردنی سەیدسادق دەکات، دەڵێت: (لەپێش ئەم ڕووداوە نەخوازراوە بە چەند مانگێک بەشێکی زۆری خاکی کوردستان دووچاری هەڵمەتی دڕندانەی ئەنفال بووەوە). ئەم قسەیە وەک مێژوو ڕاستە و شاڵاوەکانی ئەنفال بەر لە کارەساتی کیمیاییبارانی هەڵەبجە و خاپوورکردنی سەیدسادق بوو. بەڵام پاش ئەو کارەساتە جەرگبڕەی هەڵەبجە و خاپوورکردنی سەیدسادق ئینجا ناوی شاڵاوەکە بە ئەنفال ناسێنرا، واتا پێشتر تەنیا وەک هێرشی بەعس بۆ سەر ناوچەکان بیستبوومان و ڕژێمی بەعس خۆیشی هەر دوای ئەوە ڕایگەیاند کە ئەوە هەڵمەتی ئەنفالە بۆ سەر ناوچەکانی ژێردەستی پێشمەرگە.

هەرچەندە ئەمە هەڵە نییە، بەڵام خوێنەر دەکەوێتە هەڵەوە کە دوایی وا دەزانێت بەر لە کارەساتی هەڵەبجەش ئەنفال ناوی هەبووە.

لە کۆتایی هەمان بەش باسی گۆرانیبێژێکی میللی سەیدسادق دەکات و دەڵێت: (ئەحە شاشە)، ڕاستییەکەی ئەو گۆرانیبێژە ناوی (ئەحە شەشە)یە نەک شاشە.

لە بەشی هەشتەم، لە لاپەڕە ٧٦ ئەوکاتەی بەدوای ماڵی حاجی عەول و مامۆستا عەبدوڵلادا دەگەڕێت، تووشی بە ماڵێکی پێنجوێنییەوە دەبێت و پرسیاری ئەو ماڵەیان لێدەکات، ئەویش دەڵێت: (بەخوا ئێمە لە بنەڕەتدا لەم گەڕەکە نیشتەجێ نەبووین، لە ساڵی ١٩٨٢ـەوە هاتووینە ئێرە، پێشتر لە پێنجوێن بووین جەنگ ناچاری کردین ئەوێ بەجێبهێڵین و لێرە بگیرسێینەوە). پێنجوێن لە پاییزی ١٩٨٣ هێرشی کرایە سەر و شەڕ بەرۆکی گرت و ئەو شارە جوانە خاپوور کرا و خەڵکەکەی ڕوویان کردە سەیدسادق و عەربەت و سلێمانی، نەک ساڵی ١٩٨٢.

لە بەشی دوازدە، لە لاپەڕە ١٢٨ دەڵێت: (مامۆستای زانکۆ بە قوتابییەکانی وتبوو، بە عەبدوڵلا عبدالرحمن بڵێن ئەمساڵ لە وانەی مندا دەرناچێت). ئەمە جگە لەوەی ناوەکان دانەیەکیان بە ڕێنووسی کوردیی و دووەم بە عەرەبی نووسراوە، ناوی باوکی مامۆستا عەبدوڵلا هەڵەیە، هەندێ جار ناوی عەبدوولە، جارجاریش ناوی

عەبدولقادرە و لێرەش دەبێتە عەبدولڕەحمان! ئەمانە هەڵەی تایپیان تێپەڕاندووە، چونکە دوو سێ جۆری جیاوازن. خۆی حاجی عەول، کە کراوەتە باوکی ئەم مامۆستا عەبدوڵڵایە، هەر ناوی عەول بووە و عەبدول و عەبدولقادریش نەبووە، لە سلێمانییەوە ماڵی هێنایە سەیدسادق و تا کۆچی دوایی کرد بەجێی نەهێشت و تەنیا کچێکی هەبووە، تەنیا مەبەستم جیاوازیی ناوەکانی ناو خودی چیرۆکەکەیە لە هەر بەشێک و دەبێتە ناوێکی تر.

لە بەشی سیازدە، لە لاپەڕە ١٣٥ دەڵێت: (... پەڕینەوە بۆ گوندی حاجی نامیق ـ سەیدصادقی ئەولا ـ). ئەوەی پێی دەوترا سەیدسادقی ئەولا، یاخود سەیدسادقی کۆن، گوندی حاجی قادری مارفە، نەک گوندی حاجی نامیق، گوندی حاجی قادر لە ڕۆژهەڵاتی سەیدسادق و گوندی حاجی نامیق لە باکووری سەیدسادقە، هەرچەندە ئێستا هەردووکیان بوونەتە گەڕەکێکی ئەم شارە و تێکەڵاوی شار بوون، نووسەر بۆخۆی شارەزوورییە و جوانیش دەزانێت سەیدسادقی ئەولا ئاوایی حاجی قادرە نەک حاجی نامیق، حەتمەن ئەمەش تێکەڵکردن و لەبیرچوونەوەیە، نەک نەشارەزایی.

دووبارە دەستخۆشیی لە نووسەری بەڕێز د.یادگار شارەزووریی دەکەم بۆ نووسینی ئەم ڕۆمانە جوان و نایابە و زیندووکردنەوەی ناو و یادەوەرییەکانی شاری سەیدسادق، بەم دەقە بەرزەی ناو و باسوخواسی ئەم شارە بێنازەی ئێمەی زیندووهێشتووەتەوە.



ئامادەکردنی: عادل صدیق عەلی

# لە پاوەوە بۆ هەڵەبجە

## چیرۆکی ڕۆژانی کیمیابارانی هەڵەبجە لە زاری یەکێک لە شایەتحاڵەکانەوە



محەمەد ڕەشید ئەمینی پاوەیی، مەزاری شەهیدان، پشت گوندی عەنەب/ هەڵەبجە

ماموّستا محەمەد ڕەشید ئەمینی پاوەیی ناوێکی دیاری ناو دونیای ئەدەب و فەرهەنگی شاری پاوەی ڕۆژهەڵاتی کوردستانە، نزیکەی سێ ساڵێک بەر لە ئێستا وەک یەکێک لە ئامادەکارانی دیوانی تاهیربەگی جاف، کە (ڕێکخراوی دۆستانی هەڵەبجە) چاپی کرد و دواتر لە مەراسیمێکدا لەگەڵ کتێبی (ئەتڵەسی پارێزگای هەڵەبجە) لە هۆڵی مۆنۆمێنتی شەهیدانی هەڵەبجە ناساندنی بۆ کرا، لە نزیکەوە بە دیداری بەڕێزیان شادبووین، دوای مەراسیمەکە لە نزیکەوە بیروڕامان سەبارەت بە چالاکییە ئەدەبیی و فەرهەنگییەکانی هەردوو شاری هەڵەبجە و پاوە گۆڕییەوە، هەر لە میانی گفتوگۆکەدا بۆم ڕوونبوویەوە، کە بەڕێزیان لەو کەسانەن کە لە ڕۆژانی یەکەمەوە وەک شایەتحاڵ ئاگاداری کیمیابارانی هەڵەبجە بوون، بەتایبەت، کە خۆیان هاتوونەتە سنوورەکە و بەچاوی خۆیان بەشێک لە دیمەنە تراژیدییەکانی ئەو مەرگەساتەیان دیوە، هەر لەو دیدارەدا وەک ڕێکخراوی دۆستانی هەڵەبجە گفتی چاپکردنی (دیوانی وەلی دێوان)، کە بەڕێزیان ئامادەیان کردبوو پێدا، دواتر کە دیوانەکە چاپکرا، بەڕێزیانمان بانگهێشتکرد بۆ مەراسیمی ناساندنەکەی، ڕۆژێک دوای مەراسیمەکە (٢٠٢١/١١/٨) لە بەرزاییەکانی گوندی عەبابەیلێ چاوپێکەوتنێکی دورودرێژمان لەگەڵ ماموّستا سەبارەت ڕۆژانی کیمیابیباران و ئەو دیمەنانەی کە دیویانە ئەنجامدا، ئەمەی خوارەوە ناوەڕۆکی ئەو چاوپێکەوتنەیە.

**پرسیار: ئەکرێ خۆتان بناسێنن؟**

وەڵام: ناوم حەمەڕەشید ئەمینی کوڕی عەلی کوڕی ئەمین بەگ کوڕی قادربەگ کوڕی باسان بەگ کوڕی وەڵەدبەگ کوڕی مستەفا بەگ کوڕی مەحمود بەگ کوڕی خالید بەگ کوڕی ئەحمەد بەگی جاف کوڕی عەلی کوڕی ئێناخە. ساڵی ١٣٣٣شەمسی/١٩٤٥ لە گوندی (نۆریاو)ی نزیک شارستانی پاوە لەدایکبووم، واتە ئێستا (٦٧)ساڵ تەمەنمە. سەر بە تیرەی وەڵەدبەگی جافین. واتە لە بنەڕەتدا جافین، بەڵام لە پاوە ئەژین. ساڵی ١٣٦٠ شەمسی ئیزدواجم کردووە، یانی نزیکی(٤١) ساڵ لەمەوبەر. خێزانم ناوی (سیما)یە، سیما وەڵەدبەگی، ئەویش هەر لە تیرەی خۆمانە. سیمای کچی فەتاح کچی فەتحی کچی ناوەر بەگە، ئەوانیش دێنەوە سەر تیرەی خۆمان و لە ئەسڵا ئەچینەوە سەر تیرەی وەڵەد بەگی. سیما لە ژیاندا ماوە و چوار منداڵمان هەیە، یەک کچ و سێ کوڕ. کوڕە گەورەکەم ناوی ڕزگارە، کوڕی دووەمم ناوی عەمارە. کچەکەم ناوی بوشرایە، کوڕی ئاخیریشم، کە ئێستا لە ماڵە ناوی مانی ـ یە.

**پرسیار: ئێوە لە مەنتیقەی پاوە ژیاون، پاوەش نزیکە لە هەڵەبجەوە، لە ١٩٨٧/٥/١٣ لە هەڵەبجە و سیروان و خورماڵ خۆپیشاندان ڕوودەدا، ئێوە چۆن ئاگاداری ئەم ڕووداوانە بوون؟**

وەڵام: ئێمە ئاگاداربووین، تەقریبەن پاییز بوو هاوردنیان بۆ سەریاس، بەعزێکیان خێمەیان پێدان، بەعزێکیشیان خێمە نەبوو پێیانبەن، هەر ئەو شەوەی هاوردنیانە سەریاس فرەیان هاتن بۆ شاری پاوە. من شەوێک ڕۆیشتم بۆ ماڵی مامۆستا مەلا قادری قادری ئیمام جومعەی پاوە، نەختێ ئیشم هەبوو، پەیوەندیمان هەبوو بەیەکەوە. وەختێ ئەزانم دەری ماڵیان فرە قەرەباڵغە، هەموو ئەو مەردمانەی باران و قوڕ فشاری بۆیان هێنابوو پەنایان بۆ ئەو هاوردبوو، لە دەوری ماڵی مامۆستا کۆببوونەوە. منیش پرسیارمکرد وتم مامۆستا ئەمە چیە؟ وتی وەڵا کاک حەمەڕەشی ئەمانە لە سەریاس ئەمکاناتییەکەیان بۆ دروست نەکردوون، پەنایان هێناوە بۆ ئەم مەردمە، ئەم مەردمەش هەر خانەوادەیەک ماڵێک بباتە ماڵی خۆی هەتا بزانن وەزعیەت چۆن ئەبێت، منیش وتم عەلان ئەڕۆم خانەوادەیەک ئەبەم بۆ ماڵی خۆمان، وەختێ زانیم برادەرێکی فەقیر کزی کردووە لەگەڵ ژنەکەیدا و منداڵەکانی دانیشتوون، کابراکە فرە نارەحەت بوو، وتم کاکەگیان هەستە بچین بۆ

ماڵی خۆمان، وتی مامۆستا چۆن بڕۆین؟ وتم تۆ کارت نەبێت، ئەلعان ئەڕۆم بە مامۆستا ئێژم، کە ئەڕۆین بۆ ماڵی ئێمە.

ئەسڵەن من نەشم پرسی ناوت چیە، خەڵکی کوێیت، نەویم لێی و بردم، ئێمەش دوو دانە هۆدەمان هەبوو، هۆدەیەک لەمبەر و هۆدەیەک لەوبەر، هۆڵێکیشمان لەناوەڕاستدا هەبوو، ئیتر ئاشپەزخانە و دەستشۆریی و شتمان لە ماڵەوە بوو. بردم وتم کاکەگیان ئێوە لەم هۆدە گەورەیا بن و ئێمەش لەم هۆدە بچووکەدا زندەگی ئەکەین، هەر لەوێ قەسەمیشم لێ خوارد هەتا لێرەبی ناهێڵم سفرە لەم ماڵە داخەی، ئەبێ لەم ماڵە بەیەکەوە سفرە دابخەین، دوای ئەوە مودەتێ لەوێ بوو.

**پرسیار: پیاوەکە ناوی چی بوو؟**

وەڵام: دواتر لێم پرسی ناوت چیە؟ ناوی کاک نەجیم بۆینی بوو، دوو سێ ساڵ پێش ئێستا لەگەڵ مناڵەکانمدا هاتم بۆ ئێرە، کە منی بینی، وتی من لە ئاسماندا بەدواتاندا ئەگەڕام، ئەبێ بڕۆین بۆ لای ماڵی ئێمە، قەسەمی خوارد، وتی ناهێڵم، ئیتر هات بردینی بۆ لای ماڵی خۆیان، دوو ڕۆژ لە ماڵی خۆیان گیریداین، هەتا هەدیە و دیاری بۆ کوڕە بچوکەکەمان سەند. بە هەرحاڵ من واقعەن مەمنون بووم، کە ئەو شتەی لەبەرچاو بوو.

من هەتا بەهار نەمهێشت بڕۆن بۆ هیچ لایەک، بەهار وتی کاک حەمەڕەشی تەبیعەتمان لە خواردنەکان میقدارێ فەرقی هەیە، هەندێک شتمان هەیە حەز ئەکەین خۆمان دروستی بکەین، وتم خۆتان ئەزانن، هیچ موشکیلە نییە، بەڵام هەرچیتان پێویست بوو مەدوین بن ئەگەر بەسیما نەڵێن لە ماڵەوە. ئیتر لەوێ بوون هەتا پاییز، ساڵی دواتر باخێکیان گرت، دوای تەواوبوونی باخەکە و کاریان هاتنەوە بەم دیودا. ئەو پیاوە فرە ئینسانێکی بە محیبەت بوو، جارێ هەوای ئێمەی ئەکرد نەیئەتوانی لێرەوە بێ، چووە مەریوان، لە مەریوانەوە چووە سنە، لە سنە چووە کرماشان، دوای ئەوە هات بۆ پاوە بۆ ماڵی ئێمە، بەڵام من لەوکاتا لە ماڵ نەبووم، ئینسانێکی فرە مسوڵمانیش بوو، هاتبووە پشتی دەرگاکە تەقەی لێدابوو، کەیوانم هاتبووە دەر و سڵاوی لێ کردبوو، وتبووی: فەرموو وەرە ماڵەوە، ئەویش وتبووی: کاک حەمەڕەشی لە ماڵە؟ وتبووی: نەوەڵا وا لە ئیدارە، وتبووی: من فەقەت هاتووم سڵامی ئەم ماڵە بکەم و بگەڕێمەوە، یانی ئەو شتەی لە بەرچاو بوو...

**پرسیار: دوای ئەوە، ئێوە کەم و زۆر  پەیوەندیتان هەبوو بەو ئاوارانەی، کە لە سەریاس جێگیریان کردبوون؟**

وەڵام: بەڵێ، تەنانەت جەماعەتێکیان ئاشنابوون، شناسی خۆمان بوون، هەتا نزیکەی(١٣٠-١٤٠) کەس  فەقەد نۆریاوی لەم شارە لە کیمیاییبارانی شیمای هەڵەبجەدا مردوون، چون ئێمە خزمی زۆرمان لێرە هەیە، ئەو خزمانە یان لە خودی نۆریاوەوە هاتوون بۆ لای فامیلانی نزیکی خۆیان یان مەسەلەن دڵیان پێوە بووە چوونەتە ناو کەمپی سەریاس. هەتا دوو نەفەر لەو برادەرانەی، کە لە سەریاس بوون و دواتر هاتنە ناو شاری پاوە، شاعیر بوون، جا مەعزەرەتمە ئەمە لە جریانی هەڵەبجەدا بوو بەیەک ئاشنابووین، لەناو خەزانی هەڵەبجەدا شعریان وت. ئەوانیش کاک (سارال نزام و کاک ئیبراهیمی ڕنجدەر) بوون، ئەوانە شیعریان بۆ خەزانی هەڵەبجە وتووە.

**پرسیار: ساڵێک دوای ئەوە مەسەلەی کیمیاییبارانی هەڵەبجە دێتە پێش، تا چەند ئێوە ئاگاداری ئامادەکارییەکانی هێرشی سەر هەڵەبجە بوون؟**

وەڵام: بۆ هێرشەکە ئاگاداربووین، ئێمە لە پاوە بە قەولی مەعروف پێی ئێژین ئامادەکاری کامڵ، هەتا ئەوانەشی، کە نیزامی نەبوون بە عینوانی ئەوەی زۆربەیان ئەسڵەحەیان درابوویە، کە ئەبێت هۆشیاربن لە نوقتەی مەرز، بەوشێوە چەند ڕۆژێک لەوەوبەر لە خودی ناو شار ئاوا ئامادەگی کرا.

جەیشێکی زۆریش هاتبوو، دوو مانگ لەوەوبەر هەر بەردەوام جەیش بۆ مەنتیقەی مەرز ئەهات، ئەسڵەحە و جەیش و ئەوانە هەمووی ئەهات، ئیتر مشەخەس بوو، کە ئێران حەملەیەکی وا بەدەسۆ. من ئەو وەختە لە مەکتەبا بووم، لە مەدرەسە لە دائیرەی ئومورتەربییەی پێ ئێژن، من کتێبدار بووم، کتێبخانەیەکمان هەبوو، من بەرپرسی بووم، کاتێک حەملەکە کرا یەک دوو ڕۆژێک بە خاتر ئەوەی، کە نەبادا عێراق بۆمباران بکات و ئەمانە، کولەن ئیدارە و مەکتەبەکانیان تەحتیل کرد، ئەو ڕۆژە (٣/١٧) سەعات (٩:٠٠) بوو، وتیان هەڵەبجە بۆمبارانی کیمیاییباران کراوە.

پرسیار: ئەوکات ماڵتان لە نۆریاو بوو؟

وەڵام: ئێمە لە پاوە بووین، ئاشنایەکمان بەناوی عیزەتی وەڵەد بەگ لە ئیدارەی بەسیجی بوو، ئمومی بوو. هاتمەسەر لەوێ هەواڵێ بزانم، وتی فڵانەکەس ئێمە ئەچین بۆ ئەودیو بەدەمی خەڵکی لێقەوماوەوە، وتم دەی برای خاس بن منیش

بەرن لەگەڵ خۆتان، سەیارەیەکی تویتای پێ بوو، ئەوانەی لە جەنگا ئیتیسفادەی لێ ئەکەیت، پێی ئەڵێن میگزەمینی. شوێنی سایەقەکە و کەسێکی دیکەی هەیە لە پێشەوە و دواوەش بەتاڵە، یەک دوو نەفەرێ لە پێشەوە بوو، من وتم لە دواوە ئەبم، هەر هاتووم بۆئەوەی بزانم ئەم جریانە چییە.

سەعات نزیکی دوانزە چارەک کەم لەوێ دەرچووین، یانی هێشتا مابووی بۆ نیوەڕۆ، بۆ دوانزەی لای خۆمان، لای ئێمە دوانزە و نیو نیوەڕۆ ئەبێت، هێشتا مابووی بۆ بانگی نیوەڕۆ هەروا شتێکمان خوارد و دەرچووین، هاتین گەیشتینە نەوسوود، وەزعەکە فرە شلۆق بوو، لەملاوە ماشین ئەهات لەولاوە ماشین ئەهات، زۆرمان پێ چوو. لە ڕێگا ماشینمان ئەبینی پڕبوو لە مەردم و وەسایل و پڕ بوو لە جریانات، لەولاشەوە ئەکسەر ماشینەکان بە خاڵی ئەهاتن، ماشینی مەردم، هەتا گەڵابەی گەورە ئەهات، ئیتر نازانم بۆچی ئەهاتن. ئەکسەریان مەدەنی بوون، چون یەکسەر ئەو مەدەنیانە لەنێو شارا ئەیانگرتن بە سوغرە، ئەیانووت ئەبێ بڕۆن بۆ فڵان شوێن، ئیتر دەوڵەت کاری هەبوو، ئەبوو بهاتنایە، ئاوایی بوون، ئەکسەریەتیشیان لەوانە بوون.

لە نەوسوود تێپەڕین و گەیشتینە شۆشمێ، شۆشمێ مەرزە، ئیتر ئەودیوی تەوێڵە و ئەمدیوی شۆشمێ، لە مەرزی شۆشمێ ترازاین هاتینە خوار، لەوێ ماشین ئاوا کۆڕی کردبوو، ئەو جادەیە، کە ئێستا ئەچێ بۆ شۆشمێ، جادەیەکی باریک بوو، باوەڕکە لە بەعزێ شوێنا لەو شوێنەی، کە من شتەکەم دی، بەدار وەکو بێژی داریان نیاوە بەسەر یەکا ماشین تا ماشین ڕەتبێ، ماشینێکی گەڵابەی کۆمپرێسی (ئێمە پێی ئێژین کۆمپرێسی) لەسەرەوە ئەهاتوو و لەژێریشەوە خاوەرێک، زۆر درێژیش نەبوو، وەلێ  گەورە بوو، پڕبوو لە بریندارى کیمیایی هەڵەبجە.

گەڵابەکە گیرابوویە ماشێنە خاوەرەکە، کە پڕبوو لە مەردمی زەخمی هەڵەبجە، ئەم زۆری ئەکرد و ئەوانیش هاواریان ئەکرد، من هاتمە خوار، تەماشا ئەکەم ژێری ئەم ماشینە یەک زەڕەیتر فشار بێنێ بۆ ماشینەکەی تر ئەوا ئەکەوێتە خوار، ئیتر هەردوو چاوم پەڕییە تەوقەسەرم، نەویم لە ئەسڵەحەکەی ئەو برادەرەی لەگەڵمان بوو، دام لە میل، وتم ئەتکوژم قورمساخ، بە فارسی وتی: چیکار میکونی حاجی ئاغا؟ وتم بێرە خوار (بیاپاین)، هاتە خوار وتم: تەماشاکە تۆ بۆ زۆرەکەی لەو ماشینە؟ خوب چیکار کونام، مردم سود میزەنان سدا میکونان، بەرەو جلەو

بەرەو جلەو، وتم: بەرەو جلەو نیە، وتی: چیکارکونام؟ وتم برۆ سەر و تەکان مەخۆ، بەگیانی تۆ ئەوەی زەخمی بوو، ئەوەی نەیتوانی پیادەبێ دامبەزاند، وتم نەوەک بکەوێتە خوار. ئەوانم دابەزاند، هەتا دوانیان تیابوو بێحاڵ کەوتبوون، یانی لە حاڵەتی مەرگا بوون دەقیقەن، وتم ئەوانە بهێڵنەوە و ئەوانی تر بهێننە خوار، هاتنە خوار، وتم جا برۆ سەر کۆمپرێسەکەت، بیدە بان تا بترازێت لە خاوەرەکە، کۆمپرێسەکەی دایە بان تا ترازا، وەختێ ترازا وتم بە خاوەرەکە تۆ کەمێ برۆ بەر، هاتە بەر، تەقریبەن شوێنێکی پێچ و لێژ بوو، وتم برۆ سەری ئەو پێچە و بوەستە هەتا دوبارە مەردمەکە سوار ئەبێتەوە. بڕوابکە تا ئاخر سوارمکردن و ئەوان ڕەوانە بوون، ئەو وەختە ئێمە بەرەو تەوێڵە هاتینە خوارەوە.

ئەوەی ئێمە ئەمانبینی لەو ڕێگایە، نیوەی زەخمی بوو، نیوە هاواری ئەکرد، لەناو ماشینا کەوتبوون و شیمیایی لێی دابوون، باوەڕ بکە من خۆم گاهی گاهی غەیرەس گریان هیچم بەسەرەوە نەبوو، کە چاوم ئەکەوت بەو دیمەنانە. کابرا زەخمی، منداڵ هاواری ئەکرد، ژن هاواری ئەکرد و پیاو هیچی لەدەست نە ئەهات، هەموویان کەوتبوون. ئەو ماشینانەی لەژێرەوە ئەهاتن ئەکسەریەتی زەخمی هەڵەبجەیان پێ بوو، ئەوانەش لەسەرۆ (لە ئێرانەوە) ئەکسەریان یان وەسائیلیان ئەبرد بۆ جەبهە یان خۆراکیان ئەبرد، وەسائیلیان ئەبرد یا شتیان ئەبرد یا مەسەلەن لەولاوە بەعزێ ماشینی ئێرانی ئەهاتن هەقیقەتەن وەسایلیان پێ بوو، ئیتر ئەم وەسایلە هی یەکێکی تر بووە ختوویانەتە سەر ماشینەکە یان تالانیان کردووە من ناتوانم بڕیاری ئەوە بدەم، بەڵام پێیانبوو، واقعەن ئەو شتانەم ئەبینی، بەوحاڵەوە ئێمە خۆمان گەیاندە بیارە.

لە مەیانەکەی بیارە وتیان بە سایەقەکەمان ئەبێ بەم ماشینە ئەم وەسایلانە بارکەیت و بیبەی بۆ خەتی موقەدەم، ئەوان ئەیانوت خەتی موقەدەم، نەیان ئەزانی خەتی موقەدەم لەکوێیە، پرسیمان خەتی موقەدەم لەکوێیە؟ وتیان لە سیروانە، سیروان ئیتر خەتی موقەدەمە. منیش وتم عیزەت گیان بەخوا ناهێڵم تۆ بەتەنها بڕۆیت، وتی کاک حەمەڕەشی تازە زۆریان بۆ هێناوم ئەبێ بڕۆم، وتم نەوەڵا برا من ناهێڵم بەتەنها بڕۆی، منیش لەگەڵت دێم.

خێمەیەکیان دابوو بە مل وەسایلەیا، ئیتر من نەمزانی چیە، نەشم پرسی لەو کوڕە ئەمە چییە. فەقەت خەفەتی ئەو کوڕەم بوو لەگەڵیا هاتبووم، وتم خوانەخواستە

لەم مەنتقە شتێکی لێ نەقەومێ، ئیتر مستەقیم هاتینە خوار هەتا چووینە خورماڵ. ئەوەم بیرنەچێت لەوێ دوو کەلیمەیان نووسی، ئەیوەنە فلان شوێن و لەوێ تەحویلی فلان کەسی ئەکەن.

کە لە خورماڵ دەرچووین خەڵکی واینە نەبوو، فەقەت ئیتر مەعزەرەتم هەیە حەیوان و شت لە دەوروبەری ڕێگاکە مردار ببوویەوە، خاسەتەن لە سێ ڕیانەکەی زەڵما، کە ئەگەڕێیتەوە بۆ سیروان، ئیتر تا ئەوێ ڕۆین، لەوێوە گەڕاینۆ بۆ سیروان، ئەوەندە بەڵەو نەبووین لەم یالانەوە بڕۆین بۆ سیروان، لەوێوە بەڵەو بووین، من چون قەبلەن لە مەنتیقەی شارەزوورا بووم، ئەوڕێیەم ئەناسی، لەو ڕێگەی لە سێ ڕییانەکەی زەڵم لا دەدەیتەوە بۆ سیروان حەیوان و مانگا و گوێرەکە و پەز هەتا قاتر و ئەسپی زۆر کەوتبوون و مردارببوونەوە، وەسایلەکەمان گەیاندە سیروان، چونکە بۆ سیروانیان نوسیبوو، لە ڕێگا تەیارەمان ئەبینی، بەڵام پێشمەرگە و پاسدارمان نەدی، هەتا هاتینە سیروان.

لە سیروان وەسائیلەکەمان تەحویلی ئەو مەرکەزە داو ئیتر گەڕاینەوە، ئەوەشم عەرزکردن وەختێ گەڕاینەوە هەرچی دووکان بوو پڕابوو، گەیشتمە کتێبخانەیە، هەموو کتێبەکانی لەسەر جادەکە پڕابوو. گیانی منیش کتێبە، چوون لەوێ مەسئولی کتێبخانە بووم، وەختبوو شێتبم بۆ ئەو کتێبانە، نەشمەتوانی هەڵیانگرمەوە، چوون ماڵی مەردومە، فەقەت هاتم چاوم کەوت بە دیوانێکی مامۆستا گۆران بڵاوبوویەوە، هەڵمگرت، دوو بۆ سێ لاپەڕەی خراپ و هەڕگین ببوو، ئەوەیم لابرد و باقیم پێچاوە بە نایلۆنێک و هێنامە ناو ماشینەکە، وتم بەخوا من هەر ئەمە وەکو دیاری ئەبەمەوە.

لە سیروان هیچ تەرم و لاشەیەکمان نەدی، جا لەوێ هەڵگەڕاینەوە، وتم عیزەت گیان با لە هەڵەبجەوە بڕۆینەوە، چوون ئەو ئاشناو فامیلانەمان هان لەوێ، وتم شایەت کەسێکیان لێرە گرفتار بووبێ و ماشین و سەیارەیان نەبێ، هەرچۆنێک بێت بیانگەیەنینە دەوری تەوێڵە و بیارە. هاتین تەقریبەن گەیشتینە هەڵەبجە. لە ڕێگا بەعزێ حەیوان بە دەوروبەری جادەکە مردارببوونەوە، دیاربوو بە تۆپ و قومبەلە وایان لێهاتبوو، یانی ماعلووم بوو ئەوانە هینی شیمیای نین، بەڵام هەتا گەیشتینە هەڵەبجە یەک دانە جەنازەمان نەدی، لە هەڵەبجە لای فەحسی توتنەکەوە لاماندا، وتم برا لێرەوە بڕۆین ماڵی کاک حەسەن (ئێمە خۆمان پێمان ئەوت حەسەنە سوور، فامیلمان بوو، نۆریاوی بوو)، ها لەم خوارەوە، با بڕۆین

سەرێکیان بدەین، بزانم هیچ  کامیان ماون.

خولاسە گەیینە ئەو شوێنە و ماڵەکە بەڵەوبووم، وەلێ من قەدیم تەماشام ئەکرد، ئەمزانی دەقیق دەرگاکەی ئەوانە، بەڵام گۆڕیبوویان، لەڕووی قەدیمی نەما بوو، میقدارێ تازەیان کردبوویەوە، کە گەیشتینە ئەوێ، دەرگا باز بوو، تەماشا ئەکەم کەس لە ماڵا نییە، بەڵام گشت دەرگاکانی ژوورەوەیان داخرابوو، وەختێ تەماشای ژێرزەمینەکەیانم کرد، ئێمە پێی ئێژین ژێرزەمینی وەختێ، خۆیی و تەواوی مناڵەکانی کیمیایی لێیدابوون و مردبوون، ئیتر ئێمە نەچوینە خوارۆ، چونکە وتیان شیمیاییە نابێت کەس دەستیان لێبدات.

پیاوەکە ناوی کاک حەسەن و ژنەکەشی ناوی ئەمنە بوو، بەڵام ناوی مناڵەکانیم ئێستا بیر نەماوە، دواتر گێڕایانەوە بەر لە کیمیاییبارانی هەڵەبجە کوڕێکیان لە بەسرە عەسکەر بووە بە ئیجازە هاتۆتەوە، خوشکێکی لە سلێمانی بووە، لە سلێمانی بە خوشکەکەی وتووە با بڕۆینۆ بۆ هەڵەبجە بۆ ماڵ باوکم، دواتر گەڕامەوە بۆ واجب ئێوەش لەگەڵ خۆم ئەهێنمەوە، خوشکەکەشی کچێکی ئەبێت، خوشکەکەی و کچەکەی ئەهێنێتەوە بۆ هەڵەبجە، هەتا وتیان ١٨ نەفەر بوون هەر ١٨یان مردوون لەو ژێرخانەدا، دواتر هاتوون جەنازەکانیان بردوون و  ئەسپەردەیان کردوون.

وەک پێشتر گووتم، کەسمان دەستمان نەدا لە لاشەی مردووەکان، ئێمە لەبەر خاتری ئەوە نەچووینە خوارۆ، وەلێ من سورەتی کاک حەسەن و دادە ئەمنەم ناسییەوە، چوون قەبلەن من ئیرتباتم هەبوو لەگەڵیانا و ئەمناسین، ئیتر زانیم ئەوە خۆیان و مناڵەکانیانن مردوون.

دوای ئەوە ئێمە هاتینەوە سەر جادەکە، لەوێوە ڕۆیشتین بۆ سەرۆ بۆ چوارڕیانی بازاڕ، لەوێوە گەڕاینەوە بەرەو کانییەقوڵکە، وەختێ تەماشای بازاڕمان کرد گشت دوکانەکان پشیابوونە سەر جادەکە، ئیتر ئایا ئەمە بە ئەنقەست وایان لێکرا بوو یان بۆمبارانەکە بوو نازانم، وەلێ لە بۆمباران نەئەچوو وەکو ئەوە وابوو کابرایەک گەڕابێ و بزانێ شتی باش هەیە لەناو ئەم دوکانانا و بیبات و باریکا، من ناتوانم ئەو ڕەئییە بدەم، بەڵام هەموو بازاڕەکە پشیابووە سەر جادەکە، لە کەناری جادەکانیش جەنازە کەوتبوون.

لەمبەراوبەرۆ جەنازەی زۆرمان لە نزیک مزگەوتی دارولئیحسان بینی، ئا لەو شوێنا سێ بۆ چوار دانە سەیارە وەستا بوو خەڵکەکانی ناویان گشتیان



مردبوون. موتەئسیفانە ئەو وەختە من دوربین و شتم پێنە بوو، ئەگەر دوربینم پێبوایە، باوەڕکە ئەو سەحنانەی ئێمە دیومانە لە هیچ عەکسێک و هیچ وێنەیەکدا تا ئێستاش من بەرچاوم نەکەوتووە، مەخسوسەن مردووەکانی دەوروبەری عەنەب.

کە گەیشتینە کانیەقوڵکە پیاو و ژنێکی پیر لەسەرۆ هاتن، پیاوەکە گاڵۆکێکی بەدەسۆ بوو، دەستی کردبوو بەژێر قۆڵی ژنەکەیا ئەیهاورد، کە چاویان بە ئێمە کەوت، وتیان کورە بیکەن لەڕێی خوا ئێمەش بەرن لەگەڵ خۆتان، وتم عێزەت گیان بێسە، وێساو ئەوانیش هاتن، ژنەکە نەیئەتوانی بچێتە سەر ماشینەکە لە دواوە، من ڕۆیم دەستم کرد بەژێر باڵیا، دەستم بەر پشتی دەستی ئەو کەوت، دەستم تەڕ بوو، دەستی تلۆقەی کردبوو، تلۆقەیەکی تەقی بەدەستما، بەڵام من گوێم پێنەدا، وتم خوا کەریمە، ئیتر خستمە سەر، کەمێکی تر ڕۆیشتینە ئەولاوە دوو سێ نەفەری ترمان بینی ئەوانیشمان سوار کرد.

ئەمەی ئەیلێم لە ئاخیری کانییە قوڵکە بوو، بەعزێ ساختمانی بێژی سازمانی تیا بوو، زەمانی خۆی بۆ پێشمەرگە کردبوویان، لە کانییەقوڵکە ئەترازێی بۆ ئەوبەر، بەری زەوی خێڵی حاجی ناجی و ئەوان، کارێزی حاجی ناجی ئەو وەختە بە ئاوی ئەوێ ئەیان گێڕا، ئەوەم بینی بوو لە هەڵەبجەیا. ئەوکاتەی من لە هەڵەبجە بووم ئەوە ئاخری هەڵەبجە بوو. لەوێ ترازاین بەسەر ڕێگاکە و ئەملاو ئەولای ڕێگاکە جەنازە کەوتبوو، وەلێ پێش ئەوەی بگەیتە عەنەب لە نزیکی جیەڵە(جەلیلە) ئەڕۆیتە خوار منالێکی ساوام بینی لەویا گیانم دەرچوو، باوەڕبکە بەگیانی کاک عادل وامەزانی زیندووە! لەویا بەجێیان هێشتبوو، ئەوانم لە بەرۆ سوارکرد و خۆم هاتم لە پشتۆ سوار بووم، هەر بۆئەوەی بزانم جریان چیە، دام لە ماشینەکە وتم بێسە، وتی چیە؟ وتم بێسە، وتم نەوا ئەو منالە زیندووبێ، وەختێ ڕۆیشتم تەماشا ئەکەم مردووە و هەروا جێیانهێشتووە. نازانم ئەو مندالە کوڕ بوو یان کچ، وەلێ تەمەنی نەگەیی بووە سالێ، لەناو قۆناغا بوو، ئێمە پێی ئێژین قۆناغە، لە قۆناغا بەجێیانهێڵا بوو.

پاشان لەوێ دەرچووین و ڕۆیشتین هەتا گەیینە دوو ڕییانەکەی عەنەب، باوەڕبکە لە دوو ڕییانەکەی عەنەبا شتانێکم دیوە یاخوا هیچ بەنە و مسوڵمانێک نەیبینێ، ماشین ئەونە عەجەلەی بوو دابووی بەسەر جەنازەکانا، ئەوەنە جەنازە لەسەر جادەکە زۆر بوو ئەونە زۆر بوو کابرا فشاری بۆ هاتبوو ڕەت ببوو بەسەریانا، وتم عیزەت گیان تۆ لە خوارۆ مەڕۆ، چوون جەنازە زۆر زۆر بوو،

لەناو ئەو باخانە هەتا ئەڕۆیشتیتە نزیکی بیاوێڵە، وتم عیزەت تۆ لێرەوە مەڕۆ، بڕۆ لە گوندی عەنەبەوە بگەڕێوە سەری جادەکە. من دەستمکرد بە جەنازە لادان لەسەر جادەکە، میقدارێ جەنازەم لادا، تەماشا ئەکەم چاریان ناکەم، چوون خۆم بەتەنیا نەمەتوانی. لەوکاتا کەسیش لەوێ نەبوو، نەفەرێ ئەگریا وەک بڵێی بەدوای کەسوکاری خۆیا ئەگەڕێ، منیش ئەوەنە نەبوون بێژم خاڵۆگیان بەشوێنی چیا ئەگەڕێی، ئەگریا و نارەحەت بوو بە دوای جەنازەیا ئەملاو ئەولا ئەگەڕا، مەعلوم بوو بەشوێن کەسوکاری خۆیا ئەگەڕا، لەوە تێپەڕین لەژێری باخەکانی گوندی عەنەبا سێ دانە ماشین، کە یەکێکیان جێبێک بوو، چادری بەسەرەوە بوو، دەوری ٢٠ نەفەری تیا بوو، هەر هەموویان لەناویاندا مردبوون.

لە نزیک گوندی عەنەب جۆگە ئاوێک لابەلا ئەڕۆییە ناو باخێک، باخەکە هەنار و گوێز و تووی تیابوو، مەردم وتبوویان یەکێک ئاو بدا لە دەم و چاوی کیمیایی تەئسیری لێ ناکا، بۆیە جەماعەتێک دەموچاویان نابووە ناو ئاوەکەوە هەتا مردبوون. مردنی ئەوانە هێشتا زۆر تولی نەکێشا بوو، بەعزێکیان کەف لە دەم و لێویانەوە هاتبووە دەر، بەعزێکیان میقدارێ شین ببوونەوە، ئەو حاڵەتە بە ڕوومەتیانەوە دیار بوو.

من چوومە ناو عەنەب و سەرێکم کێشا ناوی مزگەوتەکە، وەختێ زانیم چوار پێنچ نەفەر لەناو مزگەوتەکە کەوتوون، دواتر کە من ڕۆیمەوە بۆ پاوە دوو دانە نەقاشیم کێشا، یەکێکیان نەقاشی خواری باخەکە و ئەوی تریان هی مزگەوتەکە، هەڵبەتە من نەقاش نیم، بەڵام لە بەرچاوما بوون بە خەیاڵ ئەم کێشا. دەحفەیەکیان کاک هادی زیائەدینی، کە یەکێکە لە گەورەترین نەقاشەکانی سنە، هات بۆ ماڵمان و تەماشای نەقاشییەکانی کرد، وتی ئەمانە کێ کێشاونی؟ وتم خۆم کێشاومە، وتم جارجار هەروا شتێ ئەکێشم، ئەمەش هی جریانی هەڵەبجەیە، وێنەگرم پێ نەبووە، بەڵام چاوم بە شتەکە کەوتووە، ئیتر هەروا کێشاومە، وتی وەڵا جوانە دەستخۆشبێ، هەتا لەسەر پارچەش کێشاومە...

بەهەرحاڵ هاتمەوە عیزەتم بینی، بەسەر ئەو جەنازانە بەرەو بیاویلە، ڕۆیشتین هەتا چووینە سەر حەوزێک لەولای باخەکانەوە، لە پشت حەوزەکەوە جادەیەک ئەهاتۆ سەر جادە سەرەکییەکە بۆ تەوێڵە، ئێمە هەتا حەوزەکەی ئەملای بیاوێڵە جەنازەیەکی زۆرمان بینی، وەلێ لە حەوزەکە ترازاین ئیتر هیچ جەنازەمان نەدی.

لەکاتی تێپەڕین بەناو ئەو جەنازانەدا فرە گەڕام و خولامەوە بەناویاندا، ئەموت نەوەک کەسێکیان زیندوو بێت، وەلێ یەک نەفەریان زیندوو نەمابوون، باوەڕبکە من ئێژم حەدی ئەقەل هەزار جەنازە لە دەوروبەری عەنەبا بووگە، بەتەنها لەناو باخەکانی عەنەبا ( ٢٠٠-٣٠٠) نەفەر کەوتبوون. لەوبەری جادەی باخانەوە دەشتێ بوو تەماشام کرد جێگا بۆمبەکان دیار بوو، مادەی جەرمگ و ماددەی سپی هەر مابوو، ئێمەش هەستمان بە بۆن ئەکرد، وەلێ ئەیانگووت ئەم بۆنە ئێران دواتر هاتووە وەشاندوویەتی. من نازانم ئەو بۆنە ئەوە بوو یان نا، هەقیقەتەن من تەخشیسی ئەوەم نەبوو بزانم.

بەهەرحاڵ دوایی من لێم قەوما، تا ئێستاش مەسائیلی کیمیایی لەناو جسما هەیە، ئەلعان ئەو تەنگە نەفەسییەی هەمە هی جریاناتی مەسائیلی کیمیاییە، چوون ئەو ڕۆژە، کە هاتمە ئێرە نە ماسکێکمان پێ بوو نە هیچ، ئەوانەشی، کە ئێمەیان ئەنارد بۆ ئەوێ نەیان ئەگووت خۆپارێزی بکەن با شتێکتان لێ نەقەومێت.

جا ئێمە لەوێ ترازاین هێشتا نەگەینە خارگێڵان هەوا پەیما هات، دای بەسەر ئێما و ڕۆیی بیارەی بۆمباران کرد، کە چووینە بیارە وتیان ئەلعانە بیارە و نەوسوودیشی بۆمباران کردووە، خەڵکێکی فرەش بریندار بوون، هەر لەو حاڵەتا زۆر برینداری هەڵەبجە دووبارە بریندار بونۆ، ئیتر ئێمە بەهەر نەوعێک بێت گەڕاینۆ. یانی هەتا ئەوکاتە تەیارە مرەتەب ئەهات، جارجار، کە ئەهاتن سەوتیان ئەشکان تا ئەوێ ئێران هاتبوو ئەیان کوتا، جارجار هەلی کۆپتەری ئێرانیش ئەهات، مەسەلەن موشەکی خستبێت لەمسەری شارەزوور بۆ سەیدسادق و بۆ دەوروبەری هەڵەبجەی تازەی ئێستا، ئەکسەر جەنگەکە ببوو بە جەنگی هەوایی لەو حاڵەتە.

ئیتر ئێمە، کە گەڕاینۆ جگە لە خۆمان ئەو ژن و پیاوەی، کە هەڵمان گرتن وەک پێشتر باسم کرد، یەک دوو نەفەرێترمان سوارکرد بوو، دوانیان ساغ بوون و دانەیەکیشیان لێی قەوما بوو، ئەما فرە ناڕەحەت نەبوو، بردنمانن هەتا سەر پردەکەی تەوێڵە، لەسەری پردەکەی تەوێڵە ئەبوو عیزەت لایدایە مەرکەزەکە و بیوتایە من شتەکانم بردووە، ئەمەش ڕەسیدی کابرا و ئیتر نەجاتی بێ و بەریدەن بێتۆ، ئێمەش لە سەر حەوزەکەی خانەقا دانیشتین و نەختێ دەموچاومان شۆرد و خۆمان تەمیز کرد و تەپوتۆز و دەموچاومان شۆرد، برادەرێک لەوانەی ئێمەیان هێنا وتی بێن چایەک بخۆن، ئێمەش چایەکمان خوارد، ئیتر وتم عیزەگیان تۆ تێیتۆ

یا من بڕۆمۆ؟ چوون من ناتوانم لێرا دانیشم، وتی منیش تێمۆ، تاقەتی ئەمانەم نییە هەر ڕۆژەی بمانێرن بۆ شوێنێک.

خولاسە، هەموو ئەم هاتن و چوونەی ئێمە ئەمکانی هەیە بێژم سەعاتی دەوری یەک و نیو دوو بۆ سەعاتی پێنچ بوو، چوون ئێمە گەینۆ ئەوێ کەمێ خۆرئاوا ببوو، ئەوکاتیش ڕۆژگار درێژ بوو، ڕاستی سەیری سەعاتمان نەکرد.

**پرسیار: لە ڕێگا کە گەڕانەوە، ئێوە خەڵکی مەدەنی و سەیارەی مەدەنیتان ئەبینی بەرەو ئێران بڕوات؟**

وەڵام: بەڵێ خەڵکێکی زۆر زۆرمان ئەبینی، عەرزم کردی هەتا کە گەینە بیارە، من پێشتر تەعریفی کتێبخانەی بیارەم بیستبوو، ڕۆیمە ئەوێ، وەختێ تەماشا ئەکەم هاتوون ئەوەی کتێبی دەردبخۆر بووە جەمیان کردووە و بردوویانە، ئیتر شتێکی دەردنەخۆر مابوو، هەتا وتیان کابرایەک هاتووە سەیارەی پڕکردووە لە کتێبی دەستنووس و بردوویەتی.

**پرسیار: سوپای پاسداران بووە یا خەڵکی مەدەنی؟**

وەڵام: وتیان خەڵکی مەدەنی بووە.

**پرسیار: خەڵکی مەدەنی ناتوانێ ئەو ئیشە بکات؟**

وەڵام: بەخوا ئیتر خەڵکی مەدەنی وابەستە نەبووبێ ڕاستە، بەڵام ئیتر هەرکەس بووە ئەو شتانەی بردووە.

وەلحاسڵ ئێمە کە گەڕاینەوە تەوێڵە، دەوروبەری سەعاتێکیش لە تەوێڵە دانیشتین، ئیتر کەوتینۆ ڕێ بۆ پاوە، لە ڕێگا لەو لێقەوماوانە دەوری (١٠-١٢) نەفەرێکمان سوارکرد، تەقریبەن بانگی مەغریب گەینۆ پاوە. کە گەینۆ پاوە ئەو برادەرانەی لەگەڵمان بوون حەقیقەتەن نەمانوێرا بیانبەینۆ ماڵۆ بەعزێکیان بەرکەوتەی کیمیایی بوون و بەعزێکیان بریندار بوون، بردماننە دەری بیمارستان، لە دەری بیمارستانا ئەوانمان پیادە کرد و خۆمان گەڕاینۆ ناو شار.

**پرسیار: ئێوە لە حەفتاکاناندا لەبەر عەسکەری لە ئێران فیرارتان کردووە و هاتوون بۆ هەڵەبجە، ئەوە چۆن بوو؟**

وەڵام: ئاگاداریم لە مەسائیلی هەڵەبجە هەبوو، ئەمزانی ماڵی فڵانەکەس هالەکوێ و ماڵی فڵانەکەس هالەکوێ، زەمانی خۆی دەورەی شا بوو لای خۆمان، ساڵی

(١٣٥٠-١٣٥١-شەمسی) بوو، بۆئەوەی عەسکەری نەکەم بۆ ئێران هاتم بۆ عێراق. بە نهێنی لەگەڵ دوو نەفەری ترا هاتینە شێخان، لە شێخانەوە پێی ئێژن گاکوژە، لە گاکوژەوە هاتینە گوندی هاوار، من ئەوکاتە نابەڵەوبووم، ئێمە قاچاخ فرۆشمان هەبوو، ئەهاتن لێرە وەسائیلیان ئەسەند و بە قاچاخی ئەیان بردۆ بۆ ئەودیوو، قاتریشیان پێبوو، من لەگەڵ ئەوان هاتمە هاوار و لەوێوە هاتینە تاوێرە، وەلێ ئەوان فیرار نەبوون، تەنها بۆ وەسائیل ئەهاتن بیکڕن و بیبەنەوە. منیش هەرکە مەوالیدم شمولی عەسکەری کرد ڕامکرد، وتم بۆچی دوو ساڵ عەسکەری بکەم؟ برایەکیشم لە هەڵەبجە بوو، ناوی عێزەت بوو، ئیشی نانەوایی ئەکرد، مودەتێ دوای نانەواییەکە ئەسپ و عەرەبانەی کڕیی و کاسپی ناو بازاڕی ئەکرد. لێرە مندالی بوو.. ئەو تەقریبەن (٢٠-٣٠) ساڵ لەوەوبەر هاتبوو، برا گەورەم بوو، ئاخر باوکم سێ ژنی هێناوە، ئەو هی ژنی یەکەمی بوو، لە من گەورەتر بوو، تەقریبەن ٣٠ ساڵ نێوانمان بوو.

ئەوکاتەی من هاتم، ئەوان ماڵیان لە پشت کانییە قوڵکە بوو، هاتمە عەنەب ئاشنامان لەوێ هەبوو و ئەمناسین، چوون نۆریاوی بوون. هەواڵی ماڵی کاکەم پرسی، یەکێکیان کەسێکی لەگەڵا ناردم وتیان برۆ لەگەڵ ئەم کوڕە، چوون بیانزانیایە ئێرانیم، ئەیانگرتم، وتی هەتا ئەیگەیەنیتە ماڵی عێزەت لە شوێنی کەنارەوە ببە، ئیتر لە جەلیلەوە بردمی بەناو ئەو دەشتا، هاوردمیە لای کارێزی حاجی ناجی، لەوێشەوە گەییینە لای ماڵی کاکە عێزەت. هەتا من بازێ وەسائیلی سەوقاتیشم سەند بوو، کە لە پاوە دەرچووبووم میقدارێ وەسائیلم سەندبوو، شیرینی و شت بۆ ماڵی کاکەم. ئیتر ڕۆیینە ئەوێ، مودەتێک لەلای کاکە عێزەت بووم، کاکە عێزەت بە ئەسپ و عەرەبانە کاری ئەکرد، وتم بۆچی ببمە بار بە ملی کاکەمەوە، منیشم ئینسانێکم و ئەتوانم کار بکەم، مودەتێ کارم کرد هەتا کاریگەریم کردووە، ڕۆیم کاری وەستایی و ئەمانەم ئەکرد، میقدارێ پوڵم جەمکرد و ئەسپ و عەرەبانەم پێ کڕی، ئیتر خۆم دەستمکرد بە کاسپیکردن، تەقریبەن نزیکەی ٣ ساڵ لێرە بووم. بە هاوین بەناو بازاڕا ئەگەڕام، مەسەلەن کابرا بارێکی پێ بوو لە سەرا ئەمبرد بۆ قسمەتی خوارەوە، لە کانییە قوڵکەوە ئەمبرد مەسەلەن بۆ گەڕەکی ئەوبەر، ئەو وەختەش وەک ئێستە سەیارە نەبوو. نەوت فرۆشیشم ئەکرد، نەوت فرۆشییەکە لە زستانا بوو. ئەوکاتە نەوت میقدارێ کەم ببۆوە، زستانان ئەکسەر ئێمە نەوتمان بار ئەکرد لە دێهاتەکان و ناو شارا ئەمانگێڕا و ئەمانفرۆشت، بەڵام هاوین وەک

باسم کرد زیاتر کاری باربەری بوو، یان مەسەلەن کابرا ئەیوت برا (٥-٦) ژنگە گەنمم لە شارەزوور هەیە، بێنییە فلان شوێن، یان چەن فەردە توتنم هەیە بیبە بۆ فەحسی توتنەکە بۆم.

ئیتر ئەو ماوە ئەو کارانەمان ئەکرد، من سێ ساڵ لە هەڵەبجە بووم، ئەوکاتە هەڵەبجە لەگەڵ بامۆکا جیابوو لە دەستەی ئەوبەرۆ ئەسڵەن دەست نەگەییە ئەو دێهاتە، دێهاتێ بوو لەوبەرۆ باوەکۆچەک، ئیتر ئاوابوو تا ئەوێ بوو. لەمسەرۆ کانییە قوڵکە، ئاخیری کانییە قوڵکە ئاخیری هەڵەبجە بوو، هەر خودی کانییە قوڵکە ئەونەی ئاوبوو مەردم ئەچوون لەویا ئیشوکاری خۆیان ئەکرد، هەرخۆم ژنم چاوپێکەوتووە لیباس و شتیان لەوێ شۆردووە. (٢-٣) ساڵ پێش ئێستا هاتم بۆیرا، پرسیم کانیە قوڵکە کوا؟ وتیان کانیە قوڵکەی چی، وشکی کردووە. وەلحاسڵ ئەو ماوەی کارم کرد بە نەزەرم نزیکەی (١٠-١٢) هەزار پارەم جەم کرد، بۆ ئەو وەختە پارەیەکی باش بوو، دواتر ئەسپ و عەرەبانەکەشم فرۆشت.

لەو بەینا باوکم دوو دەعفە پیاوی هەناردە شوێنما، دەفعەیەک پیاوێکی نارد وتی بێژە بیکە لەڕێی خوا بێتۆ، چوون من فرە عەزێتەکەن، ئەمبەن بۆ بەحسی سەربازی، بێژە پێی بگەڕێتۆ، منیش نەختێ باوکم خۆش گەرەک بوو، پێشتر عەرزم کردی هەر بە منالی دایکم مردبوو، باوەژنم هەبوو، نەختێ لەگەڵ باوەژنەکەما زیاتر دەرگیر بووم. ئیتر جریانی سەربازی هاتۆ بەرۆ و فیرارم کرد و هاتمە ئێرە. بەڵام باوکم میقدارێ لەگەڵمدا باش بوو، حەزم نەکرد عەزێتی بدەن، هەر لەبەرئەوەش بوو گەڕامەوە. وەختێ گەینە ئەوێ دێهاتێ بوو لەولای شێخان، (هێرووێ)یان پێ ئەوت، فامیلانمان بوو لەوێ، ئێوارە گەیمە ئەوێ ڕۆیمە ماڵی ئەو پورزایەم، دانیشتین، دەستیانکرد بە شۆخی کردن لەگەڵما و منیش بەحسی ئەو جریاناتەم بۆ کردن و ئەمانە، پورزاکەم کاک ئەحمەدی ناو بوو، مەسئولی شورای گوند میچە بوو، وتی باش نییە ئاواینە بگەڕێیتۆ بۆ پاوە، گیانی کاکە هەم خاڵۆم عەزێتەکەن هەم تۆ، وتم ئەی چی بکەم؟ وتی بڕۆ لەم پاسگایە خۆت موعەرەفیکە، ئەو نێرنۆ مەرزەبانی، با مەرزەبانی بە نامە بونێرێتەوە بۆ پاوە، چوون وا باشترە، وتم قەیچیکا تۆ باشتر ئەزانیت.

بەیانی ڕۆین بۆ پاسگاکە، وتی پارەی عێراقیت پێ نییە؟ وتم میقدارێکم پێیە، وتی دەبیدە بە من، چوون ئیمکانی هەیە بتپشکنن و پارە عێراقییەکە هەمووی زەبت بکەن. وتم ئاخر من هیچ پارەی ئێرانیم پێ نیە، وتی قەینا من پارەت ئەدەمێ

بۆ خەرجی پێت بێ، دواتر خۆم پارەکە لە خالۆم ئەسەنمۆ، ئیتر پارەکەم پێدا و ئەویش (٣٠٠) تمەتی ئەو وەختەی پێدام.

دروست پارە عێراقییەکەم بیرم نەماوە چەند بووە، وەلێ زۆر زۆر بوو، دیناری ئەو وەختە فرە بە ئەرزش بوو. ئەو پارەیەی بردبوو دابویە دەستی باوکم و منیشی حەواڵەی مەرزەبانی کرد، لە مەرزەبانی پەروەندەیەکیان بۆ دروست کردم و هەناردمیانەوە بۆ ساواک لە پاوە، لە ساواک منیان نزیکەی (٤٥) ڕۆژ گیردا، هەموو ڕۆژێ ئەهاتن سوال و جوابیان ئەکرد، بۆچی ڕۆیشتی بۆ عێراق؟ من نەمووت بۆئەوەی سەربازی نەکەم ڕۆیشتووم، وتم ئیختلاف و موشکیلاتی خانەوادەگیمان هەبووە.

بەهەرحاڵ مودەیەک وام لەوێ، دەی لەکوێ بووی؟ وتم لە هەڵەبجە بووم، لە عەنەب بووم، لە دەرەشیش بووم، هەتا وتم ئێوە پیاوتان هەیە ئەتوانن بینێرن لای فڵان و لای فڵان و فرەم ئەناسی لە هەڵەبجە و لای عەنەب پرسیار لەوانە بکەن بزانن من چکارە بووم. پرسیار کردنەکەیان زیاتر لەبەرئەوەبوو چەند ساڵ لەمەوبەر لە نۆریاو جەماعەتێکی بەرخیلافی شایان گرت و عیدامیان کردن، هەر لەو ئاواگی ئێما (نۆریاو) سێ نەفەر عیدام کرا، بەعزێکیش ڕایان کرد و هاتن بەم دیوا، وایان ئەزانی منیش لەوانم، وتم کاکە ئەسپ و عەرەبانەم بووە، لە فڵانە شوێن کارم کردووە، بڕۆن پرس و جۆ بکەن. دوای ئەو ٤٥ ڕۆژە وتیان کێشە نییە بەرت ئەدەین، بەڵام ئەبێ یەکێ بێ بە زەمان(کەفیل)، وتم دەیخۆ من ناتوانم بڕۆمە دەر و کەفیل بێنم، ئێوەش نابنە کەفیلم، من چی بکەم؟ تەقریبەن دوو ڕۆژی پێچوو کوڕێکی برام و مامۆزایەکما هاتن بۆ لام.

براکەم ناوی ڕەحیم و مامۆزاکەشم ناوی ئەمین بوو، وتم ڕەحیم گیان وتم بڕۆ بۆ لای دەروێش سدیقی لوتفی، کە قاوەخانەی هەبوو لە نزیکی ساواک، فرمانداری ئێستا بوو، وتم بێژە پێی من کوڕی فڵانە کەسم برایەکمیان گرتووە وا لە ساواک، کەفیلیان گەرەکە، پیاوەتی بکە بەشکم ببیتە کەفیلمان، لەوێ هیچ ئاشنایەکم نەبوو، هەر ئەوم ئەناسی، پێشتر جارجار ئێمە ئەهاتین بۆ قاوەخانەکەی.

ڕەحیم ڕۆیی بۆ لای دەروێش، وتبووی کوڕی سەی عەلیم، جا بابەم بەناوی سەی عەلی مەشهور بوو. وتبووی برایەکم لە عێراقەوە هاتووەتۆ لە ساواک گیراوە، ئێستا کەفیلیان گەرەکە، ئەویش وتبووی جا قەیچێکا، بانچاو، بانگی

کوڕەکەی کردبوو، وتبووی لە قاوەخانەکەبە تا من ئەڕۆمە ساواک و دێمەوە، ئەوەنەی پێنەچوو دەروێش سدیق هات و ڕۆییە لای کابرای دەفتەردار، من لە پاڵ دەفتەردارەکە دانیشتبووم، گوێم لێ بوو وتی دەی باشە تۆ ئەمە ئەناسی؟ ئەبیتە کەفیلی؟ وتی خۆی و باب و باپیریشی ئەناسم، وتی هیچ مشکیلەیەک نیە من ئەبمە کەفیلی، ئەگەر شتێ بوو من حازرم بۆ هەر شتێک، ئێستاش قسەی ئەو پیاوەم هەر لە بەرچاوە. ئیسەیشە ئیحترامی ئەو خانەوادەیە ئەگرم بە خاتری ئەو کارە.

دوای ئەوە ئێمەیان بەردا، ئەو وەختەش نیوەڕۆ بوو، وتم بە کوڕەکەی برام با بڕۆینە نۆریاو نانێک بخۆین، ئەو وەختە نۆریاو دووربوو، ماشین و شتی کەم بوو، وەختێکم زانی ئەوان نواڕییان بەیەکا، تومەز ئەوان هیچ پارەیان پێ نیە، وتم برا خەفەت مەخۆن من پارەی ئەوەم پێیە دوو دەست ئاو گۆشت بخۆین، هاتین بۆ دوکانی دەروێش سدیق، وتم کاک سدیق گیان عەزیەت نەوێ سێ دانە ئاو گۆشتمان بۆ بێنە، ئەویش هاوردی و دانیشتین و خواردمان، ئەو وەختە ئاو گۆشت دانەی بە ١٥ قڕان بوو، منیش (٥) تمەنێکم داپێی و باقی دامۆ، دواتر چایمان خوارد و کەوتینەڕێ.

جا من (٢-٣) ساڵ لە هەڵەبجە بووم، بە ڕێگا بەعزێ قسەم ئەکرد، دەڵێت و دەڵێم و لەکوێن و باوکم چۆنە و مناڵەکان چۆنن، ئەوانیش ئەیانڕوانی وەیەکا و ئەکەنین، ئەیانووت براگیان ئەوە تۆ چی ئێژی؟ وتم کاکە گیان چیم وتووە؟ تومەز لەهجەکەم گۆڕا بوو.

**پرسیار: دوایی ئەوە؟**

وەڵام: دوای ئەوە ئێمە لەوێ ئەنجومەن (ئەنجومەنی ئەدەبی)مان هەبوو، ئەم ئەنجومەنە ئەکسەری ڕۆژەکان ئەگەڕاین، ئەهاتین بەدەمی زەخمییەوە، ئەڕۆینە بیمارستان، هەتا جەماعەتێ لە بیمارستان مردن، خۆمان بردمانن بۆ سەری زیارەت و ئەسپەردەمان ئەکردن، سەرەتا ئەمانبردنە مردووشۆرخانە، دوای شتن و کفن و دفنمان ئەکردن. پێشتر لە ڕێگا عەرزم کردی، چوار نەفەر لە فامیلانی ئەو کاک کامیل عەبدولقادرە لە بیمارستانا مردن، من ئەوکات نەمەناسین، بەڵام وتیان ئەوانە ئەمرۆ مردوون، ئێتر من و کاک یوسف و کاک باقی و چوار پێنچ نەفەری تر جەم بووینەوە و ماشینێکمان گرت و خستنماننە ناوی، ئەوکاتە ماشین بە زەحمەت دەست ئەکەوت، وەک ئێستە نەبوو. چوارەکە یەکێکیان کوڕ بوو،

سیانیشیان کچ بوون، کچە گەورەکەیان (١٤–١٥) ساڵ ئەبوو، دوو کچەی تر تەقریبەن (٧–٨) ساڵ و کوڕەکەش (٩–١٠) ساڵ ئەبوو.

**پرسیار: باسی ئەوەت کرد چۆن سەردانی ئۆردوگاکانتان کردووە، ئەوە چۆن بوو؟**

وەڵام: ئەوانمان هاورد و بردنمان دفنمان کردن، دوای ئەوان مەسەلەن لە ڕۆژانی چوار شەممە ئەنجومەنمان هەبوو، چووینە ئەنجومەن، وتمان دروست نیە ئەمە هەر ئاوابێ، تەفاوت و بێ وەسائیل، ئەمانە ئێستا لێیان قەوماوە و ناڕەحەتن، حەدی ئەقەل مەراسیمێکیان بۆ بگرین لە سەریاسا، شەوێک لە مزگەوتێکی سەریاس چادرێک هەڵبەین و مەراسیمێک ساز بکەین و دوو بەیت شیعر بخوێنن، با کەف و کوڵێ دڵیان دابمرێتو. ئەوەم لە بیر چوو ڕۆژێکیان ئێمە ئەهاتین و ئەڕۆین بۆ لای پردەکەی دووئاو، لەولای پردەکەی دووئاوەوە قاڵێ هەڵسا بەسەری پردەکەوە، تومەز ژنێک بوو منداڵەکەی باوەشی فڕێدابوویە ناو ڕۆخانەی سیروان. خەڵک فرە هاواریان لێکردبوو، گەرەکی بوو خۆشی بخاتە ناو ئاوەکە وەلێ نەیانهێشت، ئیتر ژنەکە حاڵەتی نیمە گریان و نیمە بێ هۆشی هاوردیانە ئەمبەری ڕۆخانەکە. ئێمە پرسیمان ئەمە چیە؟ وتیان ئەکسەریتی خانەوادەکەی لەدەست داوە، بەتەنها ئەم منداڵەی بۆ ماوە، لە ڕێگا ئەم منداڵەشی مردووە، بۆیە منداڵەکەی فڕێداوە و گەرەکی بووە خۆشی فڕێ بداتە ڕۆخانەی سیروان.

**پرسیار: کاک فاروقی زەوارە لە چاوپێکەوتنێکدا ئەڵێ زۆر تکامان لێکرد ئەو منالە فڕێ نەدا، وتمان گوناحە، چ تاوانێکی هەیە، وتی من هەموو کەسوکارم لەدەست داوە تازە ئەمەشم بۆ چیە، وتمان بەڵکو ئەمە ببێتە پیاو چاکێک، بەڵام کەڵکی نەبوو...**

وەڵام: نا، وتیان ئەویش مردووە و بەمردوویی فڕێی داوە.

**پرسیار: ڕۆژانە چۆن هاوکاری ئەو بریندار و لێ قەوماوانی هەڵەبجەتان ئەکرد؟**

وەڵام: ئێمە وەک سەخس و وەک ئەنجومەن بۆ هاوکاری لێقەوماوەکان ڕۆژانە ئەڕۆینە بیمارستانەکان بۆ هاوکاریکردنیان، ئەگەرچی ئەنجومەنەکە زیاتر لەکاری مەسائیلی فەرهەنگیدا بوو. مەسائیلی فەرهەنگیش وەک مەراسیمگرتن یان مەسەلەن لە ئۆردوگاکانا کابرا شتێکی لازم بووایە وەک کتێب و خواردن و مجەلە و ڕۆژنامە و ڕادیۆ و ئەم نەوعە شتانەیان گەرەک بوایە سەعیمان ئەکرد بۆیان تەهیە بکەین. ئێمە ئەگەڕاین، کابرا ئەیوت خۆزگە ڕادیۆیەکمان هەبوایە بمانزانیایە

خەبەر و هەواڵ چیە، ئەهاتینۆ ئەمانووت دوودانە ڕادیۆمان پێبەن ئەیدەینە دوو خانەوادە، دەنەفەر دائەنیشێت بەدەوریا، هەتا دەعفەیەک تەلەفزیۆنێکمان برد لە مەرکەزی بێداری ئۆردوگای سەریاس دامانناو وتمان با مەردمەکە بێن جارجار تەماشای شتێک بکەن، ئیتر ئەهاتن تەماشایان ئەکرد. بەکورتی ئەوەڵین کەسێ دەنگی بەرزکردۆ بۆ جریانی هەڵەبجە، ئێمە بووین لە ئۆردوگای سەریاسەوە.

**پرسیار: چۆن؟**

وەڵام: ڕۆین مەراسیمێکمان گرت، هەتا لەو وەختا مامۆستا مەلا عەلی ئیمام جەماعەتی ئەو مزگەوتە بوو، مامۆستا مەلا قادریشمان دەعوەت کرد و چەندانە لە مامۆستایان و ڕۆیینە ئەوێ، وتمان بە مامۆستا هەڵبەتە قەبلەن هەماهەنگیمان کردبوو، وتمان برا دێین بەخاتری ئەو جریانەی قەوماوە لە هەڵەبجە لێرە مەراسیمێک ئەنجامەدەین، بۆئەوەی ئێمەش کەف و کوڵی دەمی خۆمان بەمشێوەیە بڕێژین. ئیتر ئەنجومەن ئەوەڵین مەراسیمی لە سەریاس کرد. ئیستیقبالێکی فرەشی لێکرا، باوەڕکە ئەوەنە مەردم جەم بوو، نە لە چادرەکە و نە لە دەوری چادرەکە ڕێگە نەبوو. وەختێکمان زانی ئیستیقبالێکی باشیان لێکرد، وتیان بابڕۆین بۆ ئۆردوگای کەچەڵئاوای جوانڕۆ لەوێش دووبارەی بکەینەوە، چوون ئەکسەر مەردم لەولاوە هاتوون، مەردمی هەڵەبجە لە سازان و مۆردینەوە چوونە مەنتیقەی جوانڕۆ، ڕۆیینە ئەوێ، لەوێش ئۆردوگایەکیان دروست کردبوو، لەوێش مەراسیمەکەمان دووبارەکردەوە، لەوێش مەردمەکە ئیستیقبالێکی باشیان لێکردین و هاتن بە پیرمانەوە.

دوای ئەوە هاتینۆ، کاک بارامی وەڵەدبەگی وتی برا چوون ئیستیقبالیان کردووە لەو کارە، ئەم شیعرانە ئەکەم بە کتێب. ئیتر هاتین بەعزێ عەکس و مەکسێ جەماوەرمان گرت، لەسەر عەکسەکان یەک دوو شەوێک دانیشتین، هەر عەکسێک بەپێی ئەو شیعرانەی دانرا بوو ئەماندانە پاڵی شیعرەکان، ئیتیفاقەن ئەو دوو شاعیرەی پێشتر عەرزم کردی هاوکاری ئێمەیان کرد، کە ناویان کاک ساراڵ و کاک ئیبراهیم بوو، ئیبراهیمی تەخەڵوسی ڕەنجدەرە، بەڵام کاک ساراڵ تەخەڵوسی نەبوو، هەروا ساڕاڵ نزام تەخەڵوسی ئەکرد، هەر خەڵکی هەڵەبجەش بوون، من ئێستاش ئیرتیباتم هەیە لەگەڵیان.

ئیتر ئێمە شیعری ئەوانیشمان لە خەزانی هەڵەبجە جێ کردۆ، خەزانی هەڵەبجەیان بردە تاران بۆ چاپ کردن، (١٥٠٠٠) جلدیان چاپکرد، لە مودەتی هەفتەیەکا یەک

جلدی نەما، هەمووی فرۆشرا، ئێمە یەکی چەند جلدێکمان بۆ خۆمان دانا بوو، هاتن ئەوانیشیان برد، ئێستا من خۆم ئەگەڕێم بە دوایا یەک جلدم دەستناکەوێ. جگە لە خەزانی هەڵەبجە، کتێبێکی تر لە سنە بەناوی هەڵەبجە هیرۆشیمای کوردستان چاپکرا. ئێستا ئەو کتێبەم لەماڵەوە هەیە. دواتر کاک باران خەزانی هەڵەبجە و ئەوی کرد بەیەکێک و چاپی کردەوە، ئەوەش کە گیرا لەسەری بە عینوانی هەڵەبجە. لەوەودوا ئەنجومەن وەک فەعالێکی فەرهەنگی لە سەرانسەری ئێران لە ئەکسەری دانیشگاکان بۆ ساڵگەردی هەڵەبجە مەراسی ئەگرت، من بۆ مەراسیمەکانی سنە و بۆکان و مەهاباد و تەبرێز و ڕەشت و مازندەران و کرمان ڕۆیشتووم، کە ئیتر کرمان لە بلوجستان و سیستان نزیکە چووم، بۆ تاران دوو دەعفە چووم. من ساڵی بۆ یەکێکیان ئەمتوانی بچم، ئەمانە بە مرور دەوریان ئەداوە، هەر ساڵێ دەعوەت ئەکراین بۆ شوێنێک، تەنها ئەمانتوانی بۆ یەکێکیان بڕۆین. بۆ هەرکامیان ئەڕۆیشتین بەشداریمان ئەکرد، وتارێک یان شعرێکمان ئەخوێندەوە، ئێستایش لە مەراسیمەکانا شیعرەکانم ئەخوێنرێنەوە و لە ڕۆژنامە و مجەلەکانا ئەکسەر بڵاوکراونەتەوە.

**پرسیار: دوای ئەو هاتوچۆی ئۆردوگاکانتان ئەکرد بۆ هاوکاریی یارمەتیدان یان هەر شتێکی تر؟**

وەڵام: ئەڕۆشتین بەڵام بۆ یارمەتیدان نەبوو، بۆ سەردانی خزمەکانی خۆمان ئەڕۆیشتین، سەردانمان ئەکردن، نیوەیان ئەناردن بۆ کەنگاوەر، بەعزێکیان لە سەریاس، مەسەلەن سەردانمان ئەکردن بزانین چ شتێکیان پێویستە، وەسائیلێکیان ئیحتیاج نییە. هەتا مەسەلەن هاوسێیەکیان بوو وەڵا فڵانەکەس کاشکایە ئەمشتەت بهاوردایە، ئێمەش ڕۆژێ دواتر شتەکەمان ئەهاورد و بەشی ئەوانیشمان ئەدا.

**پرسیار: وتت لە کیمیابارانی هەڵەبجەدا خەڵکێکی زۆری نۆریاوی تیاچوون، ئەکرێ ڕوونتری بکەنەوە؟**

وەڵام: بەڵێ وا بوو، هەر ئەو کاک حەسەنە عەرزمکردی نزیکەی ١٨ نەفەر، کاک ئیبراهیمی وەڵەدبەگی خۆی و خانەوادەی، مەلا عەبولڕەحمان وەڵەدبەگی لێرە مامۆستا و مەلا بووە خۆی و خانەوادەی تیاچوون، کاکە ئیبراهیم دەرەشیشی ئەسڵی نۆریاوییە، خۆی و خانەوادەی عەرزم کردی، زۆر بوون، شایەت ئێستا زۆریانم لەبیر نەبێت، بەڵام ئەمانە ئەکسەریان خۆیان و خانەوادەیان لە بەین چوون.

**پرسیار: ئێوە هیچ پێشەنگایەکی فۆتۆگرافیتان لەسەر هەڵەبجە نەکردووەتەوە؟**

وەڵام: کاکە هادی زیادینی و کاکە ماشەڵڵامحەمەدی پێشەنگایەکی عەکسییان لە دانیشگای تەبریز کردەوە، من عەکسی ئەویشم گرتووە و لە ماڵەوە هەمە. من بەشدار نەبووم، وەلێ لەگەڵ مامۆستا حەمەئەمین و چەند کەسێکدا بۆ تەماشاکردنی پێشانگاکە ڕۆیشتین، تەماشای عەکسەکانمان کرد.

**پرسیار: وتت ئەو ڕۆژەی کە هاتی بۆ هەڵەبجە هیچ کامێرا و ڤیدۆیەکت پێ نەبوو؟**

وەڵام: هیچم پێنە بوو، دواتر کە گەڕامەوە ماڵەوە بە نەقاشی کێشام، ئێستاش وێنەکان هەن، کە چومەوە وێنەی ئەوانیشت بۆ ئەگرم و بۆت ئەنێرم. نەقاشییەکان لە حەدی ئەوا نییە بێژی وێنەیەکی فۆتۆگرافی یا وێنەیەکی فەنین، ئەما ئیتر شتێکە کە خۆم دیومە.

**پرسیار: دوای کیمیابیباران ئیتر نەهاتنەوە بۆ هەڵەبجە؟**

وەڵام: ئیتر نەهاتمەوە هەڵەبجە، دوای زەمانێ بۆ فەوتی مامۆستا عەلی لەگەڵ مامۆستا مەلاقادر و جەماعەتا هاتین بۆ فاتیحەخوانی، ئەوە ئەوەڵین بار بوو دوای جریاناتی هەڵەبجە. وتمان بەخۆشیا ئەڕۆینە کوردستان، چوون ئازاد بووە و موشکلات نەماوە، وەختێ هاتین چاومان کەو بە هەڵەبجە هیچ خزمەتگوزارییەکی بۆ نەکرابوو، پارچە شیعرێکم نووسی، وتم ئێمە بە ئاوات و دڵخۆشییەکەوە بەرەو مەنتیقەی هەڵەبجە ئەڕۆین! چوون ماوەیەکە لە حاڵەتێکی ئازادایە، وەختێ هاتم و چاوم پێکەوت مەسئولینی کوردەواریم ئێرەم هاوردە ژێر پرسیار. دوو سێ دەفعەی تر هاتم، (٨-٩) قەتعە شیعرم بۆ هەڵەبجە داناوە.

**پرسیار: ئەکرێ ئەو پارچە شیعرانەمان بۆ بنێریت ئێمەش لەناو دەقی چاوپێکەوتنەکەدا شوێنیان بکەینەوە و بەناوی خۆتەوە دایان بنێین؟**

وەڵام: ئێ قەیچێکا، مشکیلە نیە.

**پرسیار: هەر بەناوی خۆتەوە شیعرەکان دائەنێین، ئێستا ئەڕۆین تا عەنەبیش وێنە ئەگرین، چونکە یەکێک لە بەڵگەکان بۆ ناو ئەو قسانە بریتییە لە وێنە یان شیعر یان هەر شتێک، کە تەعبیر لە کارەساتەکە بکات.**

وەڵام: بان چاو.

- لەکۆتاییدا زۆر سوپاست ئەکەین، ماندوومان کردن ...



ئەم وێنەیە مامۆستا محەمەد ڕەشید دوای گەڕانەوەی کێشاویەتی،
وێنەکە مزگەوتی گوندی عەنەبە



فەتحی محەمەد عەلی عەبدوڵڵا مودەریس

ڕاوێژکار لە وەزارەتی بازرگانی و پیشەسازی/ حکومەتی هەرێمی کوردستان

# زمانی کوردی و کوردستان لەنێو زیندانی جیۆگرافی

هەرچەندە هەڵکەوتەی جیۆگرافی کوردستان و سروشتەکەی لە گشت لایەکەوە شاخاوی و بە دۆڵایی دەورە دراوە، بەڵام بڕوامان وایە ئەو ڕاستییە سروشتییە لەچوارچێوەی هاوکێشە ستراتیجییەکاندا خوێندنەوە و لێکدانەوەی تری بۆ دەکرێت. بەدرێژایی مێژوو بە هەزاران ساڵ کورد نیشتمانێکی هەیە و بەڵگەکان دووپاتی ڕەسەنایەتی هەبوونی میللەتێکی کوردنشین بەناوی جیا لەو ناوچەیە دەکەنەوە و ئەو شوێنەش کوردستانە، ئینجا لەنێو ڕووداوەکان و گۆڕانکارییە مەزنەکان کورد خۆی ئەو ناوچەیەی لای گونجاو بووە و ویستی کۆچی گەورەی نەبووە.

پرسیارکردن لە مانەوەی زمانی کوردی دەکرێت هەروەک چەند زانایەکی زانستی مرۆڤ Anthropology و مێژووناسان ئەو پرسیارە دەکەن: نهێنی مانەوەی زمانی کوردی وەک خۆی و ڕوونەدانی گۆڕانکاری بەرچاو لە بنەڕەتی زمانەکە هەروەک لە دوا تێبینیمان و لێکدانەوەمان بۆ ئەو پرسیارە لە سیمینارێک، کە زانکۆی سۆران بۆ ئێمەی ڕێکخستبوو بە بەڵگەی زانستی گرنگ لە وەرگێڕانی ڕوونووسە مێخەکییەکان شرۆڤەی بابەتیانەمان خستە ڕوو، لەوانەیە فاکتەری بەرگەگرتن و مانەوەی هەتاهەتایی زمانی کوردی و کورد لەنێو ئەو جیۆگرافیەدا زامن کراوە و زمانەکەی وەک قەڵغان بووەتە ئامێری پاراستنی ئەو قەوارە کۆن و مێژوویە، کە بە بەڵگەوە ئەوە دەسەلمێنێ تاکە زمانە لەنێو زمانەکانی مرۆڤ، کە بەردەوامە و لەناو نەچووە و بگرە قۆناغ بە قۆناغ و سەردەم لەدوای سەردەم بەهێزتریش دەبێت.

من بڕوام وایە بە ناساندنی بەڵگە، کە زمانی کوردی (بەو شێوازە سەرەتایەی ڕابردوو) لە زمانی سۆمەری کۆنترە، لانی کەم ( هەردوو زمان هەمان سەرچاوەیان هەیە). گرنگیەکە لەوەدایە، کە ئەو زمانە تاکو ئێستا زیاتر لە پەنجا ملیۆن کەس ئاخاوتنی پێدەکات، هاوکات لەکاتی بەراوردکردنی لەگەڵ سۆمەریی و بابلی و ئەکەدی، تێبینی دەکەین کە ئەو زمانانە هەزاران ساڵە لەناوچوون، هەرچەندە زمانی سۆمەری وەک نموونە زیاتر لە هەزار ساڵ قسەی پێکراوە و زمانی حەوت دەوڵەتە شاری حوکمڕانی(لەگش و سۆمەر و لارسا و ئۆروک و ئور و ئادابا بورسیبا) و تەنیا لەنێو لاپەرەکانی میژوودا چەند کەسانێک توانای خوێندنەوە و قسەکردنیان پێی هەیە، ئەوەش بۆ مەبەستی شوێنەوارناسین.

بەر لە سەردەمی سۆمەرییەکان (پێش کۆچکردنیان لە باکووری میزۆپۆتامیاوە بۆ باشوور)، گۆتییەکان و لولوبییەکان و مادەکان و میتانییەکان (نەژاد و باپیرانی کورد بە ئاماژەکانی کتێبە ئاسمانییەکان وەک میللەتی شاخی جودی (گووتی) شێوازی سەرەتایی شارستانیەت و ڕێکخراوە هۆزایەتی لە حوکمڕانی و کولتووری تایبەت بە خۆیان هەر لە سەرەتایی دەستپێکردنەوەی دووەمی مرۆڤایەتی خاوەنی زمانی تایبەت و ئایینی یەکتاپەرستی بوونە، هەر لەنێو ئەو هۆزە گەورە و شاخاوییەدا بەرەیەک بە هۆکاری تایبەتی نەزانراو کۆچیان کردووە بۆ باشوور و نیشتەجێبوونیان لە سەرەتاکانی هەزارەی پێنجەمی پێش زایین.

نهێنییەکانی مانەوەی زمانی کوردی پێویستی بە شرۆڤەکردنە (لە مێژوودا کورد ناوی جۆراوجۆریان هەبووە نسبەت بە شوێنەکانیان) و زمانی کوردی

دوای زیاتر لە هەشت هەزار ساڵی مێژووی تۆمارکراو ئامانجمانە (نهێنییەکان بە بەڵگەوە) بڵاوی بکەینەوە.

کورد خاوەن کۆنترین شارستانیەتە، شارستانیەت پێویستە چەند فاکتەر و هۆکار و کاریگەر و دۆخی هەمەجۆر و چەشن لەخۆبگرێت، وەک خاک و ئینتما بۆ شوێن و زمان و قەوارەی نەتەوەیی و پێکهاتەی کۆمەڵایەتی لەسەر ئەو خاکەی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە بەڵگە و دەقەکانی پەیامە ئاسمانییەکان و ڕوونووسە مێخەکییەکان لە سەردەمی سۆمەرییەکان و دواتر وجودی هەبووە، بەڵام کورد بەناوی تر و زاراوەی تر و نازناوی جیا کە هەمان مانا و ئاماژە دەبەخشێت وەک (کاردا) یاخود(کاردۆخ).

گومان لەوەدا نییە کە زمانی کوردی یەکێکە لە زمانە کۆنەکانی مرۆڤ، بەڵکو لە زمانە هەرە کۆنەکانە، کە مرۆڤ لە سەرەتای ژیانیدا ئاخاوتنی پێ کردووە. لەوە گرنگتر ئەو زمانە سەرەڕای ئاخاوتن ڕەسەنایەتی، مانەوەیەتی هەروەک خۆی بە هەزاران ساڵ دوابەدوای ڕووداوەکانی ناوچەکە، کە هەردەم کاریگەرییە خراپەکانی لەسەر کورد و زمانی کوردی هەبووە، بەڵام ئەو ڕووداوانە بۆ ماوەیەکی درێژ  لە هەژموونی پادشایەتی و زلهێزەکانی ئەوکاتی ڕزگاری بووە و تواناکانی ماوەتەوە،  لەکاتێکدا نزیکەی دوو هەزار و پێنج سەد ساڵیش دەبێ کە شارستانیەتی سۆمەری و ئەکەدیی و بابلیی و زمانەکەیان کە زیاتر لە دوو هەزار ساڵ ئاخاوتنی پێ دەکرا و سەرتاسەری ناوچەی هەردوو ڕووباری دیجلە و فورات، بەگشت کولتوورەکەی کۆتایی هاتووە و بووەتە بابەتێکی مێژوو.

بۆ تێگەیشتن لە مەسەلەی مانەوەی زمانی کوردی ئەو خاڵانەی خوارەوە وەک لێکۆڵینەوە هەوڵدەدەین لێکدانەوەی بۆ بکەین:

-هێزی زمانی کوردی لە خودی میللەتی کوردەوە هەڵقوڵاوە، کە بە سروشت و نەریت تاکەکەسی کورد لە مێژوودا ئینتمای زۆر بەهێز بووە بۆ خاکەکەی و هەموو کات بەرگری لەوە کردووە، کە پارێزگاری لە خۆی و هوزەکەی بکات، تایبەتمەندی کۆمەڵایەتی لەنێو عەشیرەت و هۆز و ئینتما بۆ خاک و زمان و دابونەریتی باپیران کاریگەری هەیە لەسەر مانەوە و نەگۆڕان، لە دیدی کۆمەڵایەتییەوە دەتوانین بڵێین، کە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ جیهانی دەرەوەی چیاکان سنووردار بووە و دوژمنەکانیان زۆر بە ئەستەم توانایان بەکارهێناوە بۆ داگیرکردن، لەبەرئەوە ئەو دابڕانە لە میللەتانی تر  لەو ڕوانگەوە بە فاکتەری ئەرێنی هەژمار دەکرێت.

-کوردستان لەسەر نەخشەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست زیاتر لە ٧٥٪ خاکەکەی

ناوچەی شاخاوییە، لەدێر زەمانیشەوە زۆربەی دانیشتووانی شاخەکان لەنێو دۆڵ و قەد شاخ و لەسەر لووتکەکان نیشتەجێ بوونە، ئەو دابڕانە جیۆگرافیایە هەرچەندە لە چەند کاتێکدا وەک فاکتەری نەرێنی بووە بۆ کوردستان، بەڵام لەچوارچێوەی مێژوو و مانەوەی زمانی کوردی وەک خۆی لەو ناوچەیەدا فاکتەری هێز و سروشتی هەتاهەتایی بەو زمانە بەخشیوە، لەبەرئەوە دوژمنانی کورد، کە هەوڵیانداوە کوردستان داگیربکەن و سیاسەتی سڕینەوەی ناسنامە بەکاربهێنن، بەڵام هەردەم ئەو هەوڵانە سەرکەوتوو نەبووە. لەهەمانکاتدا تێبینی ئەوە دەکەین، کە کوردانی ناوچە کراوەکان بە ئامانج کراون و هەڵمەت و هێرشی داگیرکاران سانا بووە بەدرێژایی مێژوو، بەڵگەش بۆ ئەو زۆرە لە مێژووی کۆن و نوێ.

-لێرەوە کە مێژوو ئەو ڕاستیە دەسەلمێنێت کە زمانی کوردی بەرگەی هەتا هەتایی هەیە پاڵپشت بە سروشتەکەی، ئەوە مانای ئەوەیە کە هەر سەردەمێک وەک فاکتەری و ئەرکی کورد هەوڵدانە بۆ پاراستنی زمانەکەی بە ڕێگای بە هێزکردنی و بۆ گونجاندنە ئەو سەردەمە. مانەوەی زمانی کوردی مانای ئەوەیە ئێمە هەوڵ بدەین کە تایبەتمەندی بۆ بوارەکانی ژیان لە چوارچێوەی ئەو پرۆژەیەیە داهێنانی بۆ بکەین وەک دانانی وشەسازی و زاراوە و دەستەواژە بۆ زمانی کوردی لە چەندین بوار و تایبەتمەندی وەک:

-زاراوە و وشەسازی زمانی کوردی تایبەت بە بازرگانی.

-زاراوە و وشەسازی زمانی کوردی تایبەت بە پرۆتۆکۆڵ و دیپلۆماسییەت.

-زاراوە و وشەسازی زمانی کوردی تایبەت بە بوارەکانی زانست.

-زاراوە و وشەسازی زمانی کوردی تایبەت بە یاسا.

بێگومان ئەو هەنگاوانە ئەگەر جێبەجێ بکرێن ئەوا پێگە و هێز دەدات بە زمانی کوردی بۆ ئێستا و دواڕۆژدا، لایەنی جێبەجێکار بۆ بە پراکتیزەکردنی ئەو پرۆژەیە لە دەستەجەمعی حکومەت و زانکۆکان و ئەکادیمییای کوردی و ڕۆشنبیر و زماننناسان و پسپۆڕی شارەزا خۆی دەبینێتەوە ئەگینا هەر لایەنێک ئەگەر هاتوو بەشدار نەبێت ئەوا دەرئەنجامەکان دروست و تەواونابێت؟

چەمکەکان لە واقیعی گۆڕانکارییەکان وەک حەتمیەتی جیهانگیری تێکەڵ بەیەکتر بوون و پێویستە ئێمەی کورد لەنێو ئەو هاوکێشەیەدا بە ڕێگای زمانەکەمان و ئاگاداری زمانەکانی جیهانی ئاشنا ببین بەشێوازی مامەڵەکردن و دەستنیشانکردنی نەخشە ڕێگایەک کە دیدگای داهاتوو ڕوونتر بێت.

نووسینی: پ.ی.د.کامەران محەمەد قادر

# بیرەوەریی و ڕەنگدانەوەکان

## پشکداریی بیرەوەرییە کوردییەکان لە نووسینەوەی مێژووی کورددا



سەرپەرشتیار و توێژەر

ڕۆژی چوارشەممە ڕێکەوتی ٢٠٢٤/١/١٠ لە هۆڵی (بابان)ی کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتییەکانی زانکۆی سلێمانی گفتوگۆی تێزی دکتۆرای (عادل صدیق عەلی) سەرنووسەری گۆڤاری خاڵ بەڕێوەچوو، ئەمەی خوارەوە خوێندنەوەیەکی وردی پ.ی.د.کامەران محەمەد قادری سەرپەرشتیاری توێژەرە سەبارەت بە گرنگی ناوەڕۆکی تێزەکە.

لە کایەی دۆزینەوە زانستییەکاندا، تێزی دکتۆرای (یاداشتنامە کوردییەکان و ڕۆڵیان لە نووسینەوەی مێژووی کورددا ١٩٠٠-١٩٩١) لە سەربەنی گەشتێک بەناو یاداشت و بیرەوەرییە کوردییەکانی سەدەی بیستەمدا لەلایەن برای توێژەر مامۆستا (عادل صدیق عەلی)یەوە نووسرا، ئەم تێزە سنوورە تەقلیدییەکانی شیکاریی مێژوویی تێپەڕاند، بەڵکو پشکنینێکی قوڵە دەربارەی گرنگیی بیرەوەریی، پەردەی لەسەر ئاڵۆزییەکانی بیرەوەرییە نووسراوەکان لەنێو کورددا هەڵدایەوە، واتە ئەو جیهانی گێڕانەوەیە بوو، کە ماوەیەکی دوورودرێژ چاوەڕوانی کارکردنێکی میتۆدیی دەکرد.

یاداشت و بیرەوەرییەکان دیدگایەکی بێوێنە و بەهادار پێشکەش بە مێژوو دەکەن، کە بەزۆریی لە مێژووی فەرمیدا (کە پشت بە بەڵگەنامە دەبەستێت و زۆرجار لە تۆمارە فەرمییەکاندا دەپارێزرێن) ئامادەییان نییە، واتە ڕەنگە تۆمارە فەرمییەکان چەندەها کەلێنی زانیاریی و زانینیان هەبێت یان ناتەواو بن، ئەوەش بەهۆی هۆکارگەلێکی جۆراوجۆری وەک لەناوبردن، سانسۆر، یان پشتگوێخستن، بەڵام بیرەوەرییەکان لە پڕکردنەوەی ئەم بۆشاییانەدا دەتوانن یارمەتیدەر بن، ئەویش بە پێشکەشکردنی گێڕانەوەی جیا و پاراستنی ئەو لایەنانەی مێژوو کە ئەگەر بیرەوەرییەکان نەبن، ڕەنگە بۆ هەمیشە ئاشکرا نەکرێن. بەواتایەکی تر یاداشت و بیرەوەرییەکان دەتوانن کۆمەڵە لایەنێکی (مێژووی نافەرمی) ئاشکرا بکەن، واتە (وردەکاری کۆمەڵگە پەراوێزخراوەکان) و (ڕووداوە لەبیرکراوەکان) و (گێڕانەوە جیاوازەکان کە ڕەنگە لە تۆمارە فەرمییەکاندا پشتڕاست نەکرابنەوە)، پێشکەش بکەن. ئەمەش یارمەتیدەرە بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەکان یان لایەنگرییە مێژووییەکان.

لەگەڵ هەڵدانەوەی پەردە لەسەر ئەم سەمفۆنییە زانستییە، (بنەڕەت) و (چەمک)ەکان خانەی یەکەمییان گرتووە و خوێنەر بۆ ناو کرۆک و چۆنێتی سەرهەڵدان و

پۆلێنکردنی زاراوەکان بانگهێشت دەکەن. دواتر گەشتێک بۆ دەرخستنی گرنگیی یادەوەری ڕێکدەخات، واتە زەمینەیەک بۆ گەشتێکی زانستیی ورد. (چەمکەکان) هەروەک (ڕەنگەکان) تێکەڵ دەبن، تا تابلۆیەکی پڕ واتا دروستبکەن، کە دواتر بتوانن جەوهەری یادەوەری بەکۆمەڵی کوردیی و گێڕانەوە تاکەکەسییەکان لە شوێنی خۆیاندا دابنێن. دیارە مێژوو گێڕانەوەیەکە کە بە (تاڵ)ەکانی بیرەوەرییە کەسییەکان چنراوە، واتە ڕۆشنایی دەخاتە سەر ئەو ڕۆڵە قووڵەی، کە یادەوەری لە داڕشتنی گێڕانەوەی مێژووییدا دەیگێڕێت.

ئاشکرایە یاداشت و بیرەوەرییەکان لە سروشتیاندا خودیی و سۆزدارین. ئەوان هاوێنەیەکی کەسیی فەراهەم دەکەن، کە تاکەکان لە ڕێگەیەوە دەتوانن وێنەی ڕووداوە مێژووییەکان بگرن. ئەم دەوڵەمەندییە (سۆزدارییی)ە، قووڵیی و هاوسۆزیی بۆ (گێڕانەوە)کە زیاد دەکات، واتە یارمەتیمان دەدات، لە ئاستێکی مرۆییتردا پەیوەندیمان لەگەڵ ڕابردوودا هەبێت.

لەکاتێکدا ئەم جۆرە نووسینە مێژوویەکی کۆنی هەیە، بەڵام تەنیا لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا کەوتە نێو جیهانی نووسینی کوردییەوە، کە ناچاری کرد، لە ڕووی چۆنێتی و چەندایەتییەوە گەشە بکات. جگە لەوەش کۆمەڵێک نووسەر و کەسایەتیی لە چین و توێژە جیاجیاکانی کۆمەڵگەی کوردیی، بەهۆکاری جۆراوجۆر، دەستیان بە تۆمارکرنی ئەزموونە کەسییەکانیان کرد. ئەوەش تۆمارکردنی (ڕووداوێکی تایبەت) یان (ماوەیەکی دیاریکراو) بوو. هەرچەندە هیچکام لەو بیرەوەرییانە لە کەموکورتیی و ناتەواویی بەدەرنین، بەڵام بەشێوەیەک ڕۆشنایی دەخەنە سەر زۆر لایەن و ڕەهەندی قۆناغی مێژوویی گەلی کورد، کە مێژوونووسان ناتوانن پشتگوێی بخەن، لانیکەم ئەم نووسینانە گرنگیدانی خودی کوردەکان بە ڕووداو و گۆڕانکارییەکان دەخەنەڕوو.

دیارە ئەمەش لەوەوە سەرچاوەدەگرێت، کە یاداشت و بیرەوەرییەکان پڕن لە چیرۆک و سەرگوزشتە کەسییەکان، کە ڕەنگە نەخرێنە خانەی مێژووی فەرمییەوە، بەڵام ئەم گێڕانەوانە تێگەیشتنێکی باشتر سەبارەت بە کەسایەتییە مێژووییەکان دروست دەکەن، کە ڕەفتار و خەبات و ساتەکانی خۆڕاگرییان ئاشکرا دەکەن.

گەشتە زانستییەکە قووڵتر دەبێتەوە، کاتێک تێزەکە تایبەتمەندیی بیرەوەریی و یاداشتنامە کوردییەکان دەخاتەڕوو و سەمای ئاڵۆزی نێوان یادەوەریی و

ناتەواوییەکانی ئاشکرا دەکات. نەبوونی بیرەوەرییش دەبێتە تابلۆیەک کە هۆکارە خودیی و بابەتییەکانی لەسەر دەنەخشێنرێن. لێرەدا پاڵنەرەکان یەک دەگرن تا مۆزایکێکی گێڕانەوە دروستبکەن، کە سنوورە ئاساییەکان تێدەپەڕێنێت. ئیرادەی دۆکیۆمێنتکردن و بەرەنگاربوونەوەی هەوڵەکانی سڕینەوەی مێژووە کەسیی و دەستەجەمعییەکان، وەک هێزێکی کاریگەر سەرهەڵدەدات، کە مەشخەڵەکانی بیرەوەرییە کوردییەکان پێکدەهێنێت. واتە زۆرجار یاداشت و بیرەوەرییەکان دیدگەلێک لەخۆدەگرن، کە چۆن تاک و کۆمەڵگەکان ڕووبەڕووی ئاستەنگەکان بوونەتەوە و خۆیان لەگەڵ گۆڕانی بارودۆخەکاندا گونجاندووە. تێگەیشتن لە (میکانیزمەکانی ڕووبەڕووبوونەوە) دەتوانێت وانەگەلێکی بەبەها بۆ ئێستا و داهاتوو پێشکەش بکات.

کاتێک شەپۆلەکانی تێزەکە تێدەپەڕێنین و بەرەو قوڵایی ئارامی دەڕۆین، بە پەرتیی تێڕوانینەکان و فرەدیدگایی نووسەرەکانیان و ژیانی ڕۆژانەی کۆمەڵگەکەیان ئاشنادەبین، ئەمەش تەواو سروشتییە، چونکە یاداشت و بیرەوەرییەکان کۆمەڵە دیدگایەکی جۆراوجۆر دەنوێنن. ڕەنگە تاک یان کۆمەڵگە جیاوازەکان یەک (ڕووداوی مێژوویی) بەشێوازی جۆراوجۆر ببینین و ڕاڤەی بکەن، کە ئەوەش ڕەنگدانەوەی پاشخان و بیروباوەڕ و ئەزموونە تایبەتییەکانیانە. ئەم فرەدیدگاییەش ئاڵۆزیی و دەوڵەمەندیی بۆ گێڕانەوەی مێژوویی زیاد دەکات.

هاوکات زۆرجار بیرەوەرییەکان وردەکارییەکانی ژیانی ڕۆژانەمان بیردەخەنەوە، لەوانەش کردارە کەلتووریی و کارلێکە کۆمەڵایەتییەکان و ڕۆتینی ژیانی تاکەکەسەکان. دیارە مێژووی فەرمی تەرکیز لەسەر ڕووداوە سیاسی یان سەربازییە گەورەکان دەکات، لەکاتێکدا یاداشت و بیرەوەرییەکان ڕۆشنایی دەخەنە سەر ژیانی ڕۆژانە، واتە دیدێکی ورد سەبارەت بە چۆنێتی ژیانی مرۆڤەکان و نەزانی و نەخۆشی و نەخوێندەواریی و خۆشەویستییان و ڕووبەڕووبوونەوەی ئاڵینگارییەکان پێشکەش دەکەن.

**تێبینی**: تێبینی/ تێزەکە شایانی دەستخۆشی ئەندامانی گفتوگۆکە بوو، هیوای سەرکەوتن و بەردەوامیی بۆ برای خۆشەویستم د.عادل سدیق دەخوازم.

# عوسمانییەکان

## ١٩٣٩- ٢٠١٠

**بیبلیۆگرافیا و پێڕستی لە پڕۆژەی (کورد و کوردستان-**
**بیبلیۆگرافیا و پێڕستیان لە کتێبی کوردیدا ١٩٢٠- ٢٠١٠)**

................................ **بەشی یەکەم** ................................

**ئامادەکردن: بوار نوورەدین**



**تێبینی:**

١- ئەم بیبلیۆگرافیایە بۆ ژمارەی پێشووی گۆڤاری خاڵ (٤٢) ئامادەکراوە، کە تایبەت کرابوو بە عوسمانییەکان. بۆئەوەی هەر بەشێکی لە ژمارەیەکی گۆڤاری خاڵدا بڵاوبکرێتەوە، دووەم بەشی ئەم بیبلیۆگرافیایە- پێڕستکارییەکەی کراوە بە دوو بەشەوە، لەم ژمارەیەدا پێڕستکاریی کتێبی ساڵانی ١٩٨٧- ٢٠٠٠ دانراوە و لە ژمارەی داهاتوویشدا، پێڕستکاریی ٢٠٠١- ٢٠١٠ بڵاودەکەینەوە.

٢- بەکاربەری ئەم بیبلیۆگرافیایە، بۆ هەر سەرنج و ڕوونکردنەوەیەک، پێویستە سەیری ژمارەکانی پێشتری گۆڤاری خاڵ بکات.

٣- تەنها بۆ وشەی (عوسمانی) گەڕاوین و ئەم ئەنجامانەمان بەدەستهێناوە.

**کورتکراوەکان:**

پ.: پێوانە (بە سانتیمەترە و پانی پێش درێژی نووسراوە)

پ.د.ک.: پارتی دیموکراتی کوردستان

چ.: چاپخانە

چاپ.: نۆرەی چاپ

ژ.: ژمارە

ژ.س.: ژمارەی سپاردن

ژمارەی جێگیری نێودەوڵەتیی کتێب: ISBN: International Standard Book Number

س.: ساڵ

ش.: شوێن

ل.: لاپەڕە

ی.ن.ک.: یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان

و.: وەزارەت.

؟: هەر زانیارییەکی نادیار و نەزانراو

**یەکەم: بیبلیۆگرافیای کتێبی سەربەخۆ ١٩٨٧- ٢٠٠٩**

**١- کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی**

نووسین: د.جەلیلی جەلیل

وەرگێڕانی لە زمانی ڕووسی و پێشەکی و پەراوێز: د.کاوس قەفتان

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری کوردی

چاپ.: یەکەم، چ.: الحریە، ش.: بەغدا، ژ.س.: ٢١٠، س.: ١٩٨٧، ل.:٣٢٦، پ.:١٧×٢٤

**ناوەڕۆک:** وشەیەک/ پێشەکی/ فەسڵی یەکەم: پەیوەندیی کۆمەڵایەتی و ئابووریی کورد/ فەسڵی دووەم: لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەمدا/ فەسڵی سێیەم: دۆخی سیاسی کوردستان/ لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا/ میرنشینی بابان/ میرنشینی بادینان/ میرنشینی سۆران/ میرنشینی هەکاری/ میرنشینی بۆتان/ فەسڵی چوارەم: خەباتی میر محەمەد/ لە پێناوی یەکخستنی کوردستاندا/ فەسڵی پێنجەم: هێرشی هێزە سوپاییەکانی عوسمانی بۆ سەر کوردستان/ کۆتایی دەسەڵاتدارێتی میر محەمەد/ فەسڵی شەشەم: دۆخی کوردستان لە ساڵانی چلی سەدەی نۆزدەیەمدا/ ڕاپەڕینەکەی بەدرخان بەگ/ بزووتنەوەکەی بۆتان لەپێناوی سەربەخۆییدا/ کۆتایی دەسەڵاتدارێتی بەدرخان بەگ/ هەوڵدان بۆ دابەشکردنی تەواوی کوردستان.../ فەسڵی حەوتەم: ڕاپەڕینەکەی یەزدان شێر/ پەیوەندیی ڕووس و کورد لە سەرەتای شەڕەکەدا/ کۆتایی/ پەراوێزەکانی نووسەر/ پەراوێز و سەرنجەکانی وەرگێڕ/ سەرچاوەکان/ پێڕەس (ناوەڕۆک).

**٢- ئازادیی ڕۆژنامەنووسیی لە یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستان-دا** (تۆێژینەوەیەکی بەراوردکارییە بۆ یاساکانی چاپەمەنیی عوسمانی و عیراقی و گەڕانەوە بۆ نێو دانیشتنەکانی پەرلەمان)

نووسین: مەم بورهان قانیع
لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
چاپ:. یەکەم، چ:. ڕاز، ش:. سلێمانی، ژ.س:. ٣٤٥، س:. ٢٠٠١، ل:.١٩٤، پ:.١٤×٢١
**ناوەرۆک:** بەر لە سەرەتا/ سەرەتا/ بەشی یەکەم: بەهای یاسا و یاسای ڕاگەیاندن/ بەشی دووەم: جاڕی گەردوونیی مافەکانی مرۆڤ و ئازادیی ڕادەربڕین لە دەوڵەتی دیموکراسیدا/ بەشی سێیەم: یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستان لە نێوان ئازادیی ڕادەربڕین و فەرامۆشکردنی مافەکانی ڕۆژنامەنووسیدا/ ئەنجام و ڕاسپاردە/ پاشبەند/ یاسای چاپەمەنیی هەرێمی کوردستان/ یاسای چاپەمەنیی دەوڵەتی عوسمانی/ یاسای چاپەمەنیی عێراقی/ یاسای وەزارەتی ڕۆشنبیری/ سەرچاوەکان/ پێرست.

**٣- کوردستان و کێشەی سنووری عوسمانی- فارسی ١٦٣٩- ١٨٤٧**

نووسین: د.نەجاتی عەبدوڵڵا
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی
چاپ:. یەکەم، چ:. و- پەروەردە، ش:. هەولێر، ژ.س:. ٣٧، س:. ٢٠٠١، ل:.٢٠٤، پ:.١٤×١٩
**ناوەرۆک:** بەرایی: پرۆفیسۆر Demier Francis/ پێرست/ بەندی یەکەم: پێشگۆتن/ دەروازەیەکی میتۆدۆلۆژی/ لە سنووری سرووشتییەوە بۆ سنووری دەستکرد/ حەشارگەیەک لە مێژوونووسیی کورد/ بەندی دووەم: عوسمانی و سەفەوی- فروانخوازی و پێکداهەڵپژان/ لەدایکبوونی دوو بلۆکی دژ بەیەک/ جەنگی چاڵدێران- هاوپشتیی کورد و عوسمانی/ لە پەیماننامەی ئەماسییەوە- ١٥٥٥ تا پەیماننامەی سەراو ١٦١٨/ پەیماننامەی زەهاو ١٦٣٩- یەکەم دابەشبوونی ئۆفیسالی (ڕەسمی) کوردستان/ بەندی سێیەم: ململانێی عوسمانی- فارسی لەسەر کوردستان لەسەدەی هەژدەیەمدا/ ئیمپراتۆریای فارس لە سەردەمی داگیرکردنی ئەفغاندا- کورد و ئەفغان/ کوردستان لە نێوان ململانێی نادرشا و عوسمانیدا/ لە پەیماننامەی هەمەدانەوە ١٧٢٧ تا پەیماننامەی کوردان ١٧٤٦/ لە ئازادیی نسبییەوە بۆ پاشکۆیایەتی/ بەندی چوارەم: جیۆپۆلیتیکی پرسی کورد لە نیوەی سەدەی نۆزدەیەمدا/ ئینگلیز- ڕووس و فرەنسی: ململانێ لەسەر ڕۆژهەڵات/ کورد: خولانەوە لەناو بازنەیەکی بۆشدا/ پەیماننامەی یەکەمی ئەرزەرۆم ١٨٢٣: ڕێگەیەکی بنبەست/ کوردستان لە نێوان هەردوو پەیماننامەی ئەرزەرۆمدا/ پەیماننامەی دووەمی ئەرزەرۆم ١٨٤٧: پاییزی کورد/ کۆبەند: ڕوانین و مەسەلە/ پەراوێزەکان/ بیبلۆگرافی/ پاشکۆ/ پێرستی ناو و شوێن.

**٤- مێژووی ڕەچەڵەکی ئالی عوسمان- لە بیرەوەرییەکانی عەلی پاشا کوڕی سوڵتان مرادی پێنجەمی عوسمانی**

نووسین: عەباس پاشا کوڕی عەلی پاشا کوڕی سوڵتان مورادی پێنجەم

چاپ: یەکەم، چ: ئالان، ش: سلێمانی، ژ.س: ٣٢٠، س: ٢٠٠١، ل: ١٥٢، پ: ١٤×٢٠

**ناوەرۆک:** پێشەکی/ کورتەی ژیاننامەی نووسەر/ سەرەتا (لێرەدا هاتووە: سەرهەڵدانی ئەم چیرۆکە دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژانی ناکۆکی نێوان سوڵتان مورادی پێنجەم و براکەیدا کە سوڵتان «عەبدولحەمیدی دووەم»ە ئەم ناکۆکییە بەهۆی کوشتنی سوڵتان عەبدولعەزیزی مامیانەوە بوو...)/ هەندێ بابەتی وەک: ناکۆکیی نێوان سوڵتان مورادی پێنجەم و سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم- خێزانێکی ئاوارە کرد/ حیزبی ئیتحاد و تەرەقی سوڵتان موراديان لەسەر تەخت لابرد/ پاش حوکمی سوڵتان عەبدولحەمیدی مامم- بەرەو شارۆچکەی پێنجوێن بەڕێکەوتم/ مێژووی ئالی عوسمان/ باسی ژیان و فەرمانڕەوایی کۆمەڵێک لە سوڵتانە عوسمانییەکان.../ سوڵتان ئۆرهان/ سوڵتان مورادی یەکەم/ عەشرەتی ئۆغزخان/ ناوی ئەو سوڵتانانەی کە سوپاسالار بوون/ ناوی ئەو سوڵتانانەی کە شاعیر بوون.../ پێڕست/ کۆمەڵێک وێنەی ڕەش و سپی و بەڵگەنامە.

تێبینی: لە یەکەم لاپەڕەدا نووسراوە: عەباس پاشا کوڕی عەلی پاشا کوڕی سوڵتان مورادی پێنجەم لە عێراق- لە شاری سلێمانی نیشتەجێیە.

**٥- مێژووی ڕەچەڵەکی ئالی عوسمان**

نووسین: عەباس پاشا کوڕی عەلی پاشا کوڕی سوڵتان مورادی پێنجەم

چاپ: دووەم، چ: شارستان، ش: ؟، ژ.س: ٣٢٠، س: ٢٠٠١، ل: ٤٣٧، پ: ١٦×٢٢

**ناوەرۆک:** هەمان ناوەرۆکی چاپی یەکەمی هەیە بە کەمێک دەستکارییەوە، بڕوانە کتێبی ژمارە چوار.

**٦- مێژووی ڕەچەڵەکی ئالی عوسمان- لەبیرەوەرییەکانی عەلی پاشا کوڕی سوڵتان مرادی پێنجەمی عوسمانی**

نووسین: عەباس پاشا کوڕی عەلی پاشا کوڕی سوڵتان مورادی پێنجەم

چاپ: سێیەم، چ: ئاسۆ، ش: سلێمانی، ژ.س: ٣٢٠، س: ٢٠٠١، ل: ٢٠٨، پ: ١٥×٢٠

**ناوەرۆک:** هەمان ناوەرۆکی چاپی یەکەمی هەیە، بڕوانە کتێبی ژمارە چوار.

**٧- چەردەیەکی کۆمەڵایەتییانە لە مێژووی نوێی عیراق- بەرگی یەکەم- لە سەرەتای سەردەمی عوسمانی، تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم**

نووسین: د.عەلی وەردی

وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: دلێر میرزا

لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری-

بەڕێوەبەرایەتیی خانەی وەرگێڕان
چاپ:. یەکەم، چ:. تیشک، ش:. سلێمانی، ژ.س:. ٦١٩، س:. ٢٠٠٤؟، ل:.٤٧٤، پ:.١٦×٢٢

**ناوەڕۆک:** پێشەکی/ کۆمەڵزانی و مێژوو/ کێشەی بابەتی/ خەواندنی کۆمەڵایەتی/ جوغزی نوێ/ پێشەکی بەشی یەکەم/ ئێرانییەکان و مەزهەبی شیعە/ گەورەبوونی ململانێی مەزهەبی/ پرەنسیپی پارانەوە/ ڕەوشتی خەڵکی عێراق/ دوا تەوژمی خێڵەکایەتی/ شارەکان و عەشیرەتەکان/ دیاردەی شەڕەنگێزی/ خەڵەفی کوڕی ئەمین/ جیاوازی لە نێوان لاتەکان و شەڕئەنگێزەکاندا/ ئاستی هۆشیاریی کۆمەڵگە/ داستانی حەسەن کبریت/ بەشی یەکەم: پێکهاتنی دەوڵەتی عوسمانی/ بەشی دووەم: دەوڵەتی سەفەویی و شیعەگەری/ بەشی سێیەم: سەردەمی عوسمانی لە قۆناغی دووەمدا/ بەشی چوارەم: هەرەسهێنانی دەوڵەتی سەفەوی/ بەشی پێنجەم: نادر قولی و پرۆسەی مەزهەبی پێنجەم/ بەشی شەشەم: سەردەمی مەمالیک لە عێراقدا/ بەشی حەوتەم: سولەیمانی گەورە و سەرهەڵدانی بزاڤی وەهابی/ بەشی هەشتەم: مەمالیک لە دوای سولەیمانی گەورە/ بەشی نۆیەم: داود پاشا/ بەشی دەیەم: کۆتایی ئینکشارییەکان و مەمالیک/ پاشکۆکان/ پێڕست.

**٨. کوردستان لە چاپکراوە عوسمانلییەکاندا**
وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە: فەیسەڵ دەباغ
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
چاپ:. یەکەم، چ:. ئاراس، ش:. هەولێر، ژ.س:. ٦، س:. ٢٠٠٤، ل:.١٩١، پ:.١٦×٢٣

**ناوەڕۆک:** پێشەکی/ ئەم کتێبە (بەپێی ڕیزبەندی تیپەکان) باس لە شار و شارۆچکە و گوندەکانی بەشێک لە کوردستان دەکات.../ زمانە ئارییەکان.

**٩- کوردستان لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا- لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە تا جەنگی یەکەمی جیهانی (لێکۆڵینەوەیەک لە بواری مێژووی سیاسیدا)**
نووسین: د.عەبدوڵلا عەلیاوەیی
لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان
چاپ:. دووەم، چ:. ئاوێر، ش:. هەولێر، ژ.س:. ٤٣٢، س:. ٢٠٠٤، ل:.١٩٨، پ:.١٦×٢٣

**ناوەڕۆک:** بەشی یەکەم: کورد لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەمدا/ پێکهاتەی دانیشتوان و ژیانی ئابووری لە کوردستاندا/ دابەشکردنی کوردستان لە نێوان هەردوو دەوڵەتی سەفەویی و عوسمانیدا/ میرنشینە کوردەکان/ هۆکاری ڕووخانی میرنشینە کوردەکان لە دەوروبەری ناوەڕاستی سەدەی

نۆزدەیەمدا/ سەرەتای دەسەڵاتی ئەورووپی لە کوردستاندا/ پەیمانەکانی سنووری نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئێران لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەمدا/ پەیمانی دووەمی ئەرزەڕۆم لە ساڵی ١٨٤٧دا/ بەشی دووەم: کوردستان لە ساڵانی ١٨٥٣- ١٨٧٨/ پەیوەندییەکانی ڕووسیا- کورد پاش ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم/ کورد لەماوەی جەنگی کریما/ بزووتنەوەی یەزدان شێر/ هەڵوێستی تایفە ئایینییەکان لە بزووتنەوەی یەزدان شێر/ کوردستان لە پاش شەڕی کریمەوە (قریم-قرم) تا بەرپابوونی شەڕی ڕووسیا- عوسمانی لە ساڵانی ١٨٧٧- ١٨٧٨/ جەنگی ساڵانی ١٨٧٧- ١٨٧٨ی نێوان ڕووسیا و دەوڵەتی عوسمانی و ڕۆڵی کورد تێیدا/ هەردوو پەیمانی ساڵی ١٨٧٨ی سان ستیڤانۆ و بەرلین/ بزووتنەوەی کوڕانی بەدرخان لەساڵی ١٨٧٩دا/ دووەمین بزووتنەوەی کوڕانی بەدرخان لەساڵی ١٨٨٩دا/ سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی بەرانبەر بە خێڵە کوردەکان و تایفە ئایینییەکان/ خێڵەکانی دەرسیم/ ئێزیدییەکان/ بارودۆخی گشتیی کوردستان پێش هەڵایسانی شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵا/ بەشی سێیەم: شۆڕشی شێخ عوبەیدڵڵای نەهری ١٨٨٠- ١٨٨١/ شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری/ پەیوەندیی شێخ عوبەیدوڵڵا لەگەڵ تایفە ئایینییەکاندا/ پەیوەندیی شێخ لەگەڵ ڕووسیادا/ پەیوەندیی شێخ لەگەڵ بریتانیادا/ هۆکانی شکستی شۆڕشەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا نەهری/ سەرەنجامەکانی شۆڕش/ بەشی چوارەم: پەرەسەندنی هۆشیاریی نەتەوەیی لەلای کورد لە چارەکی کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا/ سوارەی حەمیدییە/ خوێندنگە خێڵەکییەکان (عەشیرەت مەکتەبلەری)/ بەشداری کورد لە دامەزراندنی کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقیدا/ سەرەتای سەرهەڵدانی بزووتنەوەی نوێی ڕۆشنبیریی کوردی/ ڕۆژنامەی کوردستان ١٨٩٨- ١٩٠٢/ کۆمەڵە و ڕێکخراوە کوردییەکان/ بەشی پێنجەم: کوردستانی عوسمانی پاش کودەتای ساڵی ١٩٠٨/ ڕاپەڕینی ساڵی ١٩١٣ی بتلیس/ سەرچاوەکان/ پێرست.

**١٠- کوردەکانی ئێران و هێرشی عوسمانی**

نووسین: گەیلان

وەرگێڕانی لە زمانی فرەنسییەوە: د.نەجاتی عەبدوڵڵا

لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی کوردناسیی- مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک.)

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ٧١٣، س: ٢٠٠٤، ل:١٤٨، پ:١٥×٢٠

**ناوەڕۆک:** لە بریتی پێشەکی/ سۆمای/ برادۆست/ تەرگەوەر/ مەرگەوەر/ پاشکۆییەکان/ ڕاپۆرتی دەرویش پاشا- سەرۆکی کۆمسیۆنی عوسمانی بۆ دیاریکردنی سنووری عوسمانی- ئێرانی

١٢٦٩-١٨٥٢/ شیکردنەوەی ڕەوشی ورمێ/ شەکاک/ شەقاقی/ ئۆرگینالێ بەڵگەنامە فرەنسییەکان/ ئیندێکسی ناو و شوێنەکان.

**١١- دەوڵەتی عوسمانی- هۆی گەشەسەندن و ڕووخانی**

نووسین: د.عەلی محەمەد ئەلسەلابی
وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: ئەحمەد عەبدولڕەحمان ئەحمەد- نیهاد جەلال حەبیبوڵلا
لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی نارین- هەولێر+ دار المعرفە لبنان
چاپ: یەکەم، چ: دارالمعرفە، ش: لوبنان، ژ.س: ٨٤٥، س: ٢٠٠٧، ل:٧٧٣، پ:١٧×٢٤

**ناوەرۆک:** ناوەرۆک/ ئێمەی وەرگێڕیش قسەیەکمان هەیە/ پێشەکی/ دەروازە/ بەشی یەکەم: ڕەگ و ڕیشە و ڕەچەڵەکی تورکەکان/ بەشی دووەم: بەرقەراربوونی دەوڵەتی عوسمانی و جەنگە ئازادیخوازەکان/ بەشی سێیەم: محەمەدی فاتیح و فەتحکردنی قوستەنتەنییە/ بەشی چوارەم: سوڵتانە بەهێزەکانی دوای محەمەد فاتیح/ بەشی پێنجەم: سەرەتای پووکانەوەی دەوڵەتی عوسمانی/ بەشی شەشەم: سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمید/ بڵاوبوونەوەی دیاردەی شیرک و بیدعە و ئەفسانە/سۆفیەتی لادەر/ ئامادەنەبوونی سەرکردایەتی لە خوارتر/ بڵاوبوونەوەی ستەم لە دەوڵەتدا/ زێدەڕۆیی دونیایی/ ناکۆکی و دووبەرەکی/ ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە/ موجاهیدی گەورە حەسەن ئاغای تووشی/ موجاهید حەسەنی کوڕی خیرەددین بربرۆسە/ سەرچاوەکان/ ناوەرۆک.

**١٢- ڕەگ و ڕیشەکانی ناسیۆنالیزمی تورکی**

نووسین: د.قەیس جەواد ئەلعەزاوی
وەرگێڕانی لە زمانی فرەنسی و پێشەکی: د.موحسین ئەحمەد عومەر
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٠٢٢، س: ٢٠٠٧، ل:١٠٦، پ:١١×١٧

**ناوەرۆک:** پێڕست/ پێشەکی/ ڕەگ و ڕیشەکانی ناسیۆنالیزمی تورکی/ بنچینەی تیۆری/ کاریگەرییەکان و سەرەتا و دەرکەوتنی نووسراوەکانی ناسیۆنالیزمی تورکی/ سیاسەتی بەتورککردن/ سەرکەوتنی بانگەوازی تۆرانی بە سەر یەکێتیی عوسمانی/ کۆتایی دەوڵەتی عوسمانی.

**١٣- سوڵتانە عوسمانییەکان**

نووسین: د.فەرهاد پیربال
چاپ: یەکەم، چ: ڕەنج، ش: سلێمانی، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٧، ل:٨٥، پ:١٩×٢٣

**ناوەرۆک:** سوڵتانە عوسمانییەکان/ بەرایی/ بەئیسلام کردنی ڕۆژهەڵات/

نەتەوەکانی ئەنادۆڵ لە سەدەی سیازدەیەم و چواردەیەمدا/ سوڵتانەکان/ بڵاوبوونەوەی دەسەڵاتی عوسمانی لە ١٤٠٣- ١٦٨٣/ داگیرکەرەکان/ پاشەکشە و کەمبوونەوەی دەسەڵاتی عوسمانی ١٦٩٩- ١٩١٤.

**١٤- شەرەفنامەی شەرەف خانی بەدلیسی- مێژووی میرانی خانەدانی عوسمان و پاشایانی ئێران تووڕانی هاوچەرخیان**- بەرگی دووەم

نووسین: شەرەفخانی بدلیسی

وەرگێڕانی لە زمانی فارسییەوە: سەلاحەددین ئاشتی

لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین

چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٠٠٧، س: ٢٠٠٧، ل: ٣٧١، پ: ١٧×٢٤

**ناوەرۆک:** پێرست/ سەردەق: سەلاحەددین ئاشتی/ پێشەکی/ باسی بنە و بنەچەکەی میرانی خانەدانی عوسمانی/ باسی سەرەتای داگیرسانی دەسەڵاتی سوڵتانی عوسمانی غازی/ باسی بەسەرهاتی میرانی خانەدانی عوسمان و پاشایانی ئێران و تووران ١٢٩٠- ١٥٩٧/ لیزگەی ناوی کەسان/ لیزگەی ناوی شوێنەکان/ لیزگەی ناوی مۆز و خێڵ و خانەدانان.

**١٥- عوسمانییەکان- لە عوسمانی کوڕی ئۆرتغلولەوە تا سوڵتان عەبدولمەجیدی دووەم**

نووسین: چەند نووسەرێک

وەرگێڕانی لە ؟: سەلام عەبدولکەریم

لە بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

چاپ: یەکەم، چ: گەنج، ش: سلێمانی، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٧، ل: ٢١٤، پ: ١٤×٢٠

**ناوەرۆک:** ناوەرۆک/ پێشەکی وەرگێڕ/ عوسمانییەکان/ ڕەچەڵەک و نەژاد و گەشەکردنی دەوڵەتەکەیان/ فراوانخوازی دەوڵەتی عوسمانی/ کشانەوە و بەرەودواهاتنی عوسمانییەکان/ لیستی سوڵتانەکانی عوسمانی/ عوسمانی کوڕی ئورتغل/ سوڵتان ئۆرخان (ئۆرخانی جەنگاوەر)/ کارە یاسایی و شارستانییەکانی ئۆرخان/ پەڕینەوە بەرەو کەناری ئەوروپا/ سوڵتان مورادی یەکەم/ سوڵتان بایەزیدی یەکەم (بایەزیدی هەورە بروسکە)/ پێگەیشتنی سوڵتان بایەزیدی یەکەم/ واڵاکاریی و داگیرکارییەکانی سوڵتان بایەزیدی یەکەم/ بایەزیدی یەکەم و کوشتارکردنی ئەورووپا/ هەڵوێستی بەرامبەر سرب/ جەنگی نیکۆپۆڵس/ سوڵتان محەمەدی یەکەمی عوسمانی (جەلاد- خانەدان)/ سوڵتان مورادی دووەم/ سوڵتان محەمەدی فاتیح (محەمەدی دووەم)/ لەدایکبوون و گەشەسەندنی/ کەسایەتیی سوڵتان محەمەدی فاتیح/ سیاسەتەکانی سوڵتان محەمەدی فاتیح/ ژیانی سوڵتان محەمەدی فاتیح/ گرنگترین کارەکانی سوڵتان محەمەدی فاتیح/ لە بواری

ڕێکخستن و کارگێڕیدا/ بایەخدانی سوڵتان محەمەد بە خوێندنگە و پەیمانگاکان/ بایەخدانی بە زانایان/ بایەخدانی بە هونەر/ بایەخدانی بە وەرگێڕان/ بایەخدانی بە ئاوەدانکردنەوە و بونیاتنان و نەخۆشخانەکان/ بایەخدانی بە بازرگانی و پیشەسازی/ بایەخدان بە ڕێکخستنە کارگێڕییەکان/ بایەخدان بە سوپا و هێزی دەریایی/ بایەخدان بە هێزی دادپەروەری/ مردنی سوڵتان محەمەدی فاتیح/ سوڵتان بایەزیدی دووەم/ سوڵتان سەلیمی یەکەم/ ژیانی سوڵتان سەلیمی یەکەم/ کەسایەتیی سوڵتان سەلیمی یەکەم/ ململانێی عوسمانی- سەفەوی/ زاڵبوون بەسەر دەوڵەتی مەمالیکدا/ حیجازی عوسمانییەکان/ خزمەتکاری شوێنە پیرۆزەکان/ عوسمانییەکان بوون بە خەلیفە/ مردنی خەلیفە سەلیمی یەکەم/ سوڵتان سلێمانی یەکەم (سلێمان قانوونی- سلێمانی مەزن)/ سوڵتان سەلیمی دووەم/ سوڵتان مورادی سێیەم/ سوڵتان محەمەدی سێیەمی عوسمانی/ سوڵتان ئەحمەدی یەکەم/ سوڵتان مستەفای یەکەم (مستەفاخان)/ گەڕانەوەی سوڵتان مستەفای یەکەم بۆ فەرمانڕەوایی/ بارودۆخی سەردەمی سوڵتان عوسمانی دووەم/ سەردەمی فەرمانڕەوایەتی کردنی عوسمانی دووەم/ پێکدادان لەگەڵ ئینکشارییەکاندا/ بێسەروبەری عوسمانییەکان/ کوژرانی سوڵتان عوسمانی دووەم/ سوڵتان مورادی چوارەم/ سوڵتان ئیبراهیمی یەکەم/ ماوەی فەرمانڕەوایی ئیبراهیمی یەکەم/ سیاسەتی ناوخۆی ئیبراهیمی یەکەم/ داگیرکردنی دورگەی کریت/ یاخیبوونی ئینکشارییەکان و لابردنی سوڵتان ئیبراهیمی یەکەم/ سوڵتان محەمەدی چوارەم/ دەست بەکاربوونی سوڵتان محەمەدی چوارەم/ سوڵتان محەمەدی چوارەم و دەسەڵاتەکانی/ کەوتنی قەڵای (نوهزل)ی نەمساوی/ گرتنی دورگەی کریت/ هەڵمەت بۆ سەر ڕووسیا/ گەمارۆی ڤیەننا بۆ جاری دووەم/ کۆتایی سوڵتان محەمەدی چوارەم/ سوڵتان سلێمانی دووەم/ سوڵتان ئەحمەدی دووەم/ سوڵتان مستەفای دووەم/ سوڵتان ئەحمەدی سێیەم/ سوڵتان مەحموودی یەکەم/ سوڵتان عوسمانی سێیەم/ سوڵتان مستەفای سێیەم/ سوڵتان عبدولحەمیدی یەکەم/ سوڵتان سەلیمی سێیەم/ سوڵتان مستەفای چوارەم/ سوڵتان مەحموودی دووەم/ فەرمانڕەواییەتی سوڵتان مەحموودی دووەم/ لەناوبردنی ئینکیشارییەکان/ چاکسازی فێرکردن/ چاکسازی تری سوڵتان مەحموودی دووەم/ قەدەغەکردنی عەمامە (مێزەر) یان سەرپێچ/ سوڵتان عەبدولعەزیزی یەکەم/ سوڵتان مورادی پێنجەم/ سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم

(سوڵتانە سوور)/ گرنگترین چاکسازییە نێوخۆییەکانی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم/ خەلافەت گرتنە دەستی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم/ عەبدولحەمیدی دووەم (ستەمکار لای هەندێک و دادپەروەر لای ئەوانی تر)/ لەکارخستنی دەستوور/ سیاسەت و پرۆژەکانی عەبدولحەمیدی دووەم/ قەرزەکانی عوسمانی/ سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم و دەوڵەتە گەورەکان/ سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم و جوولەکە/ سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم و ئەرمەن/ سوڵتان عەبدولحەمید و کۆمەڵی ئیتیحاد و تەرەقی/ ڕووداوی ٣١ی ئازار/ مردنی عەبدولحەمیدی دووەم/ سوڵتان محەمەدی پێنجەم/ سوڵتان محەمەدی شەشەم/ سوڵتان عەبدولمەجیدی دووەم/ سەرچاوەکان/ پاشکۆی وێنە و زانیارییەکان.

تێبینی: لە هیچ شوێنێک ناوی نووسەر دیار نییە و وەکوو لە پێشەکییەکەیدا هاتووە، بابەتەکانی ئەم کتێبە لە ئینتەرنێتەوە وەرگیراون.

**١٦- کەرکوک لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا لە نێوان ساڵانی ١٨٧٦-١٩٠٩ز**

نووسین: گۆران ئیبراهیم ساڵح

لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک.)

چاپ: یەکەم، چ.: حەمدی، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ٦٠، س.: ٢٠٠٧، ل.:٢٢٦، پ.:١٥×٢١

**ناوەرۆک:** پێڕست/ پێشەکی/ دەروازە: کەرکووک لە قۆناغە مێژووییەکاندا/ بەشی یەکەم: چەمک و زاراوە و شوێنی جوگرافی کەرکووک/ چەمک و زاراوە و ڕەچەڵەکی ناوی کەرکووک/ کەرکووک لە ئینسایکلۆپیدیای بیانیی و ئیسلامیدا/ سنووری جوگرافیای کەرکووک کوردستان/ بەشی دووەم: سیستەمی ئیداریی و سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی لە کەرکووک/ گۆڕانی سیستمی ئیداری دەوڵەتی عوسمانی و دروستبوونی ویلایەتی مووسڵ ١٨٧٩ز- پێگە و بارودۆخی کەرکووک لەو گۆڕانەدا/ ڕێژە و ژمارەی دانیشتوانی کەرکووک لە سەرچاوە بیانی و تورکییەکان و ڕەوشی کۆمەڵایەتیی شار/ سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی لە کەرکووکدا و باردۆخی سیاسی ئەم شارە/ بەشی سێیەم: ڕەوشی خوێندن و فەرهەنگی و ئابووریی شاری کەرکووک/ ڕەوشی ئابووریی شاری کەرکووک/ دۆزینەوەی نەوت لە کەرکووک/ هەوڵەکانی وڵاتانی ڕۆژئاوا و هەڵوێستی دەوڵەتی عوسمانی لەو میانەدا/ ئەنجام/ لیستی سەرچاوەکان/ پاشکۆ.

**١٧- ناسیۆنالیزمی عەرەبی لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیییەوە بۆ عێراقی سەردەمی فاشیزم- وێنەیەک لە ڕابردوو کە نایەوێت ڕاببورێت**

نووسین: د.ئەلبێرت عیسا
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
چاپ:. یەکەم، چ:. سەردەم، ش:. سلێمانی، ژ.س:. ١٨٢٥، س:. ٢٠٠٧، ل:.٤٣٨، پ:.١٦×٢٢
**ناوەرۆک:** پێرست/ پەیڤێک/ پێشەکی/ بەشی یەکەم: گەشەسەندنی ناسیۆنالیزمی عەرەبی لە ناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا/ بەشی دووەم: ناسیۆنالیزمی عەرەبی و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی/ بەشی سێیەم: دەوڵەتی عێراقی نوێ/ بەشی چوارەم: ناسیۆنالیزمی عەرەبی لە ناو عێراقی نوێدا/ بەشی پێنجەم: دەوڵەتی عێراق یان سەربازگە/ بەشی شەشەم: کەشی سەردەم و باری ناوخۆی عێراق/ دەرئەنجام/ سەرچاوەکان.

**١٨- عوسمانییەکان- لە عوسمانی کوڕی ئەرتغرولەوە تا سوڵتان عەبدولمەجیدی دووەم «پەیماننامە و جەنگەکانی دەوڵەتی عوسمانی»**
نووسین: چەند نووسەرێک
وەرگێڕانی لە ؟: سەلام عەبدولکەریم
لە بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما
چاپ:. دووەم، چ:. گەنج، ش:. سلێمانی، ژ.س:. ؟، س:. ٢٠٠٨، ل:.٣٣٩، پ:.١٦×٢٢
**ناوەرۆک:** ناوەرۆک/ پێشەکیی وەرگێڕ بۆ چاپی دووەم/ هەمان ناوەرۆکی چاپی یەکەمی هەیە، بڕوانە کتێبی ژمارە ١٥.

**١٩- ڤلادیمیر ف. مینۆرسکیی ڕۆژهەڵاتناس- نووسینەکانی لەبارەی کورد لە سەردەمی ئیسلامەتی تا سەرهەڵدانی خەلافەتی عوسمانی- لێکۆڵینەوەیەکی ڕەخنەییە**
نووسین: تاریق محەمەد عەبدولڕەحیم
وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: ئازاد عوبێد ساڵح
لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری
چاپ:. یەکەم، چ:. و- ڕۆشنبیری، ش:. هەولێر، ژ.س:. ٢٤٤٢، س:. ٢٠٠٨، ل:.٢٥٤، پ:.١٦×٢٣
**ناوەرۆک:** کورتکراوەکان/ پێرست/ پێشەکی و شیکردنەوەی سەرچاوەکان/ پێشبار: ڕووکارە ڕۆژهەڵاتناسییەکان لە کوردناسیدا/ بەشی یەکەم: سەربردەی ژیانی مینۆرسکی ١٨٧٧-١٩٦٦/ بەشی دووەم: نووسینەکانی لە بارەی کوردەوە لە سەردەمی ئیسلامەتییەوە تا سەرهەڵدانی خەلافەتی عوسمانی/ بەشی سێیەم: هەڵسەنگاندنێکی ڕەخنەیی لەبارەی مینۆرسکی و کارەکانی/ کورتە و دەرئەنجامەکان/ لیستی سەرچاوەکان/ پاشکۆ/ کورتەی لێکۆڵینەوەکە بە زمانی ئینگلیزی.

**٢٠- هەمەوەند لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەوە تا جەنگی یەکەمی جیهان**
نووسین: سەرتیپ محەمەد ئەمین

چاپ:. یەکەم، چ:. کوردستان، ش:. سلێمانی، ژ.س:. ٥١، س:. ٢٠٠٨، ل:.١٩٧، پ:.١٤×٢٠

**ناوەڕۆک:** پێشەکی/ بەشی یەکەم: کورتەیەک دەربارەی مێژووی هەمەوەند/ ناوی تیرەکانی هەمەوەند/ شەریف چەلەبی/ ڕۆڵی هەمەوەند لە نێوان ساڵی ١٨٩٠-١٨٩١/ چەند بەڵگەنامەیەک دەربارەی هەمەوەند/ چەند چیرۆکێک دەربارەی هەمەوەند/ شەڕی نێوان هەمەوەند و شێخ مەحموود/ ڕۆیشتنی هەمەوەندەکان بۆ جوانرۆ/ بەشی دووەم: داستانی جوامێر هەمەوەند/ هەندێ ناونیشانی وەک: جوامێر (جووکل) کێیە؟/ قەڵاکانی جوامێر/ شەڕەکانی جوامێر لەگەڵ عوسمانییەکاندا/ جەنگی جوامێر لەگەڵ قاجارەکاندا/ سەرکوتکردنی هەمەوەندەکان لەلایەن قاجارەکانەوە/ جوامێر و شۆڕشێکی تر/ بەڵگەنامەی سەردەمی قاجارەکان/ کوشتنی حەمەپاشای جاف/ فەتحنامەی حسام ئەلمەلک/ پێشینەی مێژوویی و ڕووداوە مێژووییەکان/ چۆنێتیی کوشتنی جوامێر/ بەڵگەنامە و ئەلبووم/ سەرچاوەکان.

### ٢١- عوسمانییەکان لە دامەزراندنی دەوڵەتەوە تا کودەتا بەسەر خەلافەتدا

نووسین: د.محەمەد سوهەیل تەققوش

وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: نەریمان خۆشناو- مستەفا سەید مینە

لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی ئاوێر

چاپ:. یەکەم، چ:. ڕۆژهەڵات، ش:. هەولێر، ژ.س:. ٨٠١، س:. ٢٠٠٩، ل:.٧٠٤، پ:.١٧×٢٤

**ناوەڕۆک:** ناوەڕۆک/ پێشەکی: نووسەر/ بارودۆخی دامەزراندنی دەوڵەتی عوسمانی/ قۆناغی دامەزراندن ١٢٩٩-١٥١٢ز/ بەشی یەکەم: سوڵتانەکان- عوسمانی یەکەم، ئۆرخان موراد‌ی یەکەم/ بەشی دووەم: بایەزیدی یەکەم- محەمەدی یەکەم و مورادی دووەم/ بەشی سێیەم: هەردوو سوڵتان- محەمەدی دووەم و بایەزیدی دووەم/ بەشی چوارەم: سوڵتان سەلیمی یەکەم ١٥١٢-١٥٢٠ز/ بەشی پێنجەم: سوڵتان سلێمانی یەکەم/ بەشی شەشەم: سوڵتان سلێمانی یەکەم- قانوونی ١٥٢٠-١٥٦٦ز/ بەشی حەوتەم: هەردوو سوڵتان سەلیمی دووەم و مورادی سێیەم/ بەشی هەشتەم: بارودۆخی دەوڵەتی عوسمانی لە هەردوو سەدەی حەڤدە و هەژدەدا/ بەشی نۆیەم: پەیوەندییەکانی عوسمانی- سەفەوی/ بەشی دەیەم: پەیوەندییەکانی عوسمانی و ڕووسیا/ بەشی یازدەیەم: پەیوەندییەکانی عوسمانی- فەرەنسی/ بەشی دوازدەیەم: سوڵتان مەحموودی دووەم ١٨٠٨-١٨٣٩ز/ بەشی سیازدەیەم: سوڵتان عەبدولمەجیدی یەکەم ١٨٣٩-١٨٦١ز/

بەشی چواردەیەم: هەردوو سوڵتان عەبدولعەزیز و موورادی پێنجەم/ بەشی پازەیەم: سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم ١٨٧٦-١٩٠٩ز/ بەشی شازدەیەم: سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم و بزووتنەوەی کۆمەڵەی ئیسلامی/ بەشی حەڤدەیەم: سوڵتانەکان- محەمەد ڕەشاد، محەمەد وەحیدەدین و عەبدولمەجیدی دووەم/ بەشی هەژدەیەم: هۆکارەکانی ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی/ سەرچاوەکان.

### ٢٢- عوسمانییەکان لە دامەزراندنی دەوڵەتەوە تا کودەتا بەسەر خەلافەتدا

نووسین: د.محەمەد سوهەیل تەقووش

وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: نەریمان خۆشناو- مستەفا سەید مینە

لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی ئاوێر

چاپ: دووەم (چاککراو و پوختەکراو)، چ: ؟، ش: ؟، ژ.س: ٨٠١، س: ٢٠٠٩، ل: ٧٠٠، پ: ١٧×٢٤

**ناوەرۆک:** هەمان ناوەرۆکی چاپی یەکەمی هەیە، بڕوانە کتێبی پێش خۆی ژمارە ٢١.

### ٢٣- یادەوەرییە سیاسییەکانم

نووسین: سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم

وەرگێڕانی لە ؟: ئاوات ئەحمەد

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٤٠٣، س: ٢٠٠٩، ل: ١٦٤، پ: ١٦×٢٣

**ناوەرۆک:** ناوەرۆک/ پێشەکی: سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم/ نەسکی یەکەم: سیاسەتی ناوخۆ/ هەندێ بابەتی وەک: سکاڵای ئەرمەنەکان ١٨٩١/ ڕەوی ناوخۆ ١٨٩٣/ گرفتی جووەکان ١٨٩٥/ گرفتی ئەرمەن/ کورد و ئەرمەن/ ئەرمەنی و بازرگانی/ فوئاد پاشا ١٨٩٨/ دوای شەڕی تورکیا و ڕووسیا/ میدحەت و هاندانی خەڵک لیمان/ هێڵی ئاسنینی ئەنادۆڵ/ دەزگای هەواڵگری و سیخوڕی/ پێویستی ئاسایش و سەقامگیری/ دارایی جەستەیی عوسمانییەکان/ نەسکی دووەم: سیاسەتی دەرەوە/ هەندێ بابەتی وەک: لە یادەوەرییەکانی ١٨٨٢/ هەڵمەتەکانی خاچ هەڵگران بۆ سەر دەوڵەتی عوسمانی/ ڕووسیا و هێڵی ئاسنی بەغدا/ سیاسەتی خۆرهەڵات لای ڕووسەکان/ نەسکی سێیەم: کەسێتیی ئیسلامی/ نەسکی چوارەم: سیاسەتی چاکسازی/ هەندێ بابەتی وەک: خوێندن لای عوسمانییەکان/ مافی گەلان- مانگی سوور/ ئافرەتی موسوڵمان/ نەسکی پێنجەم: مەسەلە تایبەتەکان/ موزیک/ سیخوڕی/ چاپەمەنی.

## دووەم: پێڕستکاری ١٩٣٩- ٢٠١٠

١) **تاريخ سلێمانی وە ولاتی- لە دوری زور قدیمەوە تا اولی احتلال (١٩١٨م)**
نووسین: محەمەد ئەمین زەکی
چاپ: یەکەم، چ: النجاح، ش: بەغدا، ژ.س: ؟، س: ١٩٣٩، ل: ٢٩٤، پ: ١٦×٢١
**ناوەرۆک:**
ئەحواڵی ئەم لیوایە لە ئەواخیری دەوری عوسمانیدا.

٢) **مێژووی کورد و کوردستان**
نووسین: ئارشاک سافرستیان
وەرگێڕانی لە زمانی ئینگلیزییەوە: عەبدوڵلا شاڵی
چاپ: یەکەم، چ: کامەران، ش: سلێمانی، ژ.س: ؟، س: ١٩٦٠، ل: ٦٢، پ: ١٥×٢١
**ناوەرۆک:** بەشی چوارەم: داگیرکردنی عوسمانییەکان و هۆزە کوردەکان ١٥١٤-١٨٩٠ز.

٣) **شۆڕشی دیاربەکر**
نووسین: عوسمان عوزێری
لە بلاوکراوەکانی نامەخانەی (خەبات) لەسەر ئەرکی (حاجی برایم ڕۆستەم- سەرۆکی عەشیرەتی سمایل عوزێری) چاپکراوە.
چاپ: یەکەم، چ: ژین، ش: سلێمانی، ژ.س: ؟، س: ١٩٦١، ل: ٧٤، پ: ١٤×٢١
**ناوەرۆک:** کورد و دەوڵەتی عوسمانی و ڕەگەزی تورک.

٤) **مێژووی کۆیە یا کویسنجق- بەرگی یەکەم**
نووسین: تاهیر ئەحمەد حەوێزی
بە یارمەتیی (جەلال حەوێز) چاپکراوە
چاپ: یەکەم، چ: الوفاء، ش: بەغدا، ژ.س: ؟، س: ١٩٦٢، ل: ١٥٩، پ: ١٧×٢٤
**ناوەرۆک:** ئەحمەد پاشای بابان و هاتنی عوسمانییەکان/ عوسمانییەکان لە کۆیە/ کۆیە لە ئاخر و ئۆخری دەوڵەتی عوسمانی/ ئەهمییەتی کۆیە لە زەمانی عوسمانی دا.

٥) **بزووتنەوەی سیاسی و ڕۆشنبیریی کورد لە کۆتایی چەرخی نۆزدەهەمەوە تا ناوەڕاستی چەرخی بیست**
نووسین: ڕەمزی قەزاز
بە ڕەزامەندیی وەزارەتی ڕاگەیاندن و بە یارمەتیی وەزارەتی کاروباری ژووروو چاپکراوە
چاپ: یەکەم، چ: ژین، ش: سلێمانی، ژ.س: ؟، س: ١٩٧١، ل: ٢٤٧، پ: ١٧×٢٤
**ناوەرۆک:** ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و کورد لە سەرەتای چەرخی بیستەما.

٦) **تەئسیری زمان و ئەدەبی فارسی لەسەر ئەدەبی کوردی**
نووسین: د.محەمەد محەمەد نووری عارف
چاپ: یەکەم، چ: مەعاریف، ش: بەغدا، ژ.س: ؟، س: ١٩٧٤، ل: ٧٢-٩٤، پ: ١٧×٢٤

**ناوەرۆک:** قۆناغی یەکەم: لە کۆنەوە تا ڕووخاندنی دەوڵەتی عوسمانی و دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق.

٧) **دەقەکانی ئەدەبی کوردی**

نووسین: عەلادین سەجادی

لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاریی کورد

چاپ: یەکەم، چ: کۆڕ، ش: بەغدا، ژ.س: ١١٩٩، س: ١٩٧٨، ل: ٢٢٠، پ: ١٧×٢٤

**ناوەرۆک:** سەردەمی عوسمانی.

٨) **شێخ ڕەزای تاڵەبانی**

نووسین: د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ

چاپ: یەکەم، چ: عەلا، ش: بەغدا، ژ.س: ١٩٢٣، س: ١٩٧٩، ل: ١٤٤، پ: ١٧×٢٤

**ناوەرۆک:** شێخ ڕەزا و ڕژێمی عوسمانی.

٩) **کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا- سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی**

نووسین: ئەولیا چەلەبی

وەرگێڕانی لە زمانی تورکی عوسمانییەوە: سەعید ناکام

لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاریی کورد

چاپ: یەکەم، چ: کۆڕ...، ش: بەغدا، ژ.س: ١٢٤٨، س: ١٩٧٩، ل: ٣٦٩، پ: ١٦×٢٣

**ناوەرۆک:** زیارەتگای باپیرانی سوڵتانە عوسمانییەکان.

١٠) **شۆڕشا دم دم- ڕەسەنترین بەیتا وی یا فولکلۆری وە هندەک ژ مێژوویا (عالم آرای عباسی)**

نووسین: عەلی دهقان؟

وەرگێڕانی لە زمانی فارسی و ئامادەکردن: جەمیل ئەحمەد زێرۆ هەرکی

بە یارمەتیی ئەمینداریێتی ڕۆشنبیریی و لاوانی ناوچەی کوردستان چاپکراوە.

چاپ: یەکەم، چ: الحوادپ، ش: بەغدا، ژ.س: ٣٤٠، س: ١٩٨٣، ل: ١٦٨، پ: ١٢×١٧

**ناوەرۆک:** ئێرشا عوسمانی یا بۆ ئۆرمیێ و فەرمانڕەوای یا سبحانوردی خان.

١١) **بیری نەتەوەیی کوردی نە بیری «قەومیەت»ی ڕۆژهەڵاتی نە بیری «ناسیۆنالیزم»ی ڕۆژئاواییە**

نووسین: جەمال نەبەز

لە بڵاوکراوەکانی (ڕێکخراوی خوێندکارانی سۆسیالیستی کورد لە ئەورووپا- سۆکسە)

لەسەر ئەرکی بنکەی چاپەمەنیی ئازاد- سوید چاپکراوە

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سوید- ستۆکهۆڵم، ژ.س: ؟، س: ١٩٨٤، ل: ٢٧٥، پ: ١٥×٢١

**ناوەرۆک:** ناسیۆنالیزم و دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی.

١٢) **مێژووی کۆیە (بەرگی دووەم، بەشی یەکەم)**

نووسین: تاهیر ئەحمەد حەوێزی

بە یارمەتیی ئەمینداری گشتیی ڕۆشنبیری

و لاوانی کوردستان چاپکراوە
چاپ: یەکەم، چ: نمیر، ش: بەغدا، ژ.س: ١٥٣٦، س: ١٩٨٤، ل: ٣٠٤، پ: ١٧×٢٤
**ناوەرۆک:** دەوڵەتی عوسمانی.

**١٣) کێشەی کورد مێژینە و ئێستای کورد**
نووسین: د.بلەچ شێرکۆ
وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: محەمەد حەمەباقی
لە بڵاوکراوەکانی یەکێتیی نووسەرانی کوردستان- شاخ
چاپ: یەکەم، چ: شەهید جەعفەر، ش: شاخ، ژ.س: ؟، س: ١٩٨٦، ل: ١٥٢، پ: ١٦×٢١
**ناوەرۆک:** کورد لە دوای دەستووری عوسمانی. بەپێی زانیارییەکانی چاپی سێیەم بێت، ئەم چاپە لە (یاخسەمەر) چاپکراوە.

**١٤) شاری سلێمانی- بەرگی یەکەم**
**نووسین: ئەکرەمی مەحموودی ساڵحی ڕەشە**
پێداچوونەوە و پێشەکی: د.عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی
چاپ: یەکەم، چ: دار الحریە، ش: بەغدا، ژ.س: ٢٣١، س: ١٩٨٧، ل: ٥٥٩، پ: ١٧×٢٤
**ناوەرۆک:** ئەفسەرەکانی سوپای عوسمانلی.

**١٥) کێشەی کورد- بەشی یەکەم ١٨٩٦- ١٩١٧**
نووسین: د.م.س.لازاریف
وەرگێڕانی لە زمانی ڕووسییەوە، پێشەکی و پەراوێز بۆ نووسین: د.کاوس قەفتان
لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی
چاپ: یەکەم، چ: الجاحظ، ش: بەغدا، ژ.س: ٨٥٣، س: ١٩٨٩، ل: ٤٨٨، پ: ١٦×٢٣
**ناوەرۆک:** فەسڵی شەشەم: مەسەلەی کورد لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا لە سەرەتای شەڕی گێتیی یەکەمدا.

**١٦) شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان-** بەرگی یەکەم
نووسین: م.ر.هاوار (محەمەد ڕەسووڵ هاوار)
چاپ: ؟، چ: بلاک ڕۆز، ش: لەندەن، ژ.س: ؟، س: ١٩٩٠، ل: ٥٧١، پ: ١٥×٢١
**ناوەرۆک:** پێوەندیی کورد لەگەڵ عوسمانی (تورک).

**١٧) کچە هەرمەنی {بەسەرهاتی کچی گرین فیلد لە مەهاباد}**
نووسین: محەمەد ڕەزا داودی
وەرگێڕانی لە؟: عومەر باڵەکی
لە بڵاوکراوەکانی (ح.د.ک) ئێران
چاپ: ؟، چ: ؟، ش: ؟، ژ.س: ؟، س: ١٣٧٣ (١٩٩٤)، ل: ٣٠، پ: ١٥×٢٠

**ناوەرۆک:** وەرپێکەوتنی نوێنەرانی سیاسیی دەوڵەتانی ئێران- ئینگلیز و عوسمانی لە تەوریزەوە بەرەو مەهاباد (٦ی زیلقەعدەی ١٣٠٨ی کۆچی هەتاوی).

١٨) **ئێزیدییەکان کێن؟**
نووسین: عومەری مام ڕەمەزان
چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ؟، س: ٢٦٩٥ (١٩٩٥)، ل:٨٦، پ:١٥×٢١
**ناوەرۆک:** هێرشی عوسمانییەکان.

١٩) **کورتە مێژووی بزووتنەوەی نەتەوایەتییەکانی کورد**
نووسین: د.سادق شەرەفکەندی
لە بڵاوکراوەکانی APEC
چاپ: یەکەم، چ: ئاپێک، ش: سوید، ISBN: ٩١-٨٧٧٣٠-٨٧-١، س: ١٩٩٥، ل:١٦٤، پ:١٥×٢١
**ناوەرۆک:** بەشی یەکەم- فەسڵی یەکەم: ڕێوشوێنەکانی پێوەندیدار بە کوردستان لە ئیمپراتووری عوسمانیدا.

٢٠) **مێژووی سەدەکانی ناوەڕاست**
**نووسین: گ.م.دنسکوی و ئە.ئو.ئاگیبالوو**
وەرگێڕانی لە ؟: د.حسێن خەلیقی
لە بڵاوکراوەکانی کتێبی هەرزان
چاپ: ؟، چ: ؟، ش: سوێد، ISBN: ٩١ ٩٧٢٢٢٤٩٦، س: ١٩٩٥، ل:٣٥٨، پ:١٥×٢١
**ناوەرۆک:** ئیمپراتۆری عوسمانی و خەباتی خەڵک دژی داگیرکەرانی تورک.

٢١) **تورانچێتی- وەدەرکەوتن، ئایدیۆلۆژیا و بەرنامە**
نووسین: زارە ڤاند
وەرگێڕانی لە زمانی فارسییەوە: ئەبوبەکر خۆشناو
چاپ: یەکەم، چ: و-ڕۆشنبیری، ش: هەولێر، ژ.س: ٩٢، س: ١٩٩٦، ل:١١٢، پ:١٧×٢٣
**ناوەرۆک:** پانتورانیزم لە تورکیا تا دەستووری عوسمانی/ پانتورانیزم دوای دەستووری عوسمانی.

٢٢) **پەیام لە مێژووی نەتەوەی کورد**
نووسین: بەشیر حسێن سەعدی
چاپ: یەکەم، چ: دارا، ش: هەولێر، ژ.س: ٢٧٢، س: ١٩٩٧، ل:٣٠٤، پ:١٥×٢٠
**ناوەرۆک:** کورد لە سەردەمی ئیسلامەتی لە زەمانی خەلیفەکانی ئەمەویی و عەباسی و سەردەمی عوسمانییەکان/ کورد لە سەردەمی عوسمانی هەتا دوای شەڕی جیهانی یەکەم.

٢٣) **کورد لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا**
وەرگێڕانی لە زمانی فارسییەوە: حەمەکەریم عارف
لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری
چاپ: یەکەم، چ: و- ڕۆشنبیری، ش: هەولێر، ژ.س: ٣٢٦، س: ١٩٩٧، ل:١٦٦،

پ.:١٦×٢٣

**ناوەرۆک:** پاشایانی سەفەوی و سوڵتانەکانی عوسمانی/ تورکیا لەسەدەی نۆزدەدا/ شەڕەکانی نێوان ڕووسیا و عوسمانیان/ سوپای حەمیدییە/ پێوەندیی ئەرمەنییەکان و کورد.

**٢٤) میرنشینی سۆران- لێکۆڵینەوەیەکە لەسەر: مێژووی سیاسیی میرنشینی سۆران (سەرەتای سەدەی پازدەهەم- ١٨٣٦ز)**

نووسین: کامەران جەمال بابان زادە

چاپ.: یەکەم، چ.: ؟، ش.: هەولێر، ژ.س.: ١٣٠، س.: ١٩٩٧، ل.:٨٨، پ.:١٥×٢٠

**ناوەرۆک:** بەشی پێنجەم: هێرشی (عوسمانی- ئێرانی) کەوتنی ڕواندز- هۆکارەکانی کەوتن.

**٢٥) هەولێرم وادیوە و.. بیستووە- بەرگی دووەم**

نووسین: مەولوود قادر بێخاڵی

لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری

چاپ.: یەکەم، چ.: وەزارەتی ڕۆشنبیری، ش.: هەولێر، ژ.س.: ٣٣٠، س.: ١٩٩٧، ل.:٣٤٤، پ.:١٧×٢٣

**ناوەرۆک:** قەڵای هەولێر و شۆڕشی فارس و عوسمانییەکان.

**٢٦) تابلۆکانی شەرەفنامە**

نووسین: عەبدولڕەقیب یووسف

لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری

چاپ.: یەکەم، چ.: و- ڕۆشنبیری، ش.: هەولێر، ژ.س.: ٢٧٨، س.: ١٩٩٨، ل.:٢٥٦، پ.:١٦×٢٣

**ناوەرۆک:** تابلۆی حەڤدەیەم: بەشی دووەم- جلوبەرگی عوسمانییەکان.

**٢٧) ڕۆژنامەگەریی کوردی بە زمانی فەڕەنسی**

نووسین: د.فەرهاد پیرباڵ

لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری برایەتی

چاپ.: یەکەم، چ.: و- پەروەردە، ش.: هەولێر، ژ.س.: ؟، س.: ١٩٩٨، ل.:٨٢، پ.:١٤×٢٠

**ناوەرۆک:** دەستپێک/ عوسمانلی: دیسەمبەری ١٨٩٧- نۆڤەمبەری ١٩٠٤.

**٢٨) مێژووی کورد لە سەدەی ١٦هەمدا- شەرەفنامەی شەرەفخانی بەدلیسی وەک سەرچاوەیەکی مێژووی نەتەوەی کورد**

نووسین: د.شەمسی محەمەد ئیسکەندەر

وەرگێڕانی لە زمانی ئازەربایجانییەوە: شکور مستەفا

چاپ.: یەکەم، چ.: و- ڕۆشنبیری، ش.: هەولێر، ژ.س.: ٧٢، س.: ١٩٩٨، ل.:١٧٦، پ.:١٦×٢٣

**ناوەرۆک:** سەر و ساختی عوسمانییەکان لەگەڵ کورددا.

**٢٩) ئیدریسی بدلیسی**

نووسین: محەمەد بایراقدار

وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە: شکور مستەفا

له بڵاوكراوەكانی سەنتەری برایەتی
چاپ: یەكەم، چ: و-پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ؟، س: ١٩٩٩، ل: ١١٩، پ: ١٥×٢٢
**ناوەڕۆک:** دەوڵەتی عوسمانی و ئیدریسی بەدلیسی.

٣٠) **پێنجوێن و بیرەوەرییەكان- بەرگی یەكەم- كورتە باسێكی مێژوویی پێنجوێن**
نووسین: جەلال ئەمین یارە
چاپ: یەكەم، چ: ژین، ش: سلێمانی، ژ.س: ٩٣، س: ١٩٩٩، ل: ١٩٦، پ: ١٥×٢٠
**ناوەڕۆک:** ئەوانەی لە شاری پێنجوێن چەكیان هەڵگرت بۆ دەوڵەتی عوسمانی.

٣١) **كوردستان و ڕاپەڕینەكانی كورد**
نووسین: عەبدولعەزیز یامولكی
وەرگێڕانی لە زمانی توركییەوە: شێرزاد كەریم
ئامادەكردن: سدیق ساڵح
لە بڵاوكراوەكانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
چاپ: یەكەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٨٥، س: ١٩٩٩، ل: ٩٢، پ: ١٥×٢٢
**ناوەڕۆک:** كوردان لە سەروبەندی دەركەوتنی ئیسلامەوە تا ئیدارەی حكوومەتی عوسمانی/ ڕاپەڕینەكانی كوردستان لە سەردەمی حكوومەتی عوسمانیدا/ دووەم دەوران: لە هاتنە سەر تەختی حەمیدخانی دووەمەوە تا مێژووی ڕاگەیاندنی مەشرووتییەتی عوسمانی (١٩٠٨).

٣٢) **كورد لە گەمەی دەوڵەتانی زلهێز و حكومەتانی ناوچەدا**
نووسین: كەریم حوسامی
چاپ: یەكەم، چ: ؟، ش: ستۆكهۆڵم، ژ.س: ؟، س: ١٩٩٩، ل: ٢٩٢، پ: ١٤×٢١
**ناوەڕۆک:** سنوورەكانی ئێرانی و عوسمانی.

٣٣) **گەلێكی پەژموردە و نیشتمانی پەرت- كورد و كوردستان- بەرگی یەكەم و دووەم**
نووسین: چەند نووسەرێک (كەندال، عەبدولڕەحمان قاسملوو، عیسمەت شەریف وانلی، مستەفا نازدار، ئارچی ڕۆزیفیلد، كامەران قەرەداغی، ئەلیزا ماركۆس، بیلل فریلیک)
وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبی و فارسییەوە: م.گۆمەیی
وەرگێڕانی لە زمانی ئینگلیزییەوە (بەشەكانی (٨-١١): ئەنداز حەوێزی
چاپ: ؟، چ: ؟، ش: ؟، ژ.س: ٣٠٠، س: ١٩٩٩، ل: ٤٥٨، پ: ١٦×٢٢

**ناوەڕۆک:** یەكەم- كورد لە ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانیدا: كەندال.
تێبینی: وەكوو لەسەری نووسراوە چاپی یەكەم ساڵی ١٩٩٨ لە وڵاتی سوید چاپكراوە.

**٣٤) ئیسلامی سیاسی- کۆمەڵە وتار**

**نووسین: شوان ئەحمەد**

لە بڵاوکراوەکانی گۆڤاری هاڤیبون

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٥١، س: ٢٠٠٠، ل:١٤٨، پ:١٥×٢١

**ناوەرۆک:** هەوڵی نەتەوە ژێردەستەکانی خەلافەتی عوسمانی.

**٣٥) بووژاندنەوەی ڕۆشنبیری و نەتەوەیی کورد- کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم- سەرەتای سەدەی بیستەم**

نووسین: جەلیلی جەلیلی

وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: سدیق ساڵح

لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

چاپ: یەکەم، چ: هەواڵ، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٢٤، س: ٢٠٠٠، ل:١٨٨، پ:١٤×٢٠

**ناوەرۆک:** کوردانی ئیمپراتۆری عوسمانی بەرەو هۆشیاربوونەوەی نەتەوەیی.

**٣٦) شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری (١٨٨٠) لە بەڵگەنامەی قاجاریدا**

نووسین: محەمەد حەمە باقی

لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی

چاپ: یەکەم، چ: و- پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٤٤٧، س: ٢٠٠٠، ل:٦٧٠، پ:١٦×٢٣

**ناوەرۆک:** کورد لە نێوان دوو جەنگی دوایی ڕووس و عوسمانیدا/ هەڵوێستی شێخ عوبەیدوڵڵا لە جەنگی ١٨٧٧-١٨٧٨ی نێوان ڕووس و عوسمانیدا.

**٣٧) کورد و باکوری کوردستان لە سەرەتای مێژووەوە هەتا شەڕی دووەمی جیهان- بەرگی یەکەم- هەتا کۆتایی شەڕی یەکەم**

نووسین: محەمەد ڕەسووڵ هاوار

لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی چاپەمەنی و ڕاگەیاندنی خاک

چاپ: یەکەم، چ: خاک، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٤٦، س: ٢٠٠٠، ل:٥٥٢، پ:١٥×٢٢

**ناوەرۆک:** بەشی چوارەم: عوسمانی- ڕەگ و ڕیشەی عوسمانی و پێکهێنانی دەوڵەتی عوسمانی/ بەشی پێنجەم: کێشەی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوییەکان و شەڕی چاڵدێران و ڕۆڵی کورد لەو شەڕەدا و ئەنجامەکانی/ بەشی حەوتەم: ڕۆڵی ئیدرسی بەدلیسی لە بەستنی ئەمارەتەکانی کورد بە دەوڵەتی عوسمانییەوە و ئەنجامەکانی و هەڵسەنگاندنی ئەو کارەی ئیدریسی بەدلیسی/ بەشی هەشتەم: هەڵوەشاندنەوەی ئەمارەتە کوردییەکان لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە/ بەشی یازدەیەم: خزمەتی کورد بۆ ئیسلام و دەوڵەتی عوسمانی/ بەشی دوازدەیەم: سوارەی حەمیدییە (حمیدیە ئالابلری)...

ئێسترسوار/ بەشی سیازدەیەم: هەڵوێستی دەوڵەتی عوسمانی بەرامبەر کریستانەکان و کوشتاری ئەرمەنی/ بەشی پازدەیەم: لاوازبوون و گەندەڵ بوونی دەوڵەتی عوسمانی (پیاوە نەخۆشەکە)/ بەشی بیستەم: نەخشەی دەوڵەتان بەر لە شەڕی جیهانی بۆ دابەشکردنی وڵاتی عوسمانی (پەیمانی سایکس بیکۆ).

**٣٨) کوردستان و ستراتیژی دەوڵەتان- بەرگی یەکەم**

نووسین: حسێن مەدەنی

چاپ: یەکەم، چ: و- ڕۆشنبیری، ش: هەولێر، ژ.س: ٣٣٦، س: ٢٠٠٠، ل:٤١٧، پ:١٦×٢٣

**ناوەرۆک:** ئیمپراتۆری عوسمانی/ لاوازبوونی عوسمانی و ئێران و ڕەخنەکردنی ئینگلیز و ڕووس/ هێرشی دەوڵەتی عوسمانی بۆ سەر میرنشینەکان.

**٣٩) لە (عەممان)ەوە بۆ (ئامێدی) گەشتێک بە کوردستانی باشووردا**

نووسین: عەلی سیدۆ ئەلگورانی

وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: تاڵیب بەرزنجی

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ٤٤٥، س: ٢٠٠٠، ل:٣٢٤، پ:١٥×٢١

ناوەرۆک: هەڵوێستی بەکر سووباشی (والی بەغدا) بەرامبەر بە دەوڵەتی عوسمانی.

**٤٠) هۆکارەکانی لکاندنی ویلایەتی موسڵ بە عیراقی عەرەبییەوە**

نووسین: سەلام ناوخۆش

لە بڵاوکراوەکانی بەرەو ڕاستکردنەوەی مێژووی سیاسیمان

چاپ: یەکەم، چ: ژیان، ش: هەولێر، ژ.س: ٩٦، س: ٢٠٠٠، ل:١١٣، پ:١٤×٢٠

**ناوەرۆک:** بەشی دووەم: هۆی ململانێی دەوڵەتی عوسمانی و میرانی کورد لە سەدەی نۆزدەدا.

